بەرگی ٢

# ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان

## کۆمەڵە وتارێکە بۆ ڕۆژانی هەینی و بۆنە ئاینییەکان


لەنووسینی
عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز



چاپی دووم
پوختە کراو و زیاد کراو

2012

# ئامۆژگاری
# بۆ خاوەن باوەڕان

## کۆمەڵە وتارێکە بۆ (جومعەکان)
## واتە ڕۆژانی هەینیو بۆنە ئاینیەکان


لەنووسینی

**عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز**


**بەرگی دووەم**


چاپی دووەم

(پوختە کراوو زیاد کراوە)

٢٠١٢

# ناسنامەی کتێب

کتێب : ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان

نووسین و ئامادەکردن : عبدالرحمن مەلا طه عبدالعزيز

نەخشەسازی : کۆمپیوتەری هیوا

چاپی دووەم ( پوختە کراوو زیاد کراوە ) ٢٠١٢

بەرگ: بەرگی دووەم

جێگەی چاپ : چاپخانەی رۆژهەڵات - هەولێر

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٨٩)ی

ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە

## (کورتە باسێك بۆ چاپی دووەم )

جا هەروەها سوپاس بۆ خوای گەورە و مەزن من خۆم بە بەختەوەر ئەزانم کە خوای پەروەردگار یارمەتی دام هەردوو بەرگی (کتێبەکە) بنووسمەوەو ئامادەی بکەم بۆ چاپ کردن چوونکە پێشتر (بەرگی یەکەمم) چاپ کردبوو لەچاپخانەی (الحوادث) لەبەغدا لەڕێکەوتی سالأنی ۱۹۸٦/۷/۱ ی زایینی هەروەها (بیست و دوو) ووتارم نوسیبۆوە بەچاپم گەیاندبوو ئێستاش بەیارمەتی خوای مەزن (چل و هەشت ) ووتاری دیکەم نووسی کە (کۆی سەرجەمی) ئەکاتە (۷۰) حەفتا ووتاری تەواو بۆ (وەعظ) و ئامۆژگاری بۆ ووتاری هەینی ئەیکەمە دیاری بۆ بەردەستی ووتار بێژان و مامۆستایانی بەڕێزو (فەقێ یە) خۆشەویستەکانم کە زۆربەیان ئەوەی من بناسێ بەرگی یەکەمی خوێندۆتەوەو پەسەندی کردووە ، ئینجا داوایان لێ کردووم کە بەرگی دووەمیشیان بۆ بنووسم و بەچاپی بگەیەنم بۆ خوێنەرە بەڕێزەکان ئیتر منیش لە کانگای دڵەوە داواکاریەکانم پەسەند کردووە .

خوای گەورە پاداشتی هەموو لایەکمان بداتەوە ، ئینجا جگە لەمەش ئەوەی زۆر دڵخۆشی کردم ئەو فەرمایشتە بەرزو پیرۆزەی پێغەمبەری ئازیزمانە (ﷺ) کە ئاماژەی داوە: ( بەزانستێکی سوود بەخش کە دەبێتە خێرو سەدەقەیەکی هەتا هەتایی) یان باشترین دیاری کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بنێرێ ئەم فەرموودە پیرۆزەیە کەوا عەبدوللای کوڕی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت ) ئەگێڕێتەوە لە حەزرەت (ﷺ) کە فەرموویەتی ( مَا أهْدى مُسْلمٌ لأخيهِ هَدّيةً أفْضَلَ مِن كَلمَةِ حِكمْةٍ يَزيدهُ الله

بها هُدىً أوْ يُرَدُهُ عَنْ رَديءٍ)رواه البيهقي في (شعب الإيمـان ) ، واتـه: ( لـهو دياريانەی کە موسڵمان بینێریٚ بۆبرای خۆی دیاریەکی وەها نییە بەنرخ تر بێت لە ووتەیەکی سوود بەخش کە خودا زیاتر ڕێی پیٚ (ڕۆشـن ) بکاتـەوە یا ببێتە هۆی لادان و پاراستنی لە زیان و گومراهی ) بـەلاّم ئـەوەش لـەیاد ناکەین و هەندیٚ ووتارەکان (باسەکانیان) زۆر درێژە بە (سیٚ ووتار یا چوار ووتار) ئـەبیٚ بخوێندرێتـەوە ئینجـا (خطیـب) واتـە ووتـار بێـژ خـۆی ئـەبیٚ (تەصرِوفاتی تێـدا بکـات چـوونکە وتـاری کـورت و پـڕ مانـا پێغەمبـەریش (ﷺ) پەسەندی کردووە ، هەروەکو لە پەنـدێکی عەرەبیـشدا حوکـەمایان ئاماژەیـان بـۆ کـردووە و ئەفـەرموون : ( خَـيرُ الكَـلامِ مـا قَـلّ وَ دَلْ) وە داواکاریشم لەتۆی خوێنەری بەڕێز لە دوعای خێرو باشە بێبەشمان نەکەیت و(والسلام عَليكُم وَرَحمَةَ اللهِ وَبَرَكاتُهُ ، وَاللهُ مِن وراء القَصدِ – وَهوَ حَسبي الله وَنِعمَ الوَكيل).

خزمەتکاری ئیسلام و موسڵمانان

بەندەی فەقیر عبدالرحمن ملا طە عبدالعزیز ئیمام و ووتار خوێنی

ناحیەی دارەتوو قەزای بەردە ڕەش

٢٠١١/١٢/٧

# التقريظ

**بەناوی خودای گەورە**

سوپاس و ستایش بۆ خودای خاوەن دەسەلاّت و کاربەجێ. درودو ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری پێشەوا دەست خۆشی لەمامۆستای ماندو خەمخۆر دەکەم، کەخەمخۆری ئەم ئیسلامەیە شەوو ڕۆژ خزمەت دەکات. دەست خۆشی بۆ هەموو (نوسینەکانی) بەتایبەتی ئەم (کتابە) بەناوی ئامۆژگاری بەرگی یەکەم و دووەم بۆ خاوەن باوەڕان، کۆمەڵە وتارێکە بۆ ڕۆژانی هەینی. وەئەم زاتە ماندووەو بەڕێزە لەلای ئێمەو لای خوای گەورەش (انشاءالله) خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿**والَّذينَ أُوتو العِلْمَ درجات**﴾ (سورة المجادلة/١٢) وەپێغەمبەر (ﷺ) (**فضلُ العالِمِ على العابد كفضلي على أدناكُمْ**) رواه الترمذي..

بۆیە دەڵێم تەنها ئەوەی بۆ خودا دەیکەی پەشیمان نی، بەلاّم ئەوەی بۆ غەیری خودا ئەیکەن پەشیمانی، خوایە ئەم پەرتووکەو نوسراوە بیکەیت بەزەخیرە قیامەت بۆ دوا ڕۆژی..

**خزمەتکاری ئیسلام و موسڵمانان**
**ملا مسعود ملا صدیق کانی کوردەیی**
**٢٠١١/٩/٢١**
**پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی**
**محمد فوزی لەهەولێر**

## بسم الله الرّحمن الرّحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسـول الله قـد خلـق عبـادة متفـاوتين في العلم والفهم وسـائر شـؤونهم قـالَ تعـالى ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ﴾ الزخرف: ٣٢.

ولاشك أن الاستاذ السيد الملا عبـدالرحمن مـلا طـه عبـدالعزيز (الـدزەيى الهرمزياري) أنّ كتبه يمتاز بكثرة المصادر أنما يدلّ على سعة فكـره وإطلاعـه على الاراء والفتاوي المرجحة وذوقه الـسليم في اختيـاره لكـم والكلمـات والنثـر والشعر والمواضيع الحكمة والقصص المؤثرة قال تعالى (وَمَنْ يُؤتِ الحِكمة فَقَد أوتيَ خَيراً كثيراً).

وارجو من الله تعالى أن يكون كتابه هذا (ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان) صدقة جارية الى يوم الدين والميعاد وسائر أعمالـه الـصالحة قـال تعـالى (وَمَـنْ أحسن قولاً ممّن دعا إلى الله وعمل صالحا وقال إنني من المسلمين) اللّهم اجعله من خير الداعين الى الله برحمتك يأرْحم الراحِمين وصلى الله عَلىَ سيدنا محمـدو على آله وصحبه وسلم آمين.

**(والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته)**

**كتبه الفقير**

**ملا يعقوب ملا عبدالرحمن حمد الهُرمزياري**

**إمام و خطيب جامع ابوبكر الصديق في اربيل**

**تاريخ ٢٠١١/٨/١٥**

بسم الله الرحمن الرحيم

(الحَمْدُ لله الذي أحْسَنَ الإنْسانَ وَالْهمَهَ الرَشْدَ وَالبيانَ ومَنَحَهُ العِلمَ وَالعِرفان وَالصَلاةُ وَالسَلام عَلىَ سَيدنا وَمَولانَا مُحَمدٍ الَذي أرسَلَهُ الله إلى كَافة الإنسِ والجان وَعَلىَ آله وَأصحابه البَرَرَة الكرامْ أمَا بَعدُ فَقَدْ طَلَعْتُ عَلىَ هذا الكِتاب الوجيز (ئامۆژگاری) تَأليف الأخ الصالِح وَالمُرشِدُ الناصِح (ملا عبدالرحمن ملا طه) أيَدَهُ الله بِالعزِ وَالحَنانْ وَالسَماحَةَ وَالغُفرانِ فَوَجْدتُهُ في غَايَة الحُسْنِ وَالإتقانِ وَالبَلاغة وَالبَيانِ سَهْلُ المَرامِ دقيق الأحكام يُثلِج لِفوائِده الصدوُرَ ويَمْلئو بِهِ القَلْبَ الفَرَحَ وَالسروُرَ أرْجُو مِنَ الله العَزيزِ العَليم الرؤوفَ الرحيم أنْ يَجعَلَ سَببُ الايمانِ وَالإحْسانِ وَالحياةِ وَالعُمْرانِ لِكلَ مَنْصَف مُوقِنٍ وَعَاقِلٍ مُؤمِنٍ).

كَتَبَهُ الفَقير الفاني

**عبدالله وسوملياني**

الخطيب في جامع قرني في أربيل

١٩٨٨/٨/٢٠

بسم الله الرحمن الرحيم

(الحَمدُ لله رَب العَالَمينَ وَالصَلاةُ وَالسَلام عَلىَ مَنْ أصْطَفى مِنْ عِبادِه المُكْرَمينَ وَبعدُ فَإن هَذا الكتاب (ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان) جَديرٌ بأَنْ يَنالَ إعجاب ذوي الالباب والبصائرِ لَمَا بَين دَفتيه مِنْ حوارٍ وَعظيةٍ إرشادية وَالخُطَبُ المنبرية لِلْمُجتَمَعِ الحَالي فَضْلاً عَنْ حُسْنِ تَبْويبِهَا وَسَلامَةِ عِبارَتِهَا وَرَصافَةِ أسلُوبَها وَجَزالةِ ألفاظِهَا وَجَودَةَ أدائها وَسهُولَةَ تَطْبيقِهَا حَقيقٌ بالمُؤَلف أنْ يشادَ بِذِكْرِه كَثرَ اللهُ مِنْ أمْثالِه وَجَعَلَهُ في عِدادِ المُحْسنينَ/ أمين)).

العبد الفقير

**عبدالعزيز حسين علي**

امام وخطيب جامع شيخ كاك

في أربيل/ محلة آزادي

١٩٨٨/٨/٣٠

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحْمدُ للهِ الذّي جعل الموعِظَ تزكيةً لِقلُوب المُتّقينَ وايقـظ بالتّـذكير همـمَ العارفينَ.. قال تعالى لِنّبيهِ الأمـين ﴿فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وَأشـهد أنْ لاَ إلــه الاّ الله وَحـدهُ لا شـريك لَـهَ جَعَـلَ الـدّعوة إلى الهُـدى والنـصيحة للمسلمين من أفضْلِ القُربات وأرفعُ الدرجاتِ وأهم المُهمّاتِ في الـدّين وأشـهدُ أنّ سَيّدنا محمداً عبدهُ وَرَسولُه الذّي بَشّر من أطاعهُ بالجنّة وأنذر مَنْ عصاهُ العذاب المهين اللّهم صَلّ وَسَلّم عَلىَ سيّدناَ مُحمدٍ وَعَلـى آلـهِ وأصـحابهِ وَمَـنْ تمسك بهديه المُبين.

لــەپاش ســوپاس و ستایــشی خــوای گــەورە و میهرەبــان وەدروودوو (صلوات) لەسەر گیانی پاكی پێغەمبەرا بێ‌و لەدوایی هەندێ (ئەی برایـانی خاوەن باوەڕان) ئەمەوێ چەند ئامۆژگارییەك بخەمە بەرچـاوی موسـڵمانان ئەگەرچی خامەكەی من شایانی ئەوە نییە هەروەك نووسـەرێك لەپەندێكدا بەعەرەبی دەڵێت.

(ولكـن أردتُ التـشبّة بالوعّـاظِ والمُرشـدينَ الاعـلام فـان التـشبه بـالكرام فلاح).

واتە (بەڵام ویـستم لاسـایی پەنـدارەكان و ڕابـەران‌و زاناكـان بكەمـەوە چـونكە بەڕاسـتی لاسـایی بــەڕێزان گــەورەكان ڕزگــاری و بەختەوەرییــە هەروەها پێویستە لەسەر هەموو خاوەن باوەڕان فـەرمان بەچـاكە بكـەن و قەدەغە لەخراپە بكەن بەتایبەتی مامۆستایانی ئاینی چونكە خوای گـەورە

فـەرمان بەپێغەمبـەر (ﷺ) ئـەكات وەپێـی ڕائەگەیـەنێت و دەفـەرمووێت لەقورئانی پیرۆزدا.

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾

سـورەی النحـل ئایـەتی ١٢٥ واتـە (بانگـەوازی خـەڵك بكـە بـۆ ڕێگـەی فەرمان بەرداری خوا بەووتار و كرداری باش و ئامۆژگاری جـوان و پەسـند وەموناقەشـەیان لەگەڵـدا بكـە بەچـاكترین شـێوە) هـەروەها پێغەمبـەریش (ﷺ) لەبارەی ئامۆژگارییەوە دەفەرمووێت:

(الدينُ النصيحةُ قُلْناَ لِمَنْ؟ قـالَ للهِ وَلِكتَابِـهِ ولِرَسُـولهِ والأئمـةُ المُـسلمينَ وَعامتَهِمْ).

رواه مـسلم واتـە: (ئـاین بریتییـە لـەوە كـەئامۆژگاری خـەڵك بكـەیت و وەدڵسۆز بیت بەرامبـەر بەخـەڵك وە خـەڵك بخەیتـە سـەر ڕێگـای ڕاسـت و دروسـت هەواڵـەكانی پێغەمبـەر (ﷺ) غـەرزیان كـرد بـۆ كـێ؟ فـەرمووی بەرامبەر بەخوا و قورئـان و پێغەمبـەر و پێـشەوانی موسـڵمانان و تێكـڕای موسڵمان) سوود و كەڵكی ئەم فەرمووده پیرۆزە ئەمەیە بەكورتی (یەكەم) ئامۆژگاری بەرامبـەر بـەخودا (ئەوەیـە) واتـە سـاغی و دڵـسۆزی بـۆ خـودا ئەوەیـە كـەبڕوات وابێـت ئـەو تـاك و تەنیایـە و بـێ هــەواڵ و هاودەمـە وەفەرمانــەكانی بــەجێ بهێنێــت وەلەفــەرمانی كردنــی دوور بكەویتــەوە (دووەم) ئامۆژگـاری و سـاغی موسـڵمانان بەرامبـەر بـە (قورئـان) ئەوەیـە باوەڕی پێ بكەی كەووتەی خودایە وەخوا ناردوویە سەر پێغەمبـەر (ﷺ) وەلەفەرمانی قورئان دەرنەچێ وە لەفەرمانی بكەی وەبەخەڵكی ڕابگەیەنی

(سـێهەم) ئامۆژگـاری و سـاغی موسـڵمانان بەرامبـەر بەپێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەیە کەباوەڕت هەبێ خوای گەورە ڕەوانەی کردووە بۆتەمێ و (تەربیـە) کردنـی گـشت ئـادەمیزاد بـەتێکڕایی وەلەفـەرموودەکانی دەرنەچـیت و بەخـەڵکی ڕابگەیـەنیت وەلەڕەوشـتی ئـەو ڕەوشـت وەربگـری وەبەچـاوی (قـەدروو) ڕێـزەوە بڕوانیـە یـاران و (ئـال) و (بـەیتی) بکـەیت (چـوارەم) مەبەست لەساغی و دڵسۆزی بۆ فەرمانڕەوایانی ئیسلام ئەوەیە فـەرمانیان بەجێ بهێنێت یارمەتیان بدەیت لەسەر ڕاستی و ڕێگایان پیشان بدەیت بۆ کـردەوەی چـاك مـادام بـەگوێرەی فـەرموودەی خـوا و پێغەمبـەری خـوا بجولێنەوە (پێنجەم) مەبەست لەساغی و دڵسۆزی بـۆ گـشت موسـوڵمانان ئەوەیـە کـەدەبێت ڕێگایـان پیـشان بـدەیت و ئامۆژگارییـان لەسـەر چـاکە بکەیت کەسوود و قازانجی ئاین و دنیای هەیە هەروەها پێویستە بۆ هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینە تێبکۆشێ بۆ قازانجی گشتی بەتایبەتی ئامۆژگاری بەکەڵك بەگوێرەی زانیاری خۆی وەهەروەها پێویستە بۆ ئەو کەسەی کـەوا ئامۆژگـاری ئەکـەیت وەری بگرێـت و نـەی خاتـە پـشت گـوێ هەرچـەندە ئەگەرچی مرۆڤی ئامۆژگاری کەر کەم و کوڕییەکی هەیە لـەبارەی خۆیـەوە چونکە هەروەکو لەم بارەیەوە شاعیریش دەڵێت:

(اعْمَلْ بِقَولي وإن قَصَرَتُ فِي عَمَلي)

(يَنْفَعُكَ قَوْلي وَلاَ يضرُكَ تَقصرِي)

واتـە: (کـار بکـە بەووتـە باشـەکانم ئەگەرچـی کـەم و کـوڕیم هـەبێ لەکردەوە و کارم چونکە بەڕاسـتی ووتـەی بەکـەڵك و باشـم قـازانجی تـۆی هەیـە وەهـیچ زیـانی نییـە بۆتـۆ کـەم و کـوڕیم) ئومێـدەوارم لـەدەرگای

میهرەبانی خوای گەورە ئەم چەند ئامۆژگاریە ببێت بەمای (سعادەت) و بەختەوەری بۆ گشت موسڵمانان وەببێت بەچرای ڕووناکی بۆ هەردوو جیهان (آمین) خوایە گیرایی بکەیت.

والله أسال الباري عَز وجَل أنْ يَجْعَلهُ خالِصاً لِوَجهِهِ الكَريم وَأنْ يَنْفَعَ بِهِ المُسْلمينَ النفعَ العميم كَما أسألهُ تعالى أنْ يَجعَلهُ سَبَباً لِفوزي وَوَالدي وَإخواني وَجَميعَ المُسْلمينَ وَمَنْ يَسْعى بِطَبعه وَنَشره بالدرجاتِ العُلى في دارِ النعيم وَآخرُ دَعْوانا أن الْحمدُ لله رَب العالَمينَ وَسلامٌ عَلى المُرسَلينَ).

**تأليف العبد الفقير إلى رَحمة رَبه القَدير**

## عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز

**امام و خطيبي ناحيەی دارەتو قەزای بەردە ڕەش**

**ناحية عشائر السبعة– قضاء عقرة**

**المصادف ١/٧/١٩٨٦ م**

# ئامۆژگاری سی و نۆهەم

## باسی ئیمان و باوەڕ بە زاتی خوای مەزن و گەورە ئەکات

الحَمدُلله الذي هَدى مَن أحبَهُ إلى الإيمان وَأمرَ بَعبادَتَهِ وَطاعته وَإلى والديه بالإحسان نَحمَدَهُ تعالى وَنَشكره على نعمة الإيمان وَنسألَهُ التوفيق والسَداد والعون ونَشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ ثَبُتَت وَحدانيتَهُ بالدَليلِ وَالبُرهان وَنَشهَدُ أن سيِّدنا مُحَمداً عَبدَهُ وَ رَسولَهُ وسيِّد وَلَدِ عدنان صلى الله عليه وَعلى آلهِ وَأصحابهِ الذّينَ أخلَصوا العَمَلَ لله في السرِّ وَالإعلان مَن يَطع الله وَرَسولَهُ فازَ بالرضى والرضوان ومَن يَعصى الله وَرَسولَهُ فقد باء بالبُعدِ والخسران... (أما بعد فيا أيّها الأخوان) واتە : لەدوای هەندێ ئەی برایانی ئیمان و خاوەن باوەڕان.

جا هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ سوورەتی /یونس:/ ٩ / قالَ المُفَسِّرون يَستفادُ من هذهِ الآية الكريمة ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ هُم الذينَ صَدَقوا بِوَحدانيةِ الله في الذّات وَالصفات وَالأفعال وَلَم يَشركوا مَعَهُ أحَداً في العَقائد وَالأقوال وَ الأفعال. وَعَملوا عَمَلاً صالحاً إمتثالاً لأوامره وَقياماً بما يليق بربوبّيته وَطَمَعاً في جَناته وَنَعيمهِ هؤلاء هم الثابتون في إيمانهم وَالفائزون بالنَعيم المُقيم عندَ رَبهم وَهم الذين يهديهم رَبُهُم إلى الصالحاتِ بإيمانهم بِسَبَب إيمانهم الرّاسخ الثابت بينهُم وَبينَهُ وَيَفتَح بصائرَهُم إلى الاستقامة هؤلاء هُم الذينَ يَدخلون

الجنّة وَيَتَنَعمون بما فيها من حورٍ وَقصورٍ وأطعمة وأشربة[1] پوختەی واتاکان :

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە کردەوەو چاکەکانیان ئەنجام داوەو فەرمانەکانی خودایان جێ بەجێ کردووەو ئەوا پەروەردگاریان بۆ بەردەوام بوونیان لەسەر ڕێگای ڕاست (هیدایەتیان) دەدات بەهۆی ئیمانەکەیانەوە لەڕۆژی دواییدا باخ و باخاتی شادیبەخشی بەهەشت کە چەندین ڕووبار بەژێریاندا تێدەپەڕێت دەبێتە هۆی خۆشی و کامەرانی بۆیان کە بەڕاستی شوێنی خۆشی و ڕابواردنە .

جا هەروەها بێگومان هەندێکی تر لە زانایان ئەفەرموون (وأعلَموا أن نِعمَةَ الإيمان أعظَم من كُل نِعمَة فالواجب عَلَينا أن نَعرِفَ قَدَر نِعمَة الإيمان الذي أنعَمَ الله بها علينا بِفَضل الجودِ وَالإحسان) واتە : پێویستە بزانین نازو نیعمەتی ئیمان و باوەڕ لەهەموو نازو نیعمەتێك گەورەترە ، ئەوجا هەروەها پێویستە و(فەرزە) لەسەر ئێمە کە ئەندازەی نازو نیعمەتەکان بزانین ئەوەی کە خوای گەورە لەگەڵ ئێمەی کردووە ئەو هەموو چاکەی بە ئێمە بەخشیوە .

## ( ئاگاداربیەکی گرنگ )

ئەوجا هەروەها ئیمان بەزاتی خودای تەعالا ئەمەیە ، ئینسانی هۆشیار بالّغ باوەڕی ببێ بەوەی کە ئەم جیهانە بە (ئاسمان و ئەرزەوە) بە ووشکانی و دەریاوە بە کۆسارو ساراوە پەروەردگارێکی هەیە (واجب

(1) بڕوانە پەرتوکی (الإشراقات الروحانية في الخطب المنبريّة) لە نوسینی مامۆستا (عبدالسلام العمراني الخالدي) لاپەڕە/ ٨٨.

الوجود) ە پێویستە بوونی و مەحاڵە نەبوونی چوونکە بێگومان ئەم زاتەیە بەتــەنیا ئــەم جیهانــەی لــە نەبوونــەوە هێناوەتــە بــوون جــا هــەروەها ئادەمیزادی خاوەن ژیر بە (ئینصاف) و بە ویژدان بۆ پەیداکردنی ئیمـان و بـاوەڕ بـە زات خـوای تـەبارەك و تـەعالا (رەحمـەتی) نـاویَ بـە مـەرجیَ تەماشای ئەم خاڵانە بکات و سەرنج بدات و ئینجـا (حەقیقـەتی) بـۆ ڕوون ئەبێتەوە ...).

خاڵی یەکەم: – هەروەها (عاقلّ) ترو ژیر ترو کارامـەتری ئـەم (کەونـە) واتە بوونەوەرە لە جیهاندا ئادەمیزادە چوونکە بێگومان ئادەمیزادخاوەنی زانیـاری و پیـشەوەریە وە دەتـوانیَ جیهـان ئـاوەدان بکاتـەوە، هـەروەها کۆمەلّ ڕێك بخا و چارەی (گـیرو گرفتـی) دونیـا بکـا ، چـوونکە بەڕاستی ئادەمیزاد زۆر بەرزو بەڕێزە هەروەك خوای گەورە لە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ سوورەتی/ الإسـراء:/ ٧٠ واتـە : سـوێند بـەخوا بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەنەوەی ئادەم گرتووە ، جا بێگومان ئادەمیزاد زۆر بەڕێزە چوونکە هەمیشە باوەڕی هەیـە کـەوا لـەژێر گـۆڕانی حاڵـدا سـاغەو نەخۆش ئەکەویَ گەدایـەو دەوڵەمەنـد ئـەبیَ هـەروەها دەوڵەمەنـدەو گـەدا ئەکەویَ بیَ ڕێزەو ڕێز پەیدا ئەکا ، بەڕێزە و بیَ ڕێز ئەبیَ لە ئەنجامـدا لـەو هێزەی کە هەیەتی بیَ هێز ئەبیَ و بەهیچ جۆرێك چاری ئەم بیَ هێزیەی پیَ ناکریَ هەتا هەناسەی لیَ مابیَ ئینجا ئەمریَ و بیَ گیان ئەکەویَ جـا ئەگـەر ئادەمیزاد کە (شعوری) ببیَ و بەم نوقسان و داماوی یـە بەڕاسـتی ئـەزانیَ پێویـستی هەیـە بـە پـەروەردگارێکی خـاوەن دەسـەڵات و لـە نەبوونـەوە بوونەوەر بکا (ئەویش زاتی خودایە).

خاڵی دووەم :– ئینسانیَ کە ئەڕوانیَ ئەجزای ئـەم جیهانـە یـا ووشـکە

وەکو بەرد ، وە یا زیادو کەم ئەکا وەکو گیا بەلاّم بێ شعورە وەیاخوود زیادو کەم ئەکاو گیان دارە وەکو (ئەنواعی) گیان لەبەرانی جیهان ، وە هەروەها بەرزترینی گیانداران ئادەمیزادە ، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە (شعووری) هەیە بە نوقسانی خۆی و هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی پێ بگا بەلاّم قەت ناگاتە پایەیێ کە ئیحتیاجی بە غەیری خۆی نەبێ ، وە هەر شتێ غەیری خۆی لەوانەی وان لەبەر چاویدا وەکو ئەو داماوو نیازمەندن، کەوابێ بەهەست و شعوری صاف و بێ گەرد باوەڕ ئەکا کەسێ هەیە کە هەموو کەسێ و هەموو گیان لەبەرو بێ گیانێ لەژێر هێزو توانای ئەودان ئیدارەیان بکا.

خاڵی سێ یەم:- ئادەمیزادی ژیر (عاقل) ئەڕوانێ قەت نانێ بێ نانەوا سەربەخۆ دروست بووە یان بەرگێ بێ دوورمانێ سەربەخۆ دروست بووە یا خانویەك بێ وەستا قەت بینا نەبووە دەی چۆن باوەڕ ئەکا بەوەی ئەم عەرزو ئاسمانە و ئەستێرە جوانانە و ئەم کۆسارە پڕ لە کانی و ئاوو گوڵزارە ، ئەمك دەشت و ساراو چیاو چۆلە بەبێ پەروەردگارێ پەیدابوون؟) .

خاڵی چوارەم:- ئادەمیزاد تەماشای هەر دەستکارێکی دلگیر بکا وەکو سەعات یا مەکینە یا فڕۆکە سەری سوڕ ئەمێنێ لە ژیری دروست کەرەکە ، دەی کاتێ بێ تەماشای ئەم ئاسمانە بەرزە بکە بڕوانێ بۆ ئەو ئەستێرە درەخشانە جوانانە و ئینجا بیر کاتەوە لەو دەورەو هەڵسوڕانی بەردەوامیان کە بەدرێژایی کات بە موویێ لە ئەندازەی خۆیان کەم یا زیاد ناکەن وە تەماشای ئەم (قرص) ی تیشکی هەتاوە بکا کە لەسەر کەشفی (عیلمی) ملیۆنێ جار لە ڕۆژ گەورەترە وە تەماشای جیسمی خۆی بکا وە

بیربکاتەوە لە هێزی چاوو گوێچکەو (دەماغ و نوخاعی شەوکی) و تەماشای جموجۆڵی دڵ لە سانیەی چەند جار لێدەدات هەروەها تەماشای هاتوچۆی خوێن بە ڕەگەکانی لاشەی دا هەروەها ئەگەر تەماشای ڕێکخستنی ئێسقان و جومگەو ڕەگ و پەیوەندیان بەیەکەوە بکا مادام ژیرو خاوەن (ئینصاف) بێ باوەڕێکی باش پەیدا ئەکا بەوە کەوا پەروەردگارێکی زینـدووی زانـای هەیە کەئەم وەزعەی درووست کردووە).

خاڵی پێنجەم:- پێویستە ئێمەی خاوەن باوەڕان ئەبێ بزانین کە (دین) و ئایینی پاکی ئیسلام لەسەر (یازدە) مادەوە بەندە دانراوە کە (شەشیان) بە (ئوسوڵی) دین و بناغەی ئایین دەناسرێن و ئەویش بـریتین لـە ئیمـان و بـاوەڕ بـە خـوای گـەورە و بـە فریـشتەو بـەو (کتێبانـەی) کـە خـوا بـۆ پێغەمبەرەکانی ناردوون وە ئیمان بە پێغەمبەران و ئیمان بە ڕۆژی قیامەت و ئیمان بەقەزاو قەدەر [1] هەروەکو پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) خەبـەری داوە وەکو ئەفـەرموێت (الإیمـانُ أن تـؤمنَ بـالله وَمَلائکَتـه وَ کُتُبـه وَ رُسُـله وَبالیومِ الآخر وبِالقَدَرِ خَیرِه وَشَرِه) رواه الشیخان، (دووهەم) شتێکی دیارە وەخەڵکیش پێی ئەزانن ئەویش بریتیەلـەپێنج کـردەوە ، وەکـو پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی (الإسلام أنْ تَشهَدَ أن لا إلـه إلا الله وأنَ محمـداً عَبـدهُ وَ رَسولَهُ وَتُقیمَ الصَلاة وَتُؤتي الزّکاة وَتَصومَ رمضان وَتَحُج البَیت إن إستَطعتَ إلیه سبیلاً)، واتە : ئیسلامەتی بریتیە لەوەی کە شایەتی بدەی کـەوا هـیچ کەسێ نییە بۆ ئەوە بشێ عیبادەتی بۆ بکرێ مەگەر ئەو زاتە کەناوی (الله) یە و/ کـەوا (مُحَمّد) بەنـدەو پێغەمبـەری خوایـە و نوێـژ بکـەیت و زەکـات

(1) ئەگەر خوا حەز بکات ئیمان بە ڕۆژی دوایی و ئیمان بە قەزاو قەدەر لە جێگای خۆی باسی ئەکەین ، (إنشاء الله).

بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت و ئەگەر توانیت حەج بکەیت .

((درێژەی ووتەکان))

جا هەروەها مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا (عبدالكريمى مدرس) لە پێشەکی پەرتووکی شەریعەتی ئیسلامدا ئەفەرموێت (بەشی یەکەم لە حەدیسی ناوبوراو (ئەصڵی) دین و ئایینە لەبەر ئەوەی کە بریتیە لە باوەڕو کەسێ باوەڕی بە شتێ بوو لەسەری ئەڕوا بەشی دووەمیش فەرعی دین و ئایینە وەك چۆن لەداری میوە بەرو سەمەر وەرئەگیرێ هەروەها یەکێ ئیمان و باوەڕی بوو ئەوا سەمەری فەرمان بەرداری خودای دەست دەکەوێ وە ئەم پێنج ئادابە بەجێ ئەهێنێ) بەڵام لەئەوەی کە ئیمان و باوەڕ دیارنیە و (غەیبە) تا یەکێ بەدەم (ئیقرار) نەکا کەس پێی نازانێ لە دینی ئیسلامدا بڕیار دراوە کەوا ئەم دوو (کەلیمەی) شەهادەتە ببێ بەهۆی ئەوەی ئینسان بڕواتە ڕێزی ئەوانەوە کە بەخاوەن ئایین ئەناسرێن ، جا لەبەر ڕووناکی ئەم دوو فەرموودەیەی پێشودا هەندێ قسە بکەین و ئادابی موسڵمانان کە یازدە بەشە شەشی ئەصڵ و (ئەساسە) و پێنجیشیان (فەرعی) دینی ئیسلامە جا بێ گومان (الإيمانُ عِندَ أهْلِ الحَقيقةِ بِكلِّ ما جاءَ بِهِ نَبيّنا مِنْ عِنْدِ اللهِ تعالى) واتە : ئیمان و باوەڕ لای (ئەهلی حەقیقەت) و (دین) باوەڕیە بە هەرچی کە حەزرەت (ﷺ) هێناویەتی لەلای خوداوە لەبەشی بیرو باوەڕو لە ڕەفتارو کردەوە) جا هەروەها (ئیمان) بە خودای تەعالا ئەوەیە ئینسان بە دڵ باوەڕ بێنێ کە ئەم جیهانە بە بەرزو نزمی ڕوناك و تاریکی ووشك و تەڕی و دیارو پەنهانی پەروەردگارێکی وای هەیە هرچی صیفەتی چاکە هەیە هەیەتی و لەهەرچی صیفەتی خراپە هەیە دوورە ئەو پەروەردگارە بە عەرەبی ناوی (الله) یەو

به کوردی ناوی (خودا) یە هەروەکو لە پێشەوەدا باسمان کرد.

**(تێبینیەکی گرنگ)**

زۆر لە زانایانی (ئەهلی عەقیدە) ئەفەرموون خوای گەورە بۆیە چاوی داوە بە ئینسان تا ڕێگای ڕاست لە چەوت جیا بکاتەوە بۆیە عەقڵ و بیرو هۆشی داوەتیێ (حەق و ناحەق) لێك جیا بکاتەوە هەروەها ڕاست و درۆ لێك جیا بکاتەوە نەکەوێتە دوای شتی بێ سوودو خەیاڵی و بێ قیمەت و یان دوای هەنگاوەکانی شەیتان).

ئینجا هەروەها بۆ نموونە هەروەکو خاوەن بیروڕای بەهێز باوەڕ ناکا بەوەی نەخشێ بەبێ نەخش گەرو خانووێ بەبێ (بەننا) درووست کرابێ ، باوەڕیش ناکە ، ئەم جیهانە خاوەن نەخشە جوانە ئەم دەشت و کۆسارانە ئەم چۆڵەو سارای پڕ لە گیاو گوڵ و نەمام و دارانە هەروەها ئەم ڕۆژو مانگ و ئەستێرە پڕتەو دارانە کە هەریەکێ یاسایەکی تایبەتی هەیە ڕێگەی هاتووچۆی گرتووە خاوەن و پەروەردگارێکی زیندووی زانای بەتوانی نەبێ دەستی بڕوا بەسەر هەموویان و ئاگای لەهەمووی بێ وە سنوورو یاسایان بە ڕاستی ڕابگرێ هەرکەسێ بیری وانەبێ یا شێتە یا لەبەر مەستی خۆی شێت کردووە جا هەروەها لەسەر ئەم بیرو باوەڕەیە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ئادەمیزادە شارەزا ئەکا بۆ تەماشای عالەم و بۆ بیرکردنەوە لە (وەزعی) شەوو ڕۆژدا هەروەها لە ئەرزو ئاسمان و مانگ و ڕۆژو ئەستێرەکان و کەژوو کێو و ڕووبارو دەریاو کەشتی و غەیری ئەمانە کە هەر یەکێ جۆرە دەلیلێك و بەڵگەیەکن لەسەر ئەوەی کەوا ئەم چەرخ و فەلەکە خاوەنێکی هەیە ڕای بگرێ و ئەنجامی بداو، چوونکە بێگومان

هـەموو خـاوەن هۆشـیٚ ئـەزانیٚ دارو بـەرد و خـاك و خـۆلٚ ئـەرزو ئـاوو ئەستێرەو هەوا شتێکی بیٚ گیـان و بیٚ (شـعورن) نـاتوانن و هیـچیان پـیٚ ناکریٚ و لەناو هـەموو درووسـتکراوەکاندا ئـادەمیزاد کـە بـە عـەقلٚ و بـیرو بـاوەڕ خـاوەن پایەیـە مایـەو چـوونکە هێـزی ئـەوەی نیـە گیـان لەبـەریٚ درووست بکاو شتیٚ ماددەی نەبیٚ پەیدای بکا تەنانـەت بەرامبـەر (مـردن و ژیانی) خۆی بەرامبەر بە (غەمباری و ڕزگاری خۆی دەسەلأتی نیەو لەپاش سەد سـالٚ عـەقلٚ بـازیٚ و خوێنـدن بـەراوردی بەسـەرهات و تەماشـاکردنی کارەسات (حەیران و سەرگەردانە)، کەواتـە بـە ئاشـکرا پێویـستە ئینـسان بـاوەڕی ببـیٚ و دان بـەوە دابنـیٚ کـە خـاوەن هێـزە پـەروەردگاری هـەموو عالەمەو (موحتـاج) نیـە بـە کـەس و ، هـەموو (عالـەم) موحتـاجی ئـەوە ، لەهەرچی (عەیب) و (عار) هەیە ئەو خوایە مەزنە دوورە هـەروەها هەرچـی صـیفەتی گـەورە هەیـە هەیـەتی ئـەو زاتـە بەڕێزە خـاوەن دەسـەلأتە جـا هـەروەها ئـەم خـاوەن هێـزە (قەدیمـە) و هـەر بـووەو نـەبوونی نـەبووە و (ئەبەدیە) واتە هەر ئەبیٚ و نەبوونی بەسەر نایەت ، جا هـەروەها بێگومـان ئەم زاتە (ماددەیی) نیە پێویستی بە جێگە بیٚ و ئەندامی نیـە لـە (ئـەعزاو ئەجزا) پەیدا بووبیٚ و پێویستی بە جێگە بیٚ ڕەنگی نیە بـە شـتێکەوە بـیٚ پاکـە لـە تـەرف و لای ژوورو خـوارو ڕاسـت و چـەپ (صـورەت) و شـێوەو وێنەی نیە ، هەموو خەڵك وا لە (قەبزەی) توانای ئـەوان چـوونکە خـاوەنی عەرش و ئەرزو ئاسمانە و ئـەتوانیٚ دەسـت بـدا لـە هـەموو وەزعێکـی ئـەم خەڵکـەو بەهـەر (نـەوعیٚ) مـەیلی ببـیٚ ئیشی تیـا بکـا ، لەگـەلٚ ئەوەشـدا سـوورەت و وێنـەی نیـەو (هـەروەکو لەپێشەوە باسمـان کـرد) هـەروەها بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو خاوەن ئیمانیٚ بەچاوی خۆی واتە چاوی

سەر ئیبینیٚ ، وەك چۆن لەم دونیایەدا یەكیٚ مانگی چواردە ئەبینیٚ خـوای گەورە لە قورئانـدا ئەفـەرمویٚت لـەم بارەیـەوە ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴾ سـورة القيامة:/ ٢٢، واتە لە ڕۆژی قیامەتدا دەم و چاوو ڕوخـسار واتـە (ڕوومـەتی بـاوەڕداران) گـەلیٚ گەشـاوەو پـاراوو پرشـنگدارە و خۆشـی و شـادی لیٚ دەبینریٚ ﴿ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴾ سوورەتی القيامة: ٢٣، واتە : بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن ئەبینن و[1] ، جا هەروەها زۆربەی پەرتووكە (عەقیـدەكان) ئەڵیٚن پیٚویستە هەموو موسڵمانیٚ ئیمـان و بـاوەڕی ببـیٚ كـە لەقیامەتـدا بـە (حضوری) زاتـی خـودا ئـەگاو چـاوی پـیٚ ئەكـەویٚ بەبەڵگـەو فـەرموودەی خوداو پیٚغەمبەر (ﷺ) هەروەك حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (إنَكُم سَترونَ رَبَكُم كَما تَرونَ القَمَرَ ليلة البدرِ) واتە ئیٚـوە (ئـەی خـاوەن بـاوەڕان) خـوای خۆتان ئەبینیِن هەروەكو چۆن ئەڕوانن بۆ مانگە شەوی چواردە ، بەلاٚم لـە ڕیٚوایـەتیٚكی تـردا (لـە جـەریری كـوڕی عەبـدوللاٚوە خوایـان لیٚ ڕازی بیٚـت) ئەگیٚڕیٚتەوە (قالَ كُنا عندَ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) جُلُوساً نَنظر إلى القَمَرِ لَيلة البَدر فَقالَ إنَكُم سَتَرونَ رَبَكُم عياناً كَما تَـرونَ هـذا القَمَـر) رواه الشيخان، واتە لە خزمەتی حەزرەتدا دانیشتبووین ئـەمان ڕوانـی بـۆ مـانگ لەشەوی چواردەدا ئینجا حەزرەت (ﷺ) لەویٚدا فەرمووی (بەڕاستی ئیٚـوە لەمەولا خودای خۆتان بە ئاشكرا ئـەبینن واتـە بەچـاوی خۆتـان هـەروەكو

---

(1) (جا بیٚگومان جەماوەری زانایان) ئەفەرموون هەروەكو لە چەندین فەرموودەی ڕەوا و (سەحیح) دا وەرگیراوە ، دەڵیٚن مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە كە لە ڕۆژی قیامەتدا بەندە ساڵحەكان تەماشای خوای خۆیان دەكەن و بەچاوی خۆیان (یا بەچاوی سەر) دەی بینیِن وەك چۆن بە ئارەزووی خۆیان تەماشای مانگەشەوی چواردە دەكەن و ئەیبینیِن) بڕوانە (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ب/١٣ لاپەڕە/ ٤٢٩.

چۆن ئەم مانگە ئەبینن (واتە دوو دڵی ناکە لە چاوپێکەوتنیدا) جا ئەگەر ئەتوانن و پێتیان ئەکرێ پشت لە نوێژی (الضحی) واتە نوێژی چێشت تەنگاو مەکەن ئەوجا ئەم ئایەتەی /خوێندەوە/ پێغەمبەر (ﷺ)

﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴾ سوورەتی/ ق: ٣٩ ، جا هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا دوور نزیکی بۆ ناوتریٚ یان (تەرف) و ڕاست و چەپ و خوارو و ژووری نییە ، هەرکەسێ لەهەر شوێنێکدابێ خوا لە گەڵیایە چوونکە نزیکترە بۆ ئینسان لە دەماری واتە لە ڕەگی ملی ، جا بەکورتی (زاتی خوای تەبارەك و تەعالا) لەهیچ شتێ ناچێ و چوونکە هیچ وێنەی نییەو لە هەرچی (نەقص) و عەیبە دوورە هەرچی صیفەتی گەورەو کەمالە هەر لە ئەزەلاً بۆ ئەوە وە ئێستاش هەیەتی وە هەتا هەتایێ هەر ئەمێنێ .

(خولاصەی کەلام): بە کورتی زاتی خوای تەبارەك و تەعالا زاتێکی تاك و تەنیای بێ (شەریك) و بێ هاوەڵە لەبەر ئەوە کە خاوەنی هەموو دەسەلاًت و کەمالە وە هەروەها لە عەیب و نەنکی دوورە وە ئەتوانێ بە هەموو جۆرێ تەسروف بکا و لەهەموو عالەما لە بوونەوەرو جانەوردا.

## (باسێك لە صیفاتی زاتی خوای گەورە)

جا بێگومان زاتی خوای تەبارەك و تەعالا هەر زیندووەو (قەت) نامرێ بەلاًم زیندوو ی ئەم زاتە بەلەش و (ئەعزاو) ئەندام نیە ، زیندوویی هەموو شتێ بەوە بەلاًم زیندوویی خودا بەخۆیەتی لە (ئەزەل) هەتا ئەبەد، چوونکە زیندووەو قەت نامرێ ئینجا هەروەها ئەم زاتە (عالم) و زانایە بەهەموو شتێ و ئەم زانستەی ئەزەلییە و ئەبەدییە (عالمە) بەهەموو شتێ

که (قابلی) ئەوەبێ یا خەڵی لێ بکرێ لە ئەرزوو لە ئاسمانا لە گەورەو بچووك ، لە ئاشکراو پەنهان تەنانەت (ئەگەر مێرولەیێ یا گێرکەیێ لە بنی زەوییا بڕوا بەسەر بەردێکی لووس (وەکو هەسان) خوای گەورە عیلمی پێی هەیە ئەیبینی و گوێی لەدەنگی پێیەتی) هەروەکو زانایانی ئەهلی (عەقیدە) ئەفەرموون (البَصيرُ الذّي يُبْصِرُ دَبيبَ النَملةِ السَوداءِ فِي اللَيْلَةِ الظَلّماءِ وَهيَ ماشِيةٌ) وە لەگەڵ ئەمەشدا خودای پەروەردگار خەڵقی کردووەو ڕزق و ڕۆزیشی ئەدا و لەبیریشی ناکات جا بێگومان هەرکەسێ هەر خەیاڵێ بە دڵیا بێ و هەروەها بەر لە خەیاڵەکە ئەو لە ئەزەلا زانیویەتی و ئێستەیش ئەیزانێ و لەمەولاش هەر ئەیزانێ (بلا تشبیه) وەکو یەکێ ئاوێ"نەی لە بەرامبەری لاپەڕە کاغەزێکی نوسراوەوە بگرێ چۆن ئەو ئاوێنە (صورەتی) ئەو لاپەڕەو ئەو دێرە حەرفانە بەڕێز وەرئەگرێ ئەوهاش خوای گەورە لە ئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەرشتێ لەهەر شوێنێ و لەهەر وەختێکا ببێ وا بە تەرتیبی خۆی لەبەر ئاوێنەی عیلمی ئەوا دیارەو هیچ کەم و زۆرێکی لێ وون نابێ جا هەروەها ئەم زاتە خاوەن (ئیرادە) واتە خواهیش و خواستە هەرچی لە عالەما بووەو ئێستا هەیە وە لەمەولا ئەبێ هەمووی لەسەر ئیرادەو خواستی ئەوە وەهەر شتێ خواستی ئەوی لەسەربێ ئەبێ ببێ و هەر شتێ خواستی ئەوی لەسەر نەبێ قەت نابێ، هەروەها زاتێکی (قادر)ە چوونکە (قودرەتی) هەیە واتە هەر لە ئەزەلا (سیفەتی) توانایی و دەست ڕۆیشتنی هەیە بەسەر هەموو شتێکی وادا کە (مومکین) بێ دەتوانێ بەماوەیەکی کەم هەرچی گیان لەبەرە گیانی بکێشێ وە هەرچی مردوو هەیە زیندووی بکاتەوە وەهەروەها دەتوانێ پاشایەکی جیهانگیر بکات بە لات و داماوو فەقیرو گەدا.

جا نموونەی ئەو شتانەش (بلا تشبیە) ڕەئیسی دەستگای کارەبا بە ئانیَ ئەتوانیَ چرای ملیۆنیَ شویَن دابگیرسیَنیَ یان بیکوژیَنیَتەو ە ، وەها دەستی بەسەر هەموو کردەوەیەکا هەیەو ئەتوانیَ جیَ بەجیَی بکا (سمیع) ە واتا هەرشی دەنگ هەیە ئاشکرا یا پەنامەکی ئەیبیسیَ و گویَی لیَیەتی[1] ، هەروەها (بەصیر و بینایە) هەرچی شت هەیە لەبەر چاو بیَ یا لەبەر چاوو نەبیَ ئەیبینیَ گەورەو بچووك ووردو درشت هەروەها ئاشکراو پەنهان لەلای خوای تەبارەك و تەعالا وەکو یەك وایە ، زەڕەییَ تۆز لە فەزادا لەلای خواوە وەکو کیَویَ دیارە (بلا تشبیە) نوسراویَکی زۆر وورد کە چاو درکی ناکا ئەگەر یەکیَ زەڕەبینی هەلگریَ کە شت بکا بە ملیۆنیَ قات چۆن ئەو پیت و حەرفە ووردانە لەلایا گەورەن و دیارن ئەو شتەی کە لەلای ئیَمە دیارنیە لەلای چاوی دەرکی خودا بەچەند هەزار قات گەورەیە و دیارە ، هەروەها زاتی خودا (مُتَکَلِم) ە واتە خاوەن کەلامەو هەروەها حالَی بوون لە (صیفەتی کەلامی) خوا بۆ ئیَمە ئەوەندە (قابیلە) بە ویَنەی ئەمە بلَیَین (بلا تشبیە) ئینسانی بە خۆیا ئەزانیَ هیَزی هەیە لە وجوود یا (ئەساسە) بۆ ئەوە کە بتوانیَ مەقصەدو مەبەستی خۆی بیَنیَتە خەیالَەوە ئەوسا بۆ ئەو خەیالانە (لەفزو حەرف) بڕیاربدا پاش ئەوە بە (زمان) دەریان بخاو خوای تەعالاش هەر لە ئەزەلا (صیفەتیَکی) وای هەیە (ئەساسە) بۆ ئەوە چوونکە بیَگومان هەر شتیَ خوای گەورە مەیلی بیَ و دەری ببڕیَ یا لەفزی بۆ دابنیَ وە ئەو لەفزانە بە هیَزی پیرۆز بگەیەنیَ بە

---

(1) لە شەرح و ماناکانی ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە ئەمانە هەموویان ڕاڤەو تەفسیر کراون لە پیَشداو هەریەك لەم ناوە پیرۆزانە ماناو مەبەستیَکی تایبەتی هەبووە پیَشودا.

فریشتەی قسە گەیاندن کە ناوی حەزرەتی (جوبرەئیلە) سەلامی خوای لێ بێ ئویش بە (عەینی) ئەو ووتارە کە خوای گەورە پێی گەیاندووە ئەویش ئەگەیەنێ بە پێغەمبەران (ﷺ) ئیتر بەبێ ئەوە ئەو فریشتە دەخلی ببێ بەو ووتارو قسانەوە، ئەخرێتە دڵیەوە ئەویش لەسەر عەینی فەرمانی خودا (تەبلیغی) ئەکاو ئەیگەیەنێ بە پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خوایان لێبێت) [1] .

## ( ئاگاداریيەك )

## ( لە چۆنیەتی سیفاتی خودا )

جا هەروەها بێگومان زاتی خوای تەبارەك و تەعالا چۆن (حەقیقەتی) لای عەقلێ و هۆشی ئێمە وبەتەواوی دەرناکەوێ (صیفەتەکانیشی) هەروەها بۆ ئێمە بەتەواوی دەرناکەوێت ، وەك چۆن ئەزانین زاتی خودا هەیە وە زاتێکە (واجب الوجودە) ئەبێ ببێ و موحتاج بە کەس نییە وەهائ ئەیزانین ئەم سیفەتانە هەر لە ئەزەلا بوون و ئەبێ هەر هەبن .

ئێمە چاومان ناکەوێ بە هێزو قوەتی کارەباو ئەلەکتریك... بەلأم لەکاتێکدا ئەگەر کەسێکی گرت و کوشتی بەبێ گومان ئەزانین ئەمە هێزێکی زۆر توانا بوو بە ئانێ ئەو ئینسانە زەلامەی گرت و کوشتی و فرێیدا). یان بۆ نموونە هەر کاتێ چاومان کەوت بە (بینایەت) و قەصرێکی زۆر (مهیم) و مونتەزەم/ کە بە یاسایەکی/ بەرزی (هەندەسە) بە پارچە بەردی نەخشکراو بە قالبی دارێژراو درووست کرابوو ، ئەوجا هەروەها

---

(1) بڕوانە پەرتووکی (شەریعەتی ئیسلام) لە نووسینی خوالێخۆش بوو مامۆستا (مەلا عبدالکریم ی مدرس) لەگەڵ دەستکاری /بەرگی یەکەم/ ، لاپەڕە/ ١٠).

بێگومان ئەیزانین ئەو وەستایە زیندووە بووە/ کە ئەمەی درووست کردووە ، چوونکە مردوو شتی پێ درووست ناکرێ هەروەها کە مرد پەکی کەوت ، جا هەروەها بۆمان دەرکەوت و ئەزانین زۆر زانا بووە چوونکە نەزان عەقلی بە (هەندەسە) ناشکێ ئەزانین (عەمەلەکان) زۆر بەتوانا بوون چوونکە بێ هێز بەردو شێلمانی گەورە هەڵناگرێ ، هەروەها ئەیزانین چاوو گوێیان بووە لەبەر ئەوەی کە کرێکاری کەڕ قسە نابیسێ و لەفەرمانەکانی وەستا باش حاڵی نابێ و کرێکاری کوێر بەردو خشتی مەقسوود نابینێتەوە لەسەر ئەم ئەساسە ئەزانین پەروەردگاری ئەم جیهانە جوانەو ڕەنگاو ڕەنگە ئەبێ زیندوو و زاناو بەتواناو خاوەن خواست و بیسەرو بیناو خاوەن گوفتار بێ و بەبێ ئەم صیفەتانە ئەم دەستگایە درووست ناکرێ جا هەروەها ئەبێ بزانین (خیلافی) ئەم سیفەتانە کە بریتیە لە مردووی و ناچاری و نەزانی و ناتەواوی کەڕی و کوێری و لاڵی و هەموو (عەیب و نەقصن) بۆ زاتی پەروەردگار ناشێت هەتا ئەگەر ئینسانێکی (عادەتی) ئەم نەنگ و عەیبانەی پێوە بچەسپێ زۆر (عاری) لێ دێ وە ناڕەزایە بەو هەموو ناتەواویە کەوابێ بۆ زاتی خودا (قابیل) نین و لە (شەئنی) ئەو دا نییە (تَعالی الله عَن ذَلكَ)– ( جلت قُدرَتُهُ وَهوَ العليُ الكبير)

**(تێبینیەك)**

خوێنەرانی ئازیزم ئیمان و باوەڕ بەخوای گەورە ئەوەیە کە باوەڕت بێ بەوەی کە خوا هەیەو وقەدیمەو[1] هەر بووەو/ هەر دەبێ و/ هەموو مەوجوداتێك ئەو بە (وجودی) هێناوەو/ بەدەستی ئەوە ، توانای بەسەر

---

(١) هەروەکو لە پێشەوە ئامازەمان بۆ کرد ، وە تەفسیرو ڕاڤەکراوەو .

هـەموو شـتێكدا هەیـە ، هـەروەك قورئـان ئەفـەرموێت : ﴿ تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ ﴾واتــە: بــەرزو بلّنــدو گەورەیــە ئــەو زاتــەی دەســەلاّتی هــەموو بوونـەوەری بەدەسـتە ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾ سـوورەتی/ الملـك:/ ١، واتە : هەر ئەویشە تواناو دەسەلاّتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە).

جا هەروەها دەبێ ئینسانی موسلّمان باوەڕی هـەبێ بـە زاتـی خـوا بـە سیفاتی خوا ، هەروەها دەبێ باوەڕی هەبێ كە خوای مەزن لە هیچ شتێك ناچێ و وێنـەی نیـە و هـیچ شـتێ وەك خـوا نییـە وەك قورئـان ئەفـەرموێ ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ ﴾واتە: هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئـەو خوایـە نـە لە زاتیا نە لە سیفاتیا نە لە كرداریا بۆخۆی تەنیایەو لەهـەموو شـتێك بـێ نیـازە وە هــەموو شـتێكیش نیازمەنـدە بــەو ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ سورەتی الشوری: ١١، واتە : ئەویشە بیسە رو بینـاو بـە ئاگـا بـە ووتـەی بەنـدەكانی بینایـە بـۆ كـارو كرداریـان ، جـا هــەروەها هــەر خــەیالّ و خەتەرەیەك بە دلّتدابێت خوا ئاگادارەو ئاگـای لـە ئاشـكراو نهێنـی هەیـە ، وەك قورئـــــان ئەفـــــەرموێت: ﴿ وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ سـوورەتـی الملك: ١٣، هەروەها دەبێ باوەڕت وابێ كە (تاعات و عیبادەت) بۆ ئەو شایەنە و دەبێ هەر بـۆ ئـەو بكـرێ و هـەر ئـەو شـایەنی كڕنۆش و (سوجدە) بۆ بردنە ، جا هەروەها دەبـێ بـاوەڕت وابـێ كـە هـەر خـوا (ڕازقـی) هـەموو گیـان لەبەرێكـە وە هــەر ئـەو ڕزق و ڕۆزیـان دەداو هەروەك قورئان ئەفـەرموێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ﴾ واتـە: بەڕاسـتی تـەنها هەر خوایـە ڕۆزیـدەر ﴿ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴾ سـوورەتـی الـذاریات: ٥٨، واتـە

خاوەن هێزو دەسەلاتی پتەوە هەروەکو لە فەرموودەی (حەدیسی قودسی) دا هاتووە ﴿ يا إبن آدم تَفَرَغ لعبادَتي إملأ صَدرَك غِنيً وأسُدُ فَقرك وإلاّ تَفْعل ملأتُ صَدرَكَ شُغُلاً ولَم أسُد فقرك﴾ رواه أحمد والترمذي وإبن ماجة ، واتە : ئەی کوڕی ئادەم خۆت یەکلا بکەرەوە بۆ پەرستنی من ئەوسا منیش دڵ و دەروونت پڕ ئەکەم لە قەناعەت و بێ نیازی و دەرگای هەژاریت لێ دادەخەم ئەگینا دڵ و دەروونت پڕ ئەکەم لە خۆشەویستی دونیاو ئیش و کارت زۆر ئەکەم وە دەرگای هەژاریشت لێ داناخەم (بۆ ئەوەی فەقیری دەورت بدات) وە لە ڕیوایەتی ئیمام (ئەحمەد) ئەمەش هاتووە (إني أنا الرازقُ ذي القوّة المَتين) هەروەها ئەگەر خوای گەورە تووشی بەلاو موسیبەتی کردی بەخۆی نەبێ بەکەس (عیلاجی) ناکرێ ، وە ئەگەر بیەوێت خێرێکت بە (نسیب) بکات بەکەس قەدەغە ناکرێ هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت : ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ سوورەتی الأنعام: ١٧، واتە : دڵنیابە لەوەی ئەگەر خوا دووچاری زیان و گیرو گرفتت بکات ئەوا هەرگیز لابەری نییە وە لەسەرت دەفع نابێ جگە خۆی نەبێت ، وە ئەگەر بیەوێ تووشی خێرو خۆشیەکت بکات ئەوا ئەو خوایە دەسەلاتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە حەز لەهەرچی بکات دەتوانێ ئەنجامی بدات .، وەك ئەو وفەرموودە (صەحیحەش) کە ئیمامی ترمذی هێناویەتی دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیبن عەباسی فەرموو (يا غُلام إني أُعَلمُكَ كَليماتٍ) واتە ئەی لاوەکە من چەند قسەیەکی بەسوودت فێر ئەکەم (إحْفظْ الله يحْفَظْكَ تَجِدُ تُجاهَكَ)واتە: ئاگات لە خودا بێ و فەرمانی جێ بەجێ بکەو (ئەمری) مەشکێنە خوداش تۆ ئەپارێزێ (ئاگاداری ماڵ و منداڵ و ئایینت ئەکا) وە

له ڕۆژی دوایی ڕزگارت ئەکا وە هەروەها ئاگات لە خودا بێ دەبینیت خوا لەگەڵتایە و لەکاتی تەنگانەتا فریات ئەکەوێ و بەهانات دێت (إذا سأَلْتَ فَاسْأَل الله وَ إذا إستَعَنت فَاسْتَعِن بالله) واتە : هەر کاتێك ویستت شتێك داوابکەی هەر لە خودا داوای بکە چوونکە بێگومان گەنجینەی ئاسمان و زەمین هەر بەدەستی خودایە (کەوابوو نەچی لەبەر نەبوونی و هەژاری خوا لەبیر خۆت ببەیەوە) یان لەبەر نەبوونی ڕزق و ڕۆزی بێ فەرمانی خوای خۆت بکەیت[1] واتە : هەر کاتێك ویستت داوای یارمەتی و کۆمەك بکەی هەر لە خوا یارمەتی و کۆمەك داوا بکە ، چوونکە ئەگەر خوا یارمەتی دەرت بێ کەس پێت ناوەستێ (مەنعی) ئەوەت بکات جا هەروەها ئەفەرموێت (وَأعلَم أن الأمة لَو إجتَمَعَت عَلى أن يَنفَعوكَ بشيء لَم يَنفَعوكَ إلاّ بشيء قَد كَتَبهُ الله تَعالى لَكَ) واتە : بزانە ئەگەر هەموو خەڵك کۆبێتەوە بۆ ئەوەی سودێکت پێ بگەیەنن (کەم یان زۆر) ناتوانن سودت پێ بگەیەنن ، مەگەر ئەو سوودە بەتۆ بگەیەنن کە لە یەکەم ڕۆژدا خوا بۆتی نووسیوە[2] ، (وَلَو إجتَمَعُوا عَلى أن يَضَروكَ بَشيءٍ لَمْ يَضَروكَ إلا بِشيءٍ قَد كَتَبَهُ اللهُ عَليكَ رفِعَت الأقلام وَجَفَت الصُحُف) رواه الترمذي وَقالَ حديثٌ حَسَنٌ صحيحٌ ، واتە: ئەگەر هەموو خەڵك کۆببێتەوە بۆ ئەوەی زەرەرو زیانێکت تووش بکەن ناتوانن زیانت لێ بدەن مەگەر ئەو زیانەت لێ بدەن کە لەیەکم ڕۆژدا خوا لەچارەی نوسیوی ، چوونکە قەلەمەکان لە ئەزەڵدا هەرچییان نووسی

---

(1) چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (إنَّ الرزقَ ليطلُبُ العَبدَ أكثر ممَّا يَطلُبهُ أجَلُهُ) رواه الطبراني ، واتە : بێگومان ڕزق و ڕۆزی بەدوای بەندەدا ئەگەڕێ ئەو بەشەی بۆ دانراوە گشتی ئەدرێتێ لەدونیادا زۆرتر لە ئەجەلی واتە کاتی دیاریکراو بۆ مردنی).

(2) بێگومان کەوابوو سوود بەخشی ڕاستەقینە هەر خودایە .

نووسیان و مەرەکەبەکەش ووشك بووە)[1] ، هەروەها دەبێ باوەڕت وابێ کە هیچ کەس بێ ئیزن و (ئیرادەی) خوا نامرێ چوونکە خوای گەورە لە قورئانــدا ئەفــەرموێت ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ﴾سوورەتی/ آل عمران:/ ١٤٥ ، واتە : هیچ کەسێکیش نامرێت ئەگەر بە ویوستی خوا نەبێت لەکات و وەختی دیاریکراودا (ئەمەش خۆ هاندەرێکە بۆ ئیمانداران کە لەمەرگ نەترسێت) واتە مردن پێش و پاش ناکەوێ لای خوا ماوەی بۆ دیاریکراوە چوونکە مردنی هەر کەسێك کاتی نووسراوەو تۆمارکراوە) وە هەروەها دەبێ باوەڕت وابێ کە لە ئەرزو ئاسماندا هەر خوایەك هەیە چوونکە (العیاذ بالله) ئەگەر دوو خوا هەبوونایە لە شتێکدا ناکۆکیان دەبوو ، ئەوسا نیزام و یاسای جیهان تێك دەچوو ، هەروەکو قورئان لەم بارەیەوە ئەفەرموێت ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾سوورەتی/ الأنبیاء: /٢٢، واتە : ئەگەر لە هەردووکیاندا واتە لە ئاسمان و زەویدا چەند خوایەکی تر هەبوایە (غەیری) زاتی (الله) ئەوا کاول و وێران دەبوو وە تێك دەچوون بەسەریەکدا (عَن عَباس بن عبدالمطلب (رضي الله عنه) أنهُ سَمعِ رسُول الله (صلّى الله عليهِ وسلم) يقول: (ذاقَ طَعمُ الإيمانِ مَن رَضي باللهِ رباً وَبالإسلامِ ديناً و بِمُحَمَّدٍ رسُولاً) رواه البخاري ، واتە : عەباسی کوڕی عەبدولمتەلیب (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت گوێم لە پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) دەی فەرموو (هەر کەسێك بە پەروەردگاریەتی خوداو بە ئاینی ئیسلام و پێغەمبەریەتی محمد (ﷺ) ڕازی بوو ئەوە (تامی ئیمانی چەشتووە).

---

(١) چوونکە بێگومان هیچ گۆڕانێك نایەتە سەر نوسراوی خوا .

عَن معاوية بن الحِكمِ (رضي الله عنه) أنّ النَبّي (صلى الله عليه وسلم) سَألَ الجارية أينَ الله ؟ قالَت في السَماء قالَ مَن أنا ؟ قالَت أنتَ رسُول الله ، قالَ أعتنقها فإنَها مُؤمنة) رواه مسلم ، واته : له مەعاویەی كوڕی حەكیمەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (ئەی كەنیزە خوا لە كوێیە ؟ ئەمیش گووتی لە (ئاسمانە) فەرمووی ئەی من كێم ؟ گووتی تۆ پێغەمبەری خوای ، فەرمووی ئازادی بكە چوونكە بێگومان ئەوە ئیماندارە .

هەزار ڕەحمەت لەو كەسە بێت كە ووتویەتی :

دووره له شعور شتی بیٚ شعوور — بكریٚ به خاوەن بۆ یاساو دەستوور
كەوابیٚ خالیق زیندوو و زانایە — لەسەر خواستی خۆی باش – تەوانایە
جیهان سەرانسەر لە شەهادەو غەیب — درووست كەر هەر خۆیەتی ئەو خودای بیٚ عەیب
كائینات هەمووی كرداری ئەوە — نمیٚ لە دەریای ئاساری ئەوە
بەو كەسەی ناوی تەبیعەت ئەبا — كە پیٚ گەیشتی مەڵیٚ مەرحەبا
چوونكە تەبیعەت ئەڵێی شعوورە — زاتی بیٚ شعوور لە یاسا دوورە
ئەگەر زاتێكی زیندوو زانایە — مەڵیٚ تەبیعەت بڵیٚ خودایە
سا خوا بە حەق سڕی هیدایەت — بەحەقی سڕی عەون و عینایەت
بەحەقی سڕی مەعنای ئیلاهی — مەمان هاوێژە دەریای گومراهی
شارەزامان كە بۆ ڕێگەی شعوور — بۆ ڕێی بەندەیی بۆ یاساو دەستوور
بۆ باوەڕكردن بە خودای بیٚ عەیب — زانای عالەمی شەهادەت و غەیب
دڵمان پڕ بكە لە نووری ئیحسان — تابێینە ڕیزی بەڕێزی ئینسان
تا لەحشەردا بەشەوق و شادی — وەربگرین بەدەست نامەی ئازادی[1]

---

(١) بڕوانە: پەرتوكی نوری ئیسلام ،دلنراوی خوالێخۆش بوو(مامۆستا مەلا عبدالكریمی مدرس) ل ١٠.

(أللهُمَ ثَبِت قلوبنا عَلى الإيمان ، نَرجُوا عَفْوَكَ وَالغُفران ، وَحَمانا مِن الكُفرِ وَالنِّفـاقِ وَالـضلالِ والخُـسْران ، بحرمـة القـرآن) ، خوايـه سـه‌لبی ئیمانمـان نه‌كـه‌ی ، دڵ و ده‌روونمـان ڕه‌وشـه‌ن بكـه‌ره‌وه بـۆ خـاتری قورئـان خوايـه تاعه‌ت و عيباده‌تمان لێ قه‌بوڵ بكه‌ی ، خوايه لـه بـه‌ڵاو موسـيبه‌تی دونيـاو قيامه‌ت بمانپارێزی. ئامين).

نـبهني الله وإيـاكم مـن نَومـة الغـافلين وَحَـشرني وَإيـاكُم تحـت ليـواء سيدالمُرسلين.

# ئامۆژگاری چلەهەم

## باسی باوەڕ بەفریشتەکانی خودا ئەکات

الحمدُ للهِ ثُمَ الحَمْدُ للهِ مَا تَـوفيقِي وَلا إعْتـصامية إلاّ بـاللهِ عَليـهِ تَوَكَلـتُ وَ إليهِ أنيب الحَمْدُ للهِ المتفرد بالخَلق وَالإبداع جاعلَ الملائكة أولي أجنَحة مثنى وَثلاث وَرُباع أحمَدَهُ وَأشهدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَـهُ وَأن سيّدنا مُحَمّداً عَبدَهُ وَرَسولَهُ الهادي إلى صِراطِ المُسْتَقيم والـصَلاةُ والسَّلامُ عَلَيـهِ وعَلى آلهِ وَأصْحابه وَمَن تَبعَهُم إلى يَوْمَ الدّين ، أوْصيكُمْ أيها النّـاس وَنَفسي أولاً بتقْوا اللهِ وَطاعتهِ فإنّ الله مَعَ الذينَ إتّقوا وَالذينَ هُم مُحْسِنون أيها الأخوة المؤمنين يقول سُبْحانَهُ وَتعالى في القرآن الكريم قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٨٥

هذه الآية الكريمة ترشِدُنا إلى أن مِن أركان الإيمان بالملائكة الكِرام وَقَد خَلَقَهُم الله اجْساماً لَطيفة نورانية ، قَد يَظهرونَ بِصورٍ مختَلِفةٍ مُحترَمةٍ وَهُم عَن الذنوب مَعْصُومُونَ ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ سوورەتی التحريم: ٦ وَمِنهُم المُقرَبون والكِرام الكاتِبونَ وَحَمَلَة العَرش ، والحافظون وَمِنهُم المأمورون لِسؤالِ القَبرِ وَمِنهُم السائِقُ وَالشَهيدُ في يوم النشور ، وَمِنهُم خَزَنة النّارِ وَخَزَنة الجَنّة دارُ الأبرارِ ، فآمنوا بِهم وَبِما جاءَ به الرسول الأمين لَعَلَكُم تُفلَحون) أما بعد فيا عِبادَ الله أوصيكُك بتقوا الله وَطاعَتهِ)، واتە : لەدوای هەندێ ئەی بەندەکانی خودا وەسیەتتان لێ

دەکەم بە تەقوای خـواو پـەیڕەو کردنـی خـوای گـەورە (وَكَثـرة مَخافَتـه فِي جَميعِ أوقاتِكُم) واتە زۆر لە خوای گەورە بترسێن لەهەموو کـات و سـاتێکدا جا هەروەها برا موسڵمانەکان ئیمان و باوەڕ بـە فریـشتەکان (روکنێکـە لـە ئەرکانەکانی ئیمان) جا بێگومان ئیمـان بـە فریـشتە ئەوەیـە بـاوەڕت ببـێ ئەمانە جۆرە گیان لەبەرێکن خوای گەورە دروستی کـردوون وە هـەروەها لەشیان ناسك و نورانیە وەکـو ئـاوو هـەواو شـوعلەی چـراو تیـشکی گلـۆپ چوونکە خوای تەبارەك و تەعالاَ لـە نـوور و ڕوونـاکی دروسـتی کردوونـەو هەروەك ئادەمی لەگڵ و خـۆڵ درووسـت کـردووە وە پـەری لـە ئـاگر وەك پێغەمبەر (ﷺ)ئەفەرموێت : (خُلِقَت المَلائِكةُ مِن نورٍ وَخُلِقَ الجـانُ مِـن نـارٍ وَخُلِقَ آدَمُ مِما وَصَفَ لَكُم) رواه مسلم، واتـە : فریـشتەی خـوا لـە ڕوونـاکی درووست کراون و جنۆکە لە بڵێسەی ئاگر درووست کراون و ئادەم لـە قـوڕ درووست کراوە هەروەکو لـە قورئانـدا وەسـفیان کـراوە وە باسـیان کـراوە ئـەوجا پێویـستە بـزانین (مەلائیکـە) نـە نێـرن نـە مـێن هـەروەها خـەوو خواردنیان نییە و ئەتوانن خۆیان بهێننـە سـەر هـەموو وێنەیـەکی جـوان و هەریەکێ لەمانە خـوای گـەورە بەشـێوەیەکی تایبـەتی دروسـتی کـردووە هەندێکیان دوو باڵ و هەندێ سێ باڵ و هەندێکی تریان چوار باڵی هەیە[1] ، ئـەوجا پێویـستە بـزانین ئـەو فریـشتانە زۆر بـە توانـان چـونکە بێگومـان کاروبـاری بوونـەوەر هەڵئەسـوڕێنن لـەئاسمان و زەمینـدا نیـشتەجێن و لەهەموو شوێنێکدا جێیان ئەبێتەوە ، وە هەردەم لە خـودا پەرستی دان و

---

(1) ئەمەش (نەصی) ئایەتەکەیە کە ئەفەرموێت ﴿ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجْنِحَةٖ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ﴾ سوورەتی فاطر: ١

لەفەرمانی خودا دەرناچن چوونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴾ سوورەتی النازعات: ٥ ، واتە : سوێند بەو فریشتانەی کە کاروبـاری بوونــەوەر بــەڕێوە ئەبــەن[1] ، هــەروەها لــە ئایــەتێکی تــردا ئەفـــەرموێت ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ ســـوورەتی التحریم: ٦ فریشتەکان سەرپێچی و لاملی لەفەرمانی خودا ناکـەن وە هــەر فەرمانێکی پێیان بکرێ جێ بەجێی ئەکەن .

## ( ئاگادارییەکی گرنگ )

جا هروەها بێگومان دەبێ خاوەنی ئیمان باوەڕی وابێ کـە فریـشتەکان واسیتەن لە بەینی خوداو عەبد دا چوونکە هەریەکـە کـارو فـەرمانێکی پـێ سپێردراوە لەلایەن خواوە ، هەروەها دەبـێ ئیمـان و بـاوەڕت وەهـابێ کـە پەرتوکــە ئاسمانیــەکان لەلایــەن خــواوە بــەهۆی مەلائیکەتانــەوە بــۆ پێغەمبــەران هــاتوون چــوونکە بێگومــان مەلائیکــە واتــە فریــشتەکان (ئەجسامێکی) لەتیف و نەرم و نازك و نورانین نـە نێـرن نـە مـێن تـا ڕۆژی قیامەت دەمێنن هەروەها موحتاج بە خواردن و خواوردنەوە نین ، هەروەها ئەو فریشتانە گەلێ زۆرن چـوونکە (عـەدەد) و ژمـارەی مەلائیکـە ئەوەنـدە زۆرە لە (حیساب) نایەن وەك خوای گەورە لە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ وَمَا

---

(١) یا سوێند بەو فریشتانەی کە (ڕووحی) واتە گیانی خەڵکی دەکێشن و یان بەو ئەستێرانەی کە لە قوڵایی ئاسماندا دەدرەوشێنەوەو دەسوڕێنەوە ، بڕوانە تەفسیری ڕەوشەن، لاپەڕە /٥٨٢.

يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ﴾سـوورەتی المـدثر: ٣١ ، واتـە جگـە لـە خـوا خـۆی کەسی تر ژمارەی لەشکرو سوپای پـەروەردگار نـازانێ واتـە هـەر ئـەزانێ ژمارەیـان ، بـەڵکو بـە ملیـار مەلائیکـەی هەیـە هـەروەکو حـەزرەت (ﷺ) لەشەو ڕەوەکەیدا لەوەسفی (بەیتولمەعمور) دا فەرمووی (فـإذا هـوَ يَدخُلُـه في كُل يَومٍ سَبعونَ ألف مَلَكٍ لا يَعودون إليهِ آخرَ ما عَلَيهم) [1] رواه الشيخان، واتە : هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە نێـوی جـارێکی تـر ئـەوان ناگەڕێنەوە بۆی جا هەروەها بێگومان ، (مەلائیکە) لـە ئاسمـان و لەئـەرزو (لە بەڕو لەبەحردا) هەریەکە کارێکیان هەیـە یـەکێ لەوانـە (مـەئموری ڕۆح کێشانە وەکو حەزرەتی ئیزرائیل ، یەکێ لەوانە مـەئموری نـەفخی سـوورە وەکو (حەزرەتی ئیسرافیل) یەکێ تر لەمانە مـەئموری بـاو بـاران و هـەواو عاصفە (حەزرەتی میکائیلە) و یەکی تـر لەوانـە مـەئموری وەحـی و نیگـاو (بەریدە) بۆ سەر دڵی پێغەمبەران سەلاْت و سەلامی خوایان لێبێت ئـەویش کە (حەزرەتی جوبرەئیلە)، (علیـه السـلام) هەنـدێکیان مـەئموری عەرشـی خوایـان هـەڵگرتووە هەنـدێك خەزنـەداری بەهەشـتن و لەوانـە (رضـوان) گەورەو سەرۆکیتیان بەعزێك لە جەهەنەم مەئمورن (مالیـك) سـەرکردەیانە هەروەها بێگومان (مونکەرو نەکیر) مەئموری سوئالی قـەبرن هەنـدێکی تـر کردەوەی عەمـەلی (ئـادەمیزاد) ئەنووسـن (خولاْصـەی ووتـە) فریـشتەکان هەریەکە لە کـارو فـەرمانێك و هەریەکەمـەقامێکیان هەیـە جـا هـەر کەسـێ ئیمان و باوەڕی بە (مەلائیکەی) خوا نەبێ ئەوا بەندەیەکـە لـە بەنـدەکانی (ئەسـڵی) دینـی ناتـەواوە (ناقیـسە) چـوونکە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە

---

(1) بڕوانە/ کتێبی (فەتح و الباری شرح صحیح البخاری) ، ج٦ لاپەڕە ٣٤٨ ، بڕوانە(صحیح مسلم بشرح نووی ج١ ، لاپەڕە ١٤٦.

حەدیسەکەی پێشودا فەرمووی یەکێ لە (ئەرکانی ئیمان) واتە باوەڕی ئیمان بەمەلائیکەتانە) هەروەها پێویستە بزانین کە ئەم فریشتانە ڕەحمەتن بۆ ئیماندارو موسڵمانان .

**( چەند سوودو فائیدەیەك )**

ئەوە بزانە بێگومان سێ فریشتە گەورەی هەرموو فریشتەکانن[1] چوونکە کاروباری ژیانیان لەدەستە ، یەکەم – جوبرەئیل واتە فریشتەی (وەحی) هێنانە بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە دڵی خەڵکی پێ زیندوو ئەبێتەوە ، هەروەکولە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد ، دووەم حەزرەتی (میکائیل)ە واتە فریشتەی ئاوو بارانە کە ئەبێتە هۆی زیندوو بوونی زەمین و گیاو گشت گیان لەبەرێك سێ هەم– حەزرەتی (اسرافیل) واتە فریشتەی (نفخ الصور) ە کە هەموو کەسێکی لەدوای مردن پێ زیندوو ئەبێتەوە جا بڕوانەئەم فەرموودەیەش کە (عبدالله) ی کوڕی عەباس (خوا لێیان ڕازی بێت) ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرموێت : (أنّ اليَهُودَ سَألوا النبي (صلى الله عليه وسلم) مَن صاحِبُك ؟ قالَ جبريل قالوا ذاكَ يَنزِلُ بالحَرب والعذابِ عَدونا لَو قُلتَ ميكائل الذّي يَنزلُ بالرّحْمة والنّبات والقطرِ لَكانَ خَيراً فنَزَلت ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ سوورەتی البقرة: ٩٧ رواه احمد والترمذي ، واتە جووەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد (ﷺ) ئایە کێ (وەحی) بۆتۆ دێنێ

---

(١) هەندێ لە زانایانی تر ئەڵێن چوارن چونکە (ملك الموت) یشە واتە (عزرائیل)یش لە گەورەکانە، لە دواییدا باسی ئەکەین).

؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی (جوبرائیل) ، گووتیان (جوبرائیل) دووژمنی ئێمەیە چوونکە جەنگ و ئازاردان دێنێتە خوارەوە ، ئەگەر گوتبات (میکائیل) بۆم دێنێ ئەوا باش بوو چوونکەئەمەیانە (ڕەحمەت) و باران دێنێتە خوارەوە ، ئینجا ئایەتی ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ ﴾هاتە خوارەوە ، واتە : هەرکەسێك دووژمنی جوبرائیل بێ بێگومان ئەو قورئانی بۆتۆ هێناوە بە ئیزنی خودا[1] هەروەها زانایان ئەفەرموون ئەگونجێ مەلائیکە لەسەر وێنەی خۆگۆڕێ دا بدیترێت هەروەکو (صەحابە) حەزرەتی (جوبرائیلیان) لەسەر شێوەی پیاوێکی بەرگ سپی و (مووڕەشدا) دیت بەلأم لەسەر وێنەی ڕاستەقینەی خۆیاندا جگە لە پێغەمبەران کەسی تر نایانبینێ ، پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) دووجار جبرائیلی لە وێنەی ڕاستەقینەدا دیتوە[2] .

**( ئاگاداری )**

هەروەها ئەبێ ئەوەش بزانین کە مەلائیکە لەهەموو شەووڕۆژێکدا دێنە خوارێ بۆسەر ئەرز بۆ نووسینی (عەمەڵ) و کردەوەی ئادەمیزاد ، هەروەها دوو فریشتەی تر پێیان ئەوترێ (الکرام الکاتبین) چاکەو خراپەی

---

(1) بروانە پەرتوکی (ڕوونکردنەوەی العقيدة الطحاوية – للإمام الطحاوي) لە نووسینی مامۆستا مەلا عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی) ، لاپەڕە ٧٠.

(2) پێغەمبەر (ﷺ) زۆر حەزی دەکرد جوبرەئیل لە شێوەی فریشتەکەدا ببینێ ، بۆیە ئەویش دووجار لەسەر شێوەی فریشتەییەکەی خۆی نیشاندا ، جارێ لەسەر زەوی جارێکیش لە ئاسمان)، بروانە (شرح مسلم) ل ٩٦ بەرگی ٢.

ئادەمیزاد ئەنووسن هەروەك خوای گەورە لەم بارەیەوە ئەفەرموێت : ﴿ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ﴾ سوورەتی ق: ١٧واتە : یەکیان لە ڕاستدا دانیشتووە وە یەکیان لە چەپە ، هەروەها (مَلَك الموت) فریشتەی مردن واتە ڕۆح کێشان) ، کە گیانی خەڵك ئەکێشێ و پێی ئەڵێن (عزرائیل) خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ﴾ سوورەتی السجدة: ١١، واتە بڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) فریشتەی مردن گیانی ئێوە وەردەگرێ و هەروەها چەند فریشتەی تر هەنەو (تەعقیبی) ئادەمیزاد ئەکەن بەشەوو بەڕۆژ وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : (يَتَعاقبونَ فيكُمْ ملائكة بالليلِ وملائكة بالنّهار) رواه أصحاب السنن ، ئەوجا هەتا بۆتان ئەکرێ لە شەوو ڕۆژدا کارو عەمەڵ و کردەوەی باش بکەن و عەمەلێ ئەنجام بدەن کە مایەی سەربەرزی و ڕوو سووری بێ لە دونیاو قیامەتدا هەتا فریشتەکان بە نووسینی خۆشحاڵ بن چوونکە ئەوان بە کردەوەی باشی بەنی ئادەم خۆشحاڵ ئەبن ، هەروەها بە کردەوەی خراپی بەنی ئادەم پێ سەخڵەت و نارەحەت ئەبن ، چوونکە کاروباری زەوییان پێ سپێردراوە ، بەتایبەتی (موراقبن) بۆ کردەوەی ئادەمیزاد لەنووسینی کارو کردەوەی باش و خراپ چوونکە هەریەکەیان کارێکی بۆ دیاریکراوە وە (موەکیلی) شتێکە .

## ( پاشكۆ )

هەزار سلاّ و لە مامۆستا (عبدالرحيم) مەولەوی بێ و كە ئەفەرموێت :

لە ئاسمانا نییە جێیەك بێ    ئیللا مەلەكێ حازرەلەوێ
بەعزێ بەدەوام قائیم و خاشیع    بەعزێکی چیان هەمیشە راکع
بەعزێ دائیمەن وا لەسوجدەدا    بەعزێ گێجاو بەحری شەهوەدا
غەفڵەتیان نییە ساتێك یا دەمێ    خەبەریان نییە لە هیچ عالەمێ
چوونکە بۆ تەبلیغ خەیلێ لایەقن    واسیتەی مابەین خالق و خەلقن
بەعزێ مەبعوثن سەر نەوعی خۆیان    بەعزێ سەر بەعزێ لە ئادەمیيان
هەرچە لە عەدەم هاتۆی و بێتە دەر    فریشتەیەکی ئایینەلەسەر
بەوەفقی فەرمان پادشای خەبیر    تەصەروفاتی تێدەکاو تەدبیر
ئایا سەماوات ئایا هەساران    بەحرو تەم و هەور باو بەورو باران
تك تکی باران کلۆ کلۆی بەور    تەڵ تەڵ گیاو مەگەلاّی دار بە وطە
زەمینی کەژو دەشت تەمام جیمادات    حەیوانات یەکسە هەموو نەباتات
هەرچی نموتو تەفصیلی دەوێ    نییە فریشتەی موەکل ئەوێ(١)

## ( باسێك لەبارەی جنۆکە – الجن- واتە پەری )

پێویستە بزانین هەروەکومەلائیکە هەیە (جن)یش هەیە (٢) ئەمانە لەلای ئەهلی دین و ئایین لە (ماددەی) ئاگرین درووست کراون چوونکە (الجن)

---

(1) بروانە پەرتوکی عەقیدەی مرضية ، لەدانانی سەید عبدالرحيم مەولەوی ، شەرح و لێکدانەوەی (مەلا عبدالكريمی مدرس) لاپەرە ٢٩٢.

(2) جا هەروەها بزانن لە (قاموسی فەرهەنگی کوردیا) ئەڵێ (جن) بە کوردی (پەری) یە .

واته جنۆکەچینە خەڵکێکی لەچاودا پۆشراون خـوای گـەورە لـە بارەیانـەوە ئەفـەرموێت : ﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴾ سـوورەتی الـرحمن: ١٥واتە خوای گـەورە جـان ی بـاوکی جنۆکـەی لەبڵێسـەی ئـاگر درووسـت کـردووە وە لـە ئایـەتێکی تـردا ئەفـەرموێت ﴿ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴾ سوورەتی الحجر: ٢٧، واتە:لەپێش درووستکردنی ئادەمیشەوە بـاوك وسـەرۆکی جنیـشم (ئیبلـیس) لـەئاگرێك بلێسەدارو تیـژو بـەهاڵاو درووست کردووە) جا هەروەها بێگومان جنۆکە نێرو مـێ و زاوزێیـان هەیـە (کافرو موسڵمانیان) هەیە ، چوونکە لە (تەفسیری) سورەتی (الجـن) ئـەڵێ (إبلیس) واتە شەیتان لە جنۆکە (کافرەکانـە) وەهـەروەها نەتـەوەی هەیـە ئەوجا خوای گەورە لە سورەتی الکهف دا لە ئایەتی پـەنجا دا بەسـەرهاتی باوکـە ئـادەم و (ئیبلیـسمان) بـۆ ئەگێڕێتـەوە ئەفـەرموێت : ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴾ سـوورەتی الکهـف: ٥٠ ، واتـە : ئـەو کاتـەی بـە فریـشتەکانمان گـووت سوجدەو کڕنۆش بۆ ئادەم ببەن گشتیان سـوجدەیان بـرد بـەڵام (إبلـیس) واتە شەیتانی گەورە لە نەتەوەی جنۆکە بـوو وەلـەفرەمانی خـوا دەرچـوو سووجدەی نەبرد چۆن ئێـوە (إبلـیس) و نەتەوەکـەی ئەکـەن بـە دۆسـتی خۆتان جگە لەخوا خۆ ئەوان دووژمنی ئێوەن.

**(تێبینی)**

جا هەروەها خوێنەرانی ئازیزم لەگەڵ شوێندا لە قورئاندا خودا باسی (جنی) کردووە شەیتان کە دووژمنی ئادەمیزادە یەکێکە لەوان چوونکە بێگومان هەر جنۆکەیەك زۆر شەڕو ناباربێ ئەمە بە (شەیتان) ناو ئەبرێ ئەمانە لە زمانی کوردیدا ناویان (دێوە) ئێمە لە دونیادا ئەمانە بەچاو نابینین بەلام تەنها پێغەمبەران ئەیانبینن بەلام لەڕۆژی قیامەتا ئێمە ئەوان ئەبینین و بەپێچەوانەی ئەمانە بەبێ ئەمری خوداو بەبێ (تەقدیری) ئەو ناتوانن زیانبەکەس بگەیەنن ، هەروەها بۆ پارێزی لەشەڕی ئەوانە ئەبێ ئینسان پەنا بەرێتە بەر خواو لەکاتی (وەسوەسەو) خەیالی خراپا بڵێ (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ)واتە خۆم دەپارێزم لە (شەیتانی ڕەجم کراوو نەفرەت لێکراو) هەروەکو لە دوعاو (ئەزکارەکانی) پێشوودا ڕوونمان کردەوە بچۆ بیخوێنەوە ، یان ئەگەر چووی بۆ دەست بە ئاو گەیاندن (قضای حاجەت) پێویستەئەم دوعایە بخوێنی (اللّهُم إنّي أعُوذُ بِكَ مِن الخُبْثِ والخَبَائث)رواه الشیخان ، واتە خوایەگیان خۆم دەپارێزم بەتۆ لە شەیتانی (نێرو مێ) وە هەروەها لەکاتی ئیشی باش و خێرو چاکەدا یان لەکاتی خواردنی (طَعاما) بڵێ (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) بکاو هەروەها لەکاتی دەست کردن بەهەر ئیشێك کەپیرۆزییەکی تێدابێ بۆ ئەوەی کە ئەوشتە بە بەرەکەت بێ و دوور بێ لەکاری شەیتانیەوە ئەوە با ناوی پیرۆزی خوای گەورە ببا).

**( سەرنجێکی گرنگ )**

جا هەروەها بزانە جنۆکە توانایان هەیە خۆیان بگۆڕنە سەر هەموووێنەیەك جا ئەگونجێ لەوێنەی خۆگۆڕیدا ببینرێت بەلاَم لە وێنەی ڕاستەقینەدا جگە لە پێغەمبەران هیچکەسێك ناتوانێ بیان بینێ چوونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴾سوورەتی الأعراف:٢٧ واتە: ووشیار بن لە (شەیاتینەکان) چوونکە هەمیشە خۆیان و کۆمەڵەو دەستەو بەستەیان ئێوە دەبینن بەلاَم ئێوە ئەوان نابینن ، هەندێلە زاناکان ئەڵێن ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە کە (جنیەکان) هەرگیز نابینرێن ، هەندێکیش ئەڵێن ئەگەرچی ئاواش بێ بەلاَم هەر ڕەواو درووستە ببینرێن [1].

**( پاشکۆ )**

خوێنەرانی ئازیزم ئەگەرچی لەپاش ئەوە کە ئایەتی قورئان باسی شتێکی کرد پێویستە موسڵمانان باوەڕ بکاو تەسلیمی ببێ بەلاَم هەر بەبیرو هۆش ئەبێ ئیسنان بیرکردنەوەی ببێ نابێ هەر شتی ماددەی لەبەر چاو دیار نەبێ (ئینکاری) بکا ئێمە بەومەرجەی (هەوا) بەچاو نابینین لەگەڵ ئەوەشدا داری گەورە لەبن هەڵئەکێشێ بەڕەگ و ڕیشەوە/ لە بنەشاوە دەری ئەهێنێ و/ هەڵی ئەتەکێنێ ، هەروەها هێزی کارەبا/ لەپێش چاوا نییە/ کەچی ئەم هەموو کارەساتە (عەجایبانە) ئەکا لە

---

(1) بڕوانەتەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان) لە نووسینی خوالێخۆش بوو ، مامۆستا (ئەحمەد کاکە مەحمود)، لاپەڕە ٢٦٤.

دونیادا بە ئـانێ هـەزاران گیـان لەبـەر ئـەگرێ و ئەیـسوتێنێ هـەروەها بۆ نموونە گیان و (ڕۆحی) خۆمان بەچاو نابینین لەگەڵ ئەوەشا ئەزانین ئێمـە خاوەن (ڕۆحین) وە بـەشمان لـەگیان هەیـە چـاوی عـەقڵ لـە چـاوی سـەر بەهێزترە خوای تەبارەك و تەعالاَ قسە لەگـەڵ خـاوەن عـەقل و ژیـرو بـیرو باوەڕ ئەکا[1] هەزار رەحمەت لە مامۆستا مەولەوی بێت کە ئەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| ئیبلیس چۆن لەناو مەلەکاندا بوو | لە صوحبەتیاندا خەیلێکی پێ چوو |
| بەتەغلیب ناوی بە مەلەك بریا | ئیستثنای لە جەمع ساجیدان کریا |
| وەرنە خۆ جنە ئەو الخناس ە | شاهیدیچی قەول ئیبن و عەباسە |
| فەرمووگیە جینن ئەو زومرەیانە | وەلەدیان دەوێ و ئیبلیس لەوانە |
| خصوصەن ظاهیر کەلامی باری | (کان من الجن) چاك دەدا یاری[2] |

خوایـە گیـان ئیمانمـان بەنـسیب بکـەیت خوایەتاعـەت و عیبـادەت و چاکەمان قەبوڵ بکەی خوایە لەشەڕی نەفس و شـەڕی شـەیتان و فیتنـەی ئـاخر زەمـان مـەحفوزمان بکـەی ، خوایـە ولأتەکـەمان پـڕ خێـرو پیـت و بەرەکەت بکەی خوایە ئێمەو موسـڵمانان لەبەلأوموسـیبەتی دونیاوقیامـەت بپارێزی ، ئامین / نبهني اللهُ وإياكُم من نومة الغافلين وَحَشَرني وَإياكُم تحت لواء سيد المرسلين.

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (شەریعەتی ئیسلام) لەگەڵ دەستکاری ج١ لاپەرە ١٠.

(2) بڕوانە پەرتوکی (عەقیدەی مەرضیة) لاپەڕە ٢٨٨.

## ئامۆژگار چل و یەكەم

## باسی باوەڕ بەكتێبەكانی خوای گەورە ئەكات

الحَمْدُ لله ثُمَ الحَمْدُ لله ما تَـوفيقي وَلا إعتـصامية إلاّ بـالله عليـه تَوَكَلتُ وَ إليه أنيب الحَمدُ للهِ الذّي أنزَلَ الفُرقانَ عَلى أكرم الخَلقِ وَأفضَلِ الرُسُـل كَمـا أنزَلَ التَّـوراة وَالإنجيـل وَالزبّـور نَـشهَدُ أن لا إلـه إلا الله وَهُـوَ الـرحيم الغَفـور وَنَـشهَدُ أنّ سَـيّدَنا مُحَمَّـداً عَبْـدهُ وَرَسُـولَهُ الـذّي هُـوَ شـافعٌ للخلايـق يـومَ الحَشرِوالنشور والصلاة وَالسَلام عَلى قائدنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ الـذّينَ جاهَدوا في سبيل الله ففازوا بِفَوزٍ وَفور خصوصاً عَلى خلفـاء رَسُـول الله ذوي القدر العَلي حَضرة أبي بَكر وَ عُمَرَ وَ عُثمانَ وَ عَلي ، وَعَلى الحَـسن وَالحـسين وَ حَمزة والعباس وَعلـى بـاقي الـصحابة والتـابعين رضـوان الله تعـالى عَلَـيهُم أجمَعين) وبَعد أوصيكم أيّها المُؤمنُـون بِتَقـوا الله وَطاعَتـهِ والإيمـان بالكُتـبِ المُنزَلَـة عَلـى الأنبيّـاء كَمـا أمَنـتُم بـالله وَملائكتـه) واتـه : لـەدوایی هەنـدێ ئیمانـداره بـەڕێزەكان ئامۆژگاریتـان ئەكـەم بەتـەقوای خـوداو جـێ بـەجێ كردنـی فەرمانـەكانی خـودا ، وه هـەروەها ئیمـان و باوەڕمـان هـەبێ بـەو پەڕتوكانەی كە خودا هەناردویەتی بۆ سەر پێغەمبەران (سەلات و سـەلامی خوایان لەسەر بێت) هەروەكو لەپێشدا ئیمان وباوەڕمان هێنـابوو بـەخوای گەورەو فریشتەكانی (إخوانی) المؤمنین لله تبارَكَ وَتعـالی كُتـبٌ أنزَلَهـا عَلـى أنبيائـه (بواسـطة جبريـل عليـه الـسلام) وَبَـينَ فيهـا أمـرَهُ وَ نَهيـهُ وَوَعـدَهُ وَوَعيدَهُ...) واته برایـانی خـاوەن بـاوەڕان : ئیمـان و بـاوەڕ بـەو كتێبانـە بریتیە لەوەی كـە موسـڵمان بـاوەڕی هـەبێ بـەوەی كـە خـوای تـەبارەك و تەعالا بەهۆی حەزرەتی جوبرائیلەوه(سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ) هـەموو

مافێکی بەیان کردووە لەبارەی (حەلاڵ) و (حەرام) و (حوکم) و (ئەحکام) و چاکەو خراپەو تەربیەو تەعلیم و فێربوونی ڕوونکردۆتەوە هەروەها دەستوورو یاسایەکی بۆ پێغەمبەرەکان ناردووە بەگوێرەی (زەرف) و(زەمان) و (عەقل) و (عیلم) و (مەسلەحەتی) ئادەمیزادی ئەو سەردەم و چەرخە کەئەو پێغەمبەری تێدا ژیاوە). جا هەروەها بێگومان ئەو پەرتووك و کتێبانەی کە دەبێ ئیمانمان پێیان هەبێ (١٠٤) سەدو چوار (کتێبن) کە (تەورات و ئینجیل و زەبوور و صحف و قورئانە)و

(**تێبینی**)

جائەو کتێبانەی ناویان هاتووە لە قورئانا ئەمانەن :

یەکەم) تەوراتە[1] بۆ حەزرەتی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) جا قورئان بەم شێوەیە باسی ئەکات و ئەفەرموێت ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞ ﴾سوورەتی المائدة: ٤، واتە: ئێمە تەوراتمان نارده خوارێ بێ (شك) بۆ هەموو خێرو چاکەیەك ڕێنومایی و ڕووناکی تێدایە ، جا هەروەها ئەم تەوراتەش وەك حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت بریتی بووە لە چەند پەندو حیکمەت و ئامۆژگاریەك بۆ گەلەکەی بەم شێوەی کە لە پێشەوە باسمان کرد[2] جا بێگومان ئەو فەرموودەی کە

---

(1) مامۆستا مەلا (محمدی کۆیی) لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێ (تەورات) کەلیمەیەکی (عبرانی یە) بە مانا (شەریعەت) وە هەروەها (ئینجیلیش) کەلیمەیەکی یۆنانیە بەمانا بەشارەت یان تەعلیمی نوێیە) بڕوانە تەفسیری کوردی لە نووسینی مامۆستای خوالێخۆش بوو مەلا (محمدی کۆیی)، لاپەڕە ٢٥٠، بەرگی یەکەم).

(2) بڕوانە ئامۆژگاری (بیست و چوار) لە باسی ئامۆژگاری قورئان .

ئەبو زەری غەفاری (ڕەزای خوای لێبێت) ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە (کیفایەتە) بۆ ئەم باسە ، جا ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پرسیارم لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد گووتم ئەی خۆشەویستی خوا ئەو کتێبانە کە لەلایەن خواوە بۆ هەموو پێغەمبەرەکان هاتۆتە خوارەوە چەندن ، حەزرەت (ﷺ) لەوەڵامدا فەرمووی ئەو کتێبانە سەدو چوارن بەڵام سەدیان بەناوی (صحف)ە ئینجا دە سەحیفە لەوانە بۆ حەزرەتی (آدم)پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) هاتۆتە خوارەوە، پەنجا بۆ حەزرەتی (شیت) وە (سی)بۆ حەزرەتی (ئیدریس) وە (دە) بۆ حەزرەتی (ابراهیم) (سەلامی خوای لێبێت)هاتۆتە خوارەوە لەپاش ئەو سەد (صەحیفەیە) خوای گەورە چوار (کتێبی) گەورەی ناردۆتە خوارەوە کە یەکیان (تەوراتە) بۆ حەزرەتی موسا (علیە السلام) کە لەپێشەوە باسمان کرد ، دووەم (زەبوورە) بۆ حەزرەتی داوود (علیە السلام) سێهەمیان (ئینجیلە) بۆ حەزرەتی (عیسا)، چوارەمیشیان قورئانە نازڵ بوەتە سەر قەڵبی حەزرەتی (محمد المصطفی)یەی نازدار ، بەهەزاران (صەڵات و سەلام و دروودی خوای گەورەی لەسەر بێت)، ئەو سەدو چوار کتێبە بەزاهیر جیان بەڵام لە حەقیقەتدا هەموویان هەر کەلامی خوان ئەوەندەهەیە کە قورئان لەهەمویان گەورەترە چوونکە هەروەکو پێغەمبەری ئێمە ئاخری هەموو پێغەمبەرەکانە وە لەهەمووان گەورەترە قورئانیش ئاخری هەمووو (کتێبێکی) ئاسمانیە وە لەهەمووان گەورەترە چوونکە هەموویان بە قورئان (نەسخ) بوونەوەو کاریان پێ ناکرێ ، بەڵام قورئان تا ڕۆژی قیامەت فەرمان ڕەوایە بە قەراری (قەتعی) ئایەتێك یا

کەلیمەیەك یا جوملەیەك یا لەفزێك لە قورئاندا زیادو کەم نەکراوەتەوە هەروەکو خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەمان بۆ ئەکاو ئەفەرموێت :

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ سـوورەتی الحجـر: ٩ ، واتـه : بەڕاستی ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوارێ هەر خۆشمان ئاگاداری و پارێزەرین و لە دوژمنان ئەیپارێزین و ناهێڵین زێدەو کەم تێدا بکەن و)، بۆیە ئەوە چەندین سەدە هات و چوو لەگەڵ ئەو هەموو دژو نەیارانە دا کەسێك نەیتوانیوە تەنها پیتێك بگۆڕێ و یا لێی لابدات .

## (ئیمان و باوەڕ بەو کتێبانە پێویست بە چوار شت ئەکات)

یەکەم) ئیمان و باوەڕ بەوەی کە ئەو کتێبانە بەوەحی واتە نیگاو ناردن خودای تەبارەك و تەعالایە بۆلای پێغەمبەران (صەلأت و سەلامی خوایان لەسەربێ) وە ئەوانەی کە وەریان گرتووە لەپێغەمبەران و لە ئادەمیزادی ڕاستەقینە فێربوونە نەك لە ئینسانی (شەحوەزەو) ساحیران و جادوگەرو فێڵبـاز لەمانـە وەرنـەگیراوە وەرنـاگیرێن هـەرگیزاو هـەرگیز کـە شـەیاتین (القاء) یان کردبێ بۆلای ئەو پێغەمبەرانە).

دووەم) ئیمان و باوەڕ بەوەی کە ئەو (کتێبانە) بە واسیطەی فریشتەی گەورەو حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) بەخاوێنی هاتوون لەلای خوداو وە گەیشتوون بە پێغەمبەرەکان بەبێ ئەوەی کە عەلاقەی (جننی) یا ئادەمیزاد یا کەسێکی تریان تێدابێ وەهەروەها خوداش پاراستوونی لەهەموو دەخیلی و ناشایستەیی و لەگەڵ کەلامی خوداوەند نەگونجێ .

سێ هەم) ئیمان و باوەڕ بەوەی کە ئەو قورئانە هاتۆتە خوارێ بلای پێغەمبەر (ﷺ) لەو ڕۆژەوە هاتۆتە خوار تا ئەمڕۆ هیچ (عەیبو) زیانێکی تووش نەبووەو نابێ (إنشاء الله) .

چوارەم) ئیمان و باوەڕ بەوەی کە ئایەتی قورئان دوو بەشن (محكم) واتە ڕووناك دامەزراو ، وە هەروەها متشابه) واتە (دئیره) لەبەینی چەند مەعنادا بە(ئیحتیمالی) عەقل وە ئایەتی مەحکەمەکان ڕووناکن وە ئایەتە موتاشبیهەکان قیسمێ لە زانایانی سەڵەف واتە پێشینان حەوالەیان کردوون بۆ عیلمی خوداو هەروەها (مەعنایان) نەکردوون وە بەشی دوایی (تأویل) یان کردوون بە (تەئویلی) ڕووناکی (موناسب) بۆ وێنە ئەڵێن مەعنای ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ﴾سوورەتی الفتح: ١٠، واتە دەستی خوا لەبان دەستیانەوەیە ئەمە بەڵگەیە لەسەر پشتگیری خوا بۆیان وەك دەستیان بەدەست ئەوەوە دابێت[1] ئەوا ڕاو بۆچوونی (ابن كثیر) و هەندێ لە (موفەسیرانی) ترن ، بەلأم مامۆستای خوالێخۆش بوو بەم شێوەیە تەفسیری کردووە و ئەفەرموێت : (دەسەلأتی خودا زیاترە لە دەسەلأتی ئەوان [2] وەهەروەها لە تەفسیری نامییش دا بەم شێوەیە تەفسیری کردووە).

---

(1) بەلأم ئیمام (ئالوسی) لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێت (وَالسَّلَف يَرون الآية كما جاءت مَعَ تنزيه الله عَزَ وَجَل عَن الجوارح وَصِفَات الأجسام وكَذلك يَفعَلون في جَميع المُتَشابِهات وَيقولونَ إن معرفة حقيقة ذَلكَ فرع معرفة حقيقة الذات وأنى ذَلكَ و هيهات هيهات ؟) بڕوانە تەفسیری (روح المعاني) دانراوی (العلامة الألوسي البغدادي) ، لاپەڕە ٩٧

(2) بڕوانە پەڕتوکی (نوری ئیسلام) دانراوی خوالێخۆش بوو مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) لاپەڕە ٢١.

## (ئاگادارییەكی گرنگ)

جا هەروەها بێگومان لەهەر ماوەیەكدا كە خوای گەورە پێغەمبەرێكی ڕەوانە كردووە بێتە سەر میللەتێ یا نێرابێ و (كتێبی) تایبەتی بۆ نەهاتبێ هەر بە (كتێبی) پێغەمبەرە پێشووەكە ڕەفتاری كردووە بۆ وێنە پەڕتوكی (تەورات) هاتووە بۆ موساو هەموو پێغەمبەرانی (بەنی ئیسرائیل) ڕەفتاریان پێ كردووە تا كتێبی (ئینجیل) نازل بووە بۆ حەزرەتی عیسا (صەلات و سەلامی خوای گەورەی لێ بێ).

وە هەروەها قورئانی پیرۆز كە لەسەری چل سالّی تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) هاتۆتە خوار چوونكە ئەوەل (نازل) بوونی لە ١٧ ی مانگی رەمەزانی سالّی چل بووە لە تەمەنی وەهەروەها ئاخرەكەی لە چەند ڕۆژی پێش وەفاتی حەزرەتدا (ﷺ) نازل بووە ، واتە لەماوەی (بیست و سێ سالّدا) هەمووی هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) .

## (كورتە باسێك لە نووسینەوەی قورئان لە زەمانی پێغەمبەر (ﷺ))

جا هەروەها بۆ ئەم باسە گرنگە بڕوانە پەرتوكی (مصباح القلوب وَمُفرِج الكروب) [1] داو ئەلێ (وَكانَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قَد إتَخَذَ لَهُ كُتاباً يَكتِبونَ ما يَنزِلُ من القرآن أشهَرُهُم الخلفاء الأربعة (أبو بكر الصديق و عمر بن الخطاب و عثمان بن عفان و علي بن أبي طالب (رضي الله عَنهُم) وَكَذلك أبي بن كَعب وَزَيد بن ثابت ومعاوية بن أبي سُفيان وَثابت بن قيس

---

(١) بڕوانە پەرتوكی (مصباح اتلقلوب وَ مُفرِج الكروب) لە نووسینی (عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز الدزەیی) بەرگی یەكەم ، لاپەڕە ٣٦٩.

وَخالد بن وَليد(رضوان الله عَليهم) وَكانوا يَحفظون عَلى ما أتفَقَ لَهُم يومئـذ من جريد النخل والحجر الرقيق وعظام الأكتاف وَالاضلاع من الـشياه وَالإبـل وَجلود الغزلان وَغيرهم...الخ).

جـا هـەروەها بێگومـان ئـەوەی ڕاسـتی بێـت حـەزرەت (ﷺ)گـەلێ ئیهتیمامی ئەکرد بە نووسینەوەی ئەو ئایەتانە کە بـۆی ئەهاتـە خـوارەوە (چـوونکە ئـەوەی بکرێتـە بـەر لەوانەیـە لـەبیر بـچێتەوە بـەڵام ئـەوەی بنووسرێتەوە ئەمێنێتەوە و تۆمار ئەکرێ و بەزایع ناچێ[1] وە هەوەها هـەر کاتێك هەر ئەندازەیەك لە قورئان و (وەحی) کە نازل ئەبوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پاش وەرگرتنی و حاڵی بـوونی خـۆی لـە حـەزرەتی (جوبرەئیـل — علیه السلام) ئینجا بەسەر ئەصحابەکاندا ئەیخوێنـدەوە لەبـەریان ئـەکردو هـەروەها ئـەوانیش یەکسەر گـورج ئەیانوسـیەوە بـۆ حـەزرەت (ﷺ) وە ئەشیان نووسییەوە بۆ خۆیـان جـا نووسـینەکەی لەسـەر تەختـەی سـافی دارخورما و بەردی ساف و ئێسکی مامزو پێستی ووشترو گا و ڕەشە وڵاغ و ...هتد[2] واتە مەشهورو نـاودار لـەناو ئـەو نوسـراوانەدا ئـەم چـەند کەسـە بەڕێزانەن هەر چوار جێ نشینەکان واتە : حەزرەتی (ئەبوبەکری صـدیق و

(1) ئەوجا هەرچەندە لەوکاتەدا نووسەر کەم بوو لە وڵاتی (حیجاز و شاری مەککەو مەدینەدا) ئەوە زانرابوو دەوری ٤٢ چل و دوو کەس لە نووسەر لە موسڵمانەکان لە ئەصحابەو یارانی پێغەمبەر (ﷺ) حازر ئەبوون بۆ نووسینەوەی قورئانی پیرۆز.

(2) جا بێگومان ئەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەنوسرایەوە تەسلیم ئەکرا بە حەزرەت (ﷺ) لەلای خۆی ئەمایەوەو هەڵی ئەگرت و ئەویش بۆخۆیان ئەینوسیوە لەلای خۆیان ئەمایەوەو هەڵیان ئەگرت بۆ خۆیان.

عومـەری کـوڕی (خطـاب) و عوسمـانی کـوڕی عـەفان و عـەلی کـوڕی ئـەبو طالب) وە ئوبەیبی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابت و موعاو یەی کـوڕیٚ ئەبو سوفیان و سابتی کـوڕی قـەیس و هـەروەها خالیـدی کـوڕی وەلیـد و هەندێکی تر[1] (خوایان لیٚ ڕازی بێت).

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا هروەها بێگومـان لـەناو ئـەو کۆمەڵـە (قورئـەی) نـاوبراو بەتایبـەتی (زەیدی کوڕی سابت و موعاویەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان) نووسـەرو کـاتبی تایبەتی حەزرەت بوون (ﷺ) چ بۆ قورئان چ بۆ نوسینی نامەو ریساڵە بۆ هەموو پادشاو دەوڵەتێکی جیهـان، جـا هـەروەها لەمانەشـدا کـە ئەوانـەی قورئـانی پیرۆزیـان بـۆ خۆیـان ئەنووسـیەوە سـێ کەسـیان (موصـحەفی موباریکی خۆیان) پیشانی حەزرەت داوە وە لەخزمـەتی خوێندویانەتـەوە ئەمانەن (زەیدی کوڕی سابت وە ئوبەی کوڕی کـەعب وە عبـدالله ی کـوڕی مەسـعود بـوون) (خوایـان لیٚ ڕازی بێـت) ئـەو شـێوەی کـە ئـەوان نووسیویانەتەوە لەلای حەزرەت (ﷺ) مەقبول بووە ، هەزار رەحمەت لەو کەسە بیٚ کە فەرموویەتی :

**لەچەرخی بەرزی حەزرەتی ڕەهبەر زۆر کەس قورئانیان هەموو کردە بەر**

---

(1) وەکو ئەم بەڕێزانە (یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان و عامری کوڕی فەهیرە و زوبەیری کوڕی عەوام و عەمری کوڕی عاص و زەیدی کوڕی ئەرقەم و (محمد) کوری سەلمەو عبدالله ی کوڕی عبدالله و ئوبەی کوڕی سەلول و موعەیقبی کوڕی فاطم و شەرەحبیل و حەنزەلەی کوڕی رەبیع و ئەبانی کوڕی سەعید (خوایان لیٚ ڕازی بێت).

أبی بن كعب خاوەن لەهجەی خۆش    زيد بن ثابت صافی بيرو هۆش
سیٚ هەم ئەبو زەيد چوارەمين موعاذ    هەموو ئەنصارن بە قەدرو ئيعزاز
حەزرەتی عثمان شەخصی ذو النورين    حەزرەتی عەلی ابو الحسنين
عبدالله كوڕی عەمری كوری عاص    عوبادەی ئيبنو صامتی حەقناس
عبدالله ی كوری مەسعودی ئەكرەم    تەميمی داری شەخصی موحتەرەم
ئەمانە هەموو بۆ هەموو قورئان    حافظ بوون لەسەر يارمەتی يەزدان
گەلێكی تريش هەر لەبەريان بوو    بەلاّم ناتەواو بەعزێكی كەم بوو
ئەم حافيظانە قورئانيان هێنا    بە دڵێكی صاف بە وێنەی مينا
قورئانيان هێنا لەبۆ تابعين    بە تەواتری موجيب بۆ يەقين
هەروەها چين چين بە پايەو مايە    هەرواش ئەمێنیٚ هەتا هەتايە
نَحنُ نَزَلنا الذِكرَ وَإنا    لَهُ أي للذِكرِ لَحافِظُونا[1]

## ( ئاگادارييەكی گرنگ )

زۆر لە (ئەهلی سيرەو مێژوو نووسەكان) ئەفەرموون قورئـان لـەپاش وەفـاتی حـەزرەت دووجـار (جـەمع) واتـە كۆكراوەتـەوە جـاری يەكـەم لـە زەمانی خەلاّفەت و جێگـەداری (ئـەبو بـەكری سـەديقدا) (خـودا لێـی ڕازی بێت) كە بە ڕاوێژ لە گەڵ حەزرەتی (عمر و باقی ئەصحابەكانی) پێغەمبـەر (ﷺ) وەكو زەيدی كوڕی سابت كە (كاتبی) وەحی بـوو ئينجـا ئامـادەكرا بـۆ ئـەو مەبەسـتە پـيرۆزە كـرا بـۆ ئـەوەی هـەموو ئايـەتی قورئـان و

(1) بڕوانە پەرتوكی (نووری قورئان) دانراوی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا (عبدالكريمی مدرس) لاپەڕە ٩٨ ، لەگەڵ كورتكردنەوەی.

سورەتەكانی قورئان جارێكی تر نووسرایەوە لەلای حەزرەتی ئەبو بەكردا مایەوە وە لەپاش وەفاتی ئەو كەوتە لای حەزرەتی عومەر خەلیفەی دووەم هەتا زەمانی خەلافەتی حەزرەتی عوسمانی كوڕی عەفان (خوا لێی ڕازی بێت) جا هەروەها جاری دووەمیش لە زەمانی حەزرەتی عوسماندا (جەمع) كرایەوە بە ئاگاداری (لوجنەیێ) لە ئەصحابەو یاران (خوایان لێ ڕازی بێت) وە هەروەها حەزرەتی عەلیش ئیشرافی ئەكرد بەسەر ئەو (لوجنەدا) مەبەست لەم (جەمعە) ئەمەبوو كە هەرچی موسڵمانان گرد ببنەوە لەسەر یەك جۆرە خوێندنەوە بۆ قورئان و ئیختیلاف لە (رسم الخط) ی قورئاندا نەمێنێ ، جا هەزار جار (خودا ڕازی بێت) لەسەر هەموو یارانی حەزرەت (ﷺ) بەتایبەتی (ئەبو بەكرو ، عومەرو ، عوسمان و ، عەلی و یارمەتیدەرەكانیان كە موسڵمانانیان لە گێژاوی (ئیختلاف) لە خوێندنەوەی قورئان ڕزگار كرد هەتا هەتایە (خوا ئەجرو پاداشتیان بداتەوە ئامین .

## (گردكردنەوەی قورئانی پیرۆز لە چەرخی ئەبو بەكری صدیقدا)

جا هەروەها لە پەرتوكی (صحیحی بوخاری)دا ڕیوایەت كراوە كاتێ كە جەنگی یەمامە ڕوویدا لە بەینی سوپای ئیسلام و كۆمەڵەی (موسەیلەمەی كەزابدا) حەفتاو پێنج كەس لە (حافیظانی) قورئانی (عظیم) شەهید كران ئینجا بەهۆی ئەم كارەساتەوە حەزرەتی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) كەوتە ترس و بیمەوە ئایە ئەگەر لەچەند ڕووداوی تردا ژمارەیەكی تر لە حافظانی قورئان (شەهید) بكرێن ئیتر قورئان لە سینگی كێدا بمینێتەوە

(ئەم تەختە دارو بەردو بالا کەشانەش ئەگەر وونبن یا بشکێن وەیا زایە بن لە کوێ (نوسخەی) قورئانی پیرۆز وەربگرین ؟ جا بەم غەم و پەژارەوە رۆیشت قسەی لەگەڵ (ئەبو بەکری صدیقدا) کرد (خوا لێی رازی بێت) ، وە لەپاش موشاوەرەیەکی کەم حەزرەتی ئەبو بەکر (موافەقەی) حەزرەتی عومەری کرد بۆ (جەمعی) قورئان و ناردی بەدوای (زەیدی کوڕی ثابت) کە کاتبی (وەحی) پێغەمبەر بوو (ﷺ) وە خاوەنی (موصحەفە) باوەڕ پێکراوەکەی خۆی بوو کە پیشانی پێغەمبەری دابوو لەکاتی خۆی جا (زەید) هات و حازر بوو لە خزمەتی حەزرەتی (ئەبو بەکر) و حەزرەتی عومەر (خوایان لێ رازی بێت) بۆ (جەمع) و نووسینەوەی قورئان جا فەرمانیان بە یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) کرد ئەوەی لەناو (موصحەفی) ، ئەصحابەدا یا سینگ و سینەی دا هەیە گردی بکەنەوە ئینجا بڕیاریان دا هیچ نوسراوێك وەرنەگرن هەتا دوو (شاهید شەهادەت) نەدات بەوەی کە ئەم نووسراوە لەسەر ئەمرو فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) نووسراوەتەوە جا بەم بۆنەیەوە هەرکەسێ هەرچی قورئانی لەلابوو لە نووسوراوو لەلای بوو (تەقدیمیان) کرد بە (زەیدی کوڕی ثابت) (خوا لێی رازی بێت) جا لە (سنن أبو داود) هاتووە ئەڵێ (حەزرەتی ئەبو بەکری صدیق) (رەزای خوای لێبێت) ئەمری کرد کە (عومەری کوڕی خەتاب) وە (زەیدی کوڕی ثابت) (خوایان لێ رازی بێت) لە دەرگای مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشن بۆ وەرگرتنی قورئان لە (ئەصحابەکان) چ نووسراوو چ لەبەرکراو .

**(تێبینی)**

جا لەم (جەمع) و گردکردنەوەدا (زەیدی کوڕی ثابت) قەناعەتی نەکرد بەلەبەر بوونی قورئان بەتەنها هەتا نووسراوی لەگەڵدا پەیدا ئەکرد بۆیە (زەیدی کوڕی ثابت) خوا لێی ڕازی بێت ئەڵێ ئاخری سورەتی تەوبە ﴿ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ ﴾لەگەڵ ئایەتی دواییدا دەستم نەکەوت ئیللا لەلای (ئەبو خوزەیمەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەستم کەوت واتە : غەیری خۆم هەر ئەو لەبەری بوو نووسیویشیەوە ، جا لەسەر ئەم یاسا ڕاستە وە بە ئاگاداری حەزرەتی (ئەبو بەکر) و (عومەر) و (عوسمان) و (عەلی) و گەورە گەورەکانی موهاجرین و ئەنصار (خودایان لێ ڕازی بێت) لەماوەی دوو ساڵدا (تەقریبەن) ئەم(جەمع) و نووسینەوەی هەموو قورئانە تەواو بوو ، وە لەسەر چەند پارچە پێستێکی دەباغ کراو هەموو قورئانیان نووسیەوە وە هەمووی لەبەینی دوو (لەوحی) جواندا دانراو هەروەها تەسلیم کرا بە حەزرەتی ئەبو بەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) لەماوەی ژیانی ئەبوبەکردا لای ئەوبوو وە پاش وەفاتی ئەو کەوتە لای عومەر[*] مایەوە هەتا زەمانی عوسمانی کوڕی عەفان (خوا لێی ڕازی بێت)[1] .

---

(*) وا هەندێ لە زانایان ئەڵێن حەزرەتی عومەر (ر.ض) دای بە (حفصە)ی کچی ماوەیەك لەلای ئەو مایەوە.

(١) بڕوانە پەرتوکی (نوری قورئان) لەگەڵ دەست لێدان لە نووسینی مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) لاپەڕە ١٠٧.

## (بۆ دەڵێن عثمان جامع القرآن)ە ؟ [1]

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم زاتە کە ئەو ناوەی وەرگرتووە لەبەر ئەمەیە کە قورئانی پیرۆز بە مەحفوزی بمێنێتەوە هەروەها ئیختیلافی تێدا پەیدا نەبێ ئەوجا لەپاش (مشورەت) کردن بە ئەصحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەروەها (لیجنەیەکی) پێکەوە نا ئینجا لەم (لوجنەیەدا) عەلی کوڕی ئەبو تالیبی (خوا لێی ڕازی بێت) کرد بە سەرۆکی ئەم لێژنەیە لەژێر (اطلاعی) ئەمانە حەوت نوسخەیان لە قورئان نووسیەوە یەکێکیان کە (مەشهورە) بە (موصحەفی) ئیمام لە مەدینەی منەوەرەدا هێشتەوە ئەوانی تریشیان نارد بۆ (مەککەو شام و کووفەو بەصرەو بەحرەین و یەمەن) هەتا موسڵمانان نوسخەیان لێ بنووسنەوەو بڵاو ببێتەوە بەناو موسڵمانانندا ، چوونکە بێگومان بەم کردەوە باشە (ناجیحە) عالمی ئیسلامی لە ئاشوب و (ئیختیلاف) لە قورئاندا دەرچوو (ئیجماع) لەسەر ئەم وەزعە دامەزرا (والحَمْدُ للهِ عَلى ذلك) هەزار ڕەحمەت لەو کەسە بێ کە فەرموویەتی لەم چەند شیعرەدا :

قورئان لەماوەی ژیانی حەزرەت — هەموو هاتە خوار ئایەت بە ئایەت
ساڵی ئاخری ڕەهبەری جەلیل — دووجار خوێندیەوە لەبۆ جوبرائیل
مەعنای وەهابوو کیتابی ئیسلام — هەموو تەواو بوو بە (حوکمی) عەلام
لەسەر ئەم شێوە (نصوصی) کیتاب — هەموو مەحفظ بوون بۆ گەلێ ئەصحاب

---

(1) چوونکە ئەم زاتە حەوت نوسخەی کۆکردەوە وە بڵاوی کردەوە بە (مەملەکتی) ئیسلامیدا ئینجا بەوە ناوی ئیمام عثمان بووە (حافظی قورئان عثمان جامعی قورئان).

ئەخوێنرایەوە وەکو ونازل بوو     لە قیرائەتیا ئەنوار حاصڵ بوو
لەپاش وەفاتی حەزرەتی ڕەهبەر     (صدیق) دامەزرا لە جێگای سەروەر
هەربەو ئصوڵەو بە عەینی عادەت     قورئان دائیر بوو سورەت و ئایەت
تا دوازدەی هیجری لە چەرخی صدیق     جەنگی یەمامە ڕووی دا بەتاقیق
لەسەر سەرۆکی کەذذابی لەعین     موسەیلەمەی پیس ناپاکی بێ دین
کە ئەبو بەکر مودافەعەی کرد     تا ئەو مەلعونەی لەناوا لابرد
لە ئەو جەنگەدا حافیظی قورئان     گەلێ شەهید بوون لە ئەصحابەکان
جا بۆ مانەوەی قورئانی ئەنوەر     کەوتە ئەندێشە عەزرەتی عومەر
وەختی خۆی قورئان هەمووی نووسورابوو     بەڵام تەرتیبی خاصی نەکرابوو
چۆن نوسرابۆوە لەسەر دەفەی شان     یا تەختەی خورما یا لە بەردی پان[1]

## (باسێك لە فەزڵ و گەورەیی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز)

جا هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (الواقعە) دا لەچەندئایەتێکی پیرۆزدا ئەفەرمووی کە ئەو قورئانە قورئانێکی گەلێ بەرێزو پاك و خاوێن و پیرۆزو نازدارە و ئینجا هەروەها ئەفەرمویت ﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ﴾ واتە بەڕاستی ئەوەی (وەحیت) بۆ کراوە قورئانێکی بەرەکەت و بەفەرە ﴿فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾﴾ واتە لە نامەیەکی پارێزراودایە واتە (لوح المحفوظ) چوونکە دەستی ناپاکانی پێ ناگا ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ واتە: تەنها فریشتە پاکەکان و ئادەمیزادە پاکەکان بۆیان هەیە دەستی لێبدەن و

---

(1) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

له خزمەتی دابن و[1] جا ئەفەرموێت ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الواقعة:٧٧-٨٠، چوونکە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەوە نازڵ بووە بۆیە دەبێت ڕێزی تایبەتی لێ بگیرێت و وەکو (کتێبێکی ) سادە تەماشا نەکرێت (کە قورئان دەخوێنرێ پێویستە گوێی بۆ ڕابگرێ) و خوای مەزن ئەفەرموێت ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ ﴾ واتە : هەر کە ئەم قورئانە دەخوێندرێ زۆربە ووردی ئێوە ئەی ئیمانداران گوێی بدەنێ ﴿ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ سورەتی الأعراف: ٢٠٤ واتە: کپو بێ دەنگ بن و هەراو هۆریا مەکەن سا بەڵکو خوا لەبەر ڕێزلێنان و قایل بوون بە گەورەیی و ڕێزداری قورئان ، بەزەیی پێتانا بێتەوە واتە بەپێچەوانەی بێ باوەڕانەوە کە ئەوان لەکاتی خوێندنی قورئاندا -دەیکەنە هەراو هۆسەو دەڵێن ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ سورەتی فصلت: ئایەتی ٢٦ ، واتە : بێ بڕواکان بەیەکتریان گوت گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و کاتێ موحەمەد ئەی خوێنێتەوە ، وە بیکەنە هەراو هۆسەو

---

(١) ئەم (ئایەتە) وەڵامێکە بۆ ئەو بت پەرستانەی پێیان وابوو قورئان شەیاتین ئەی هێنێ بۆ پێغەمبەر (ﷺ) نەك فریشتە (سید قطب)-(رەحمەتی خوای لێبێ ) و ئەم مانایە ئاشکراو ڕوونترە بۆمانا دانەوەی ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴾ چوونکە بیژەی (لا) بۆ (نەفیە) نەك بۆ (نەهی) ئەوەتا لە ڕووی زەویدا هەموو کەسێك دەستی لێوەئەدات و چاك و خراپ بڕوادارو بێ بڕوا ئەگەر (نەهی) بوویا دەبوو هیچ کەسێکی تر نەی توانیبا دەستی تێوە بدات ئایەتی ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾یش پشتگیری ئەو مەبەستە ئەکات ، بڕوانە : تەفسیری ڕامان ، لاپەڕە ٨٢٠.

غەڵبەغەڵب تێیدا بەشکو زاڵ ببن بەسەر موحەمەد داو ئینجا خوا فەرمانیان پێ ئەکا بەگوێ گرتنی قورئان بەپێچەوانەی کافرەکان .

## (( چەند سەرنجێك دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ))

١) عَن عُثمان (رضي الله عنه) عَن النبي(ﷺ) قالَ ( خَيرُكم مَن تَعَلَّمَ القرآن وَعَلَّمَه) رواه البُخاري ، واته : عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێبێت ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەفەرموێت (باشترین کەستان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورائان دەبێ و خەڵکی تریش فێری قورئان دەکاو..)

٢) لە (عبدالله) ی کوڕی (مەسعود)ەوە (خوا لێی ڕازی بێت ) ئەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: ( مَنْ قرأ حرفاً من كتاب الله فلَهُ به حَسَنَة وَالحَسَنَةُ بِعَشرِ أمثالها لا أقولُ ألم حَرفٌ ولَكن ألف حرفٌ ولامُ حَرفٌ وَميمٌ حَرفٌ) رواه الترمذي ، واته : هەرکەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێ بەو پیتە چاکەیەکی بۆ هەیەو هەروەها پاداشتی چاکەش یەك بە دەیە ، دەی من ناڵێم (آلم) یەك (حەرفەو) واتە پیتە بەڵکو ئەلف پیتێکە وە لام پیتێکە وە میم پیتێکە ).

٣) عَن أبي ذر الغفاري قالَ : قالَ رسول الله (ﷺ) عَلَيكَ بِتلاوَة القرآن فإنَهُ نُورٌ لَكَ في الأرضِ وَ ذُخراً لَكَ في السَّماءِ )، رواه إبن ماجة في حديث طويل، واته: لە ئەبی زەڕی غەفاری یەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :( قورئان بخوێنەوە چوونکە دەبێتە ڕووناکی و نوور لە ژیانتدا و تێشوو و (زادێکی) بەکەڵکە لە ئاسمانداو) دیسان پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (أهلُ القرآن أهلُ اللهِ وَخاصَتَهُ ) رواه النسائي والحاكم ، واتە: ئەوانەی ئەهلی قورئانن و هەمیشە لە خزمەتی دان ئەهلی تایبەتی خوای گەورەن)و .

٤) عَنْ عَلي (رضي الله عنهُ) عَن النَبي (ﷺ) قال : (مَن قَرأ القرآن وأستَزهَرهُ فأحَلَ حَلالَهُ وَحَرَمَ حَرامَهُ أدخَلَهُ الله بـه الجَنةوَشَـفعهُ في عَشرةٍ مِـن أهـل بيتـه مُنْهُم وَجَبَت لَهُم النارُ) رواه الترمذي والنسائي، واته : عەلى كوڕى ئەبى تاليب (ڕەزاى خواى لێبێت) لـه پێغەمبـەرەوە (ﷺ) ئەفـەرموێت : ( هـەر كەسێك قورئـانى پـيرۆز بخـوێنىَ لەبـەرى بكـا و (حـەلاڵى) بـە (حـەلاڵ) بزانـىَ و (حەراميشى) بە (حەرام) بزانىَ ، ئينجا خـواى گـەورە بـەم هۆيـەوە دەيباتـە بەهەشت و تكاشى گيراوو قـەبولّ دەكـاو ئـەوجا بـۆ (دە) كـەس لـە كـەس و كارى خۆيدا هەر دەيان (موستەحەقى) ئاگرى دۆزەخيش بن و ) .

٥) عَن إبن عباس ( رضي الله عنهما) عَن النَبي (ﷺ) قـالَ (إن الـذي لـيسَ في جَوفهِ شيءٌ مِن القُرآنِ كَالبيت الخَـرابِ)رواه الترمـذي والنـسائي، واتـه: ئيبنـو عەباس (ڕەزاى خوايان لێبێت)لە حەزرەتەوە (ﷺ) ئەفـەرموێت ( هـەر دڵـىَ كە قورئانى پيرۆزى تێدانەبىَ و جا (خاڵى) بـىَ لـە يـادو زيكـرى خـودا وەكـو كەلاوەى كۆن وايە ).

٦) ديسان حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێ: ( مَن قَرأ القرآن وَعَملَ بِمـا فيـهِ أُلْـبِسَ والِداهُ تاجاً يَومَ القيامة ضَوؤُهُ أحسَنُ مِـنْ ضَـوءِ الـشَمسِ في بيـوت الـدُنيا لَـوْ كانَت فيكُم فَما ظَنُكم بالذّي عَمَلَ بهذا ) رواه أبو داود ، واتـه : ( هـەر كەسـىَ قورئان بخوێنىَ و ڕەفتارى پىَ بكا لەڕۆژى قيامەتدا باوك و دايكى (تـاجێكى) وايان لەسەر دەكرىَ شەوقەكەى لە شەوقى ئەو خۆرە جوانترە كە لـە جيهانـا لەناو ماڵەكانتان دەدات، ئەى كەوابىَ دەشىَ ئەوەى كە بيخوێنىَ و كارى پـىَ بكا پلەو پايەى خۆى چۆن بىَ و چى بىَ[(١)] .

٧) ديسان حەزرەت (ﷺ) لە فەرمودەيەكدا ئەفـەرموێت ( لايَمَـسُ القـرآنَ إلا

---

(١) بڕوانـە پـەرتوكى ( التـاج الجـامع للأصـول في أحاديـث الرسـول ) لـە وەرگێڕانـى مامۆستا(نورى فارس حەمەخان) بەرگى٣، لاپەڕە ٨.

الطاهرُ) رواه الطبراني بسند حسن ، واته : هيچ كەسێك نابێ دەست لە قورئان بدات مەگەر موسڵمان نەبێت و پاك نەبێت [1].

## پاشکۆ

(جەمعی عوسمانی کوڕی عەفان بۆ قورئان) [2]

له ساڵی سێدا بە (ئەمری) عوسمان بوو بەسەرسوپا میر عبدالرحمن
جا عوسمان هەستا زۆر بە ئیهتیمام بۆ پاراستنی قورئانی ئیسلام
ڕێکی خست لوجنەی یارانی وەلی لەسەر ئیشرافی حەزرەتی عەلی
هەرچی موصحەف بوو هێنایانە ڕوو بۆ ئیستنساخی چەند موصحەفێ زوو
لەگەڵ موصحەفی مەجموعی صدیق بوون بە سەرمەشقی تەوحیدو تەوفیق
کە نووسرانەوە ئەم حەوت نووسخانە کران بە سەرمەشق لە ڕووی زەمانە
ڕەوانە کران (طەرەف) بە (طەرەف) تا وەری بگرن خەلەف لە سەلەف
بۆ یەمەن بەحرەین لەبۆ میسر و شام بۆ کووفەو مەککەو بۆ عوسمان ئیمام

یارەبی خوایەگیان (ئەجرو) پاداشتی هەر (چوار خەلیفەکەی) حەزرەت بدەیتەوە لەگەڵ هەموو (قورائو حافیظە) کانی قورئان ئامین.

أقولُ قَولي هذا وَأستَغفر الله لي وَلَكُم وَلِسائر المُسلمينَ نَبَهني الله وَإياكُم من نَومة الغافلين وَحَشَرَني وَإياكُم تحت لواء سيد المرسلين آمين، اللّهُمَ أغفِر لَنا (ئامين).

---

(1) مەبەست ئەوەیە لێرەدا نابێ موسڵمانیش دەستی لێبدات لە قورئان مەگەر دەست نوێژی هەبێ و پاك و خاوێن بێ ).

(2) بڕوانە پەرتوكی (نووری قورئان) لەگەڵ كورتكردنەوەو دەست كاری لە نووسینی مامۆستا مەلا (عبدالكريمی مدرس) لاپەڕە ١١٢ .

# ئامۆژگاری چل و دووهەم

## ئیمان و باوەڕ بە پێغەمبەرانی خوای گەورە

الحمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله ما تَـوفيقي وَلا إعْتـصاميةَ إلاّ بـالله عليـه تَوَكلـت وَ إليه أنيب الحَمْدُ الله الذي أرْسَلَ رَسُولَهُ بالهُدى ودين الحَقّ ليُظهرَهُ عَلى الدّين كُلّه وَكَفى بالله شهيداً وَأشهَدُ أن لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ حَيْـثُ يَقـول الله سـبحانَهُ وَتَعـالى في كتابـهِ الكَـريم ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ سوورەتی یوسف: ١١١وكما يَقول الله تَبـارَكَ وَتَعـالى في القـرآن العظـيم ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ سوورەتی آل عمران: ٣٣ وَالصَلاةُ وَالسَلام علـى جَميـع الانبيـاء وَالمُرسَـلين خصوصاً على سيدنا محمد وَعَلى آله وَأتباعه اجمَعين وَمَـن تَـبِعَهُم بإحسان إلى يوم الدين (أما بَعدُ أيها المسلمون) واتە لەدوای هەندێ ئەی موسـڵمانان (أوْصِيكُمْ بِتَقوا الله وَطاعَتهِ في جَمِيع أوقـاتِكُم)، واتـە : وەسـیەتتان ئەکـەم بەتەقوای خواو جێ بەجێ کردنـی فەرمانـەکانی لەهـەموو کـات و سـاتێکدا (وَأعلموا إخواني بأن الإعتِقاد بِبَعثـة الرَسُـل رُكـنٌ مـنْ أرْكـان الإيمـان) واتـە بێگومان پێویستە بزانین ئیمان و باوەڕ بەهەناردنی پێغەمبەرەکان ڕوکن و پایەیەکـە لـە پایـەکانی ئیمـان چـوونکە زۆربـەی پـەرتوکو کتێبـەکانی (عەقیدە) ئەفەرموون (فَيَجِبُ على كُلِ مؤمِن وَ مؤمِنةٍ أن يَعتَقِد أن الله خالِق هذا الكَون) کەواتـە پێویـستە لەسەر هـەموو ژن و پیـاوێکی موسـڵمان کـە باوەڕی وابێ درووست کەرو (خالقی) ئەو هەموو بوونەوەر هەر خودای تـاك

و تەنیایە وە هـەروەها بەڵگـەو (دەڵیلـی) نـەقڵیش زۆرن لەسـەر خوایـەتی خواو هەروەکو لەپێشەوەدا باسمان کرد جا هەروەهاش بـۆ نموونـە خـوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت:﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ سوورەتی العنكبوت: ٤٤

واتـە خـوای گـەورە کـوڕاتی ئاسمانـەکان و کـوڕەی زەوی درووسـت کردووەو بوونی ئەو کوڕتانەش (دەلیل) و بەڵگەن لەسەر خوایەتی خوا بـۆ کەسێك باوەڕو ئیمانی هەبێ و موسڵمان بێ) جا بێگومان کە زانیمان خوای مـەزن خـالقی (کـەون و کائیناتـە) و ڕازقـی هـەموو ئـاژەڵ و حـەیوانات و جانەوەرە مارو مێروو تەیرو تار و باڵندەو هەروەها دەبێ ئەمەش بزانین کە خوای گەورە هەندی ئینسانی (ئیختیار) کردووە وە هەڵیبژاردووە بـۆ سـەر ئادەمیزاد ، هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە تا حەزرەتی (فەخری) عالەم وەکو قورئـان ئەفـەرموێت ﴿ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾ سـوورەتی فـاطر: ٢٤، واتە هیچ گەل و نەتەوەیەك نەبووە کە فرستادەو بێدارکەرەوەیێکی بۆ ڕەوانە نەکرابێ (بە موژدە دەرو ترسێنەر) جا هـەروەها زانایـانی (ئـەهلی) عەقیدە لە کتێبەکانیاندا ئەفەرموون (إنَ الله أرسَلَ رُسُلاً منَ البَشَر مُبَشرين بثوابه وَمُنذرينَ بِعقابه) واتە : بەڕاستی خوداوەندی مـەزن چـەند کەسـانی بەناوی ڕابەرو پێغەمبـەر لـەناو عالەمدا هەڵبـژاردووە بـۆ ئـەوەی مـوژدەی خۆشی بدەن بەو کەسانەی ئیمان و باوەڕیان بـەخواو پێغەمبـەران و ڕۆژی قیامـەت هەیـە وە ئەوانـەش بترسـێنن کـە ئیمـان و باوەڕیـان نییـە) وە هـەروەها (لِيُبَيِّنـوا الـشّرائعَ وَالاحكـامَ وَالحدودَ الـتي فيهـا صَـلاحُ الإنـسان

وَسَعادَتَه فِي الدُّنيا وَالأخِرة) واتە : بۆ ئەوەی بەیان بکەن ئەو شەرع و یاساو بەندەو (حدودانەی) کە دەبنە هۆی سەکەوتنی ئیسنان هەروەها خۆش بەختی دونیاو قیامەت ، چوونکە هەروەها بێگومان خوا لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾سوورەتی النحل: ٣٦ ، واتە : بەڕاستی ئێمە ناردوومانە بۆ سەر هەموو گەل و میللەتێك پێغەمبەرێك کە پێیان ڕابگەیەنێ (عیبادەتی) خوا بکەن و خۆیان لە خراپەو (بت پەرستی) بپارێزن چوونکە بێگومان هیچ کەسێ لێپرسراو نییە تا دەستوورو یاسای ئایینی پێ ڕانەگا و (تەبلیغی) نەکرێ وەکو لەو ئایەتەشدا ئەفەرموێت ﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولًا ﴾ سوورەتی الإسراء: ١٥، واتە ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین .

**(ئاگادارییەکی گرنگ)**

ئینجا بە دەلیلی عەقلی و نەقلیدا بۆمان دەرکەوت کە هەرلە حەزرەتی ئادەم و تا فەخری عالەم هەزاران ڕابەرو فرستاد و پێغەمبەر لەلایەن خواوە ڕەوانە کراون هەروەکو قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا باسی ئەکاو چوونکە لە (حەدیسدا) هاتووە کەوا عەرزی پێغەمبەریان کرد (صەلات و سەلامی خوای گەورەی لێبێت) گوتیان قوربان چەندپێغەمبەر تا ئێستا ڕەوانە کراون ؟ فەرمووی (سەدو بیست وچوار هەزار) پێغەمبەر ، بەلاّم خوای گەورە هەر باسی هەندێکیانی کردووە هەروەکو لە قورئاندا

ئەفـەرموێت ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ﴾سوورەتی النساء: ١٦٤ بێگومان چیرۆك و بەسەرهاتی هەندێك لـە پێغەمبـەرانمان بـۆ گێڕایتـەوەو بەسـەرهاتی هەنـدێکی تریـشمان بـۆ نەگێڕایتەوە) چوونکە بێگومان هـەر لەبـەر ئەوەشـە کـە خـوای گـەورە لـە ئایەتێکی تردا ڕوو ئەکاتە پێغەمبـەر و ئەفـەرموێت ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ هـود: ١٢٠، واتـە بێگومـان باسـی خەبـەری پێغەمبـەرانت بـۆ دەگێڕمەوە تا دڵت ئارام بێ و لات ئاشکرا بێ لەبەسەرهاتی پێغەمبـەران و ئومەتـەکانیان)، هـەروەها تـا موسـڵمانەکانی (ئوممـەتی) تـۆ پەنـدو (ئامۆژگاری وعیبرەت) وەرگرن یا ئامۆژگاری و بیرخستنەوەی باشی تێدایە بۆ ئیمانداران هەروەکو لە ووتاری پێشوودا ئایەتەکـەمان باسـکرد ئەمـەش دەقەکەیـەتی ﴿ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾سـوورەتی یوسف: ١١١

واتە سوێندبەخوا بە ڕاستی لەسەرگوزشتەو بەسـەرهاتی پێغەمبەرانـدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیـرو هۆشمەنـد یـا بـۆ ئـەو کەسـانەی خاوەن بیروهۆشن .

## (تێبینیەکی گرنگ)

هەروەها ئیمان وباوەڕ بـە پێغەمبـەرانی خـودا ڕوکنێکـە لـە (ئـەرکانی) ئیمان هەروەکو لەپێشەوە ووتمان ، جا ئیمان بە پێغەمبەرانی خودا لەلای

ئەهلی (عەقیدە) لەسەر دووبەشن (یەکەم) پێغەمبەرێکی وایە فەرمانی گەیاندنی ئەحکام و یاسای خودای پێندەدراوە ئەم بەشە لە زمانی عەرەبدا پێی ئەڵێن (نبی) واتە (نەبی) ئادەمیزادێکە خودای تەعالا شەریعەتێکی پێدابێ و ڕەفتاری پێ بکا خوا بیگەیەنێ بە (باقی) ئادەمیزاد یا نەیگەیەنێ.

(بەشی دووەم) پێغەمبەرێکی خاوەن (شەریعەت) و خاوەن (کتێبە) و فەرمانی پێدراوە بیگەیەنێ بە (ئەهلی) عەقل ژیر، ئەم بەشە لەزمانی عەرەبدا پێی ئەڵێن (رسول) واتە هەنێردراو بۆ سەر گەل و میللەت و هۆزێك ئەوەل کەسێ لەمانە کە (ئەحکام) و یاسای خوای گەورەی گەیاندووە بە (بەشەر) و ئینسان جا ئەویش وێنەی حەزرەتی (ئادەم) بووە (علیه السلام وعلی نبینا) کە باوکی ڕشتەی ئادەمیزادە و وە هەروەها (ئاخیر) کەسیش لەم بەڕێزانەحەزرەتی موحەمەدە (صلی الله علیه وسلم) کە ئەم زاتە کوڕی (عبدالله) یە کوڕی (عبدالمطلب) ەو کوڕی (هاشم) ە کوڕی (عبدالمناف)ە لە طائیفەی قورەیش و لە نەتەوەی حەزرەتی ئیسماعیل ی کوڕی حەزرەتی (ئیبراهیم)ە ئەوجا ئەو زاتە لەشاری مەککەدا لەدایك بووە هەروەها هەموو سیرەت نووس و مێژوونوسان ئەڵێن (تاریخی پێنج سەدو حەفتاو یەکی (٥٧١) میلادی) واتە زایینی واتە لەدایك بوونی حەزرەتی (عیسا) کوڕی مەریەم لەدایك بووە (صەڵات و سەلامی خوای گەورەیان لەسەربێت)[1] .

---

(١) بڕوانە پەرتوکی (نووری ئیسلام) لە دانراوی خوالێخۆش بوو مامۆستا مەلا (عبدالکریمی مدرس) لاپەڕە ١٥ لەگەڵ دەست کاری .

**(سەرنجێکی گرنگ)**

جا هەروەها پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێ کە ئیمان و باوەڕی ببێ بەهەموو ئەو پێغەمبەرانە کە خودای تەبارەك و تەعالا ڕەوانەی کردوونە ناردوونی بۆ بانگ کردن و هاندانی ئینسان و بەشەر بۆ دین و ئایینی پیرۆزی خودا هەروەها شێخ (ابن الحجر الهيتمی) ئەفەرموێت (حەدیسی) ژمارەی سەرجەم پێغەمبەران کە (١٢٤٠٠٠) واتە سەدو بیست و چوار هەزار پێغەمبەرن/ ئەمە حەدیسێکی/ صەحیح و/ ڕاستە وە هەروەها ژمارەی (رُسل) کە (٣١٥) سێ سەدو پازدە (رسول)ن ئەمەش (حەدیسێکی صحیح) و ڕاستە بەلاَم ژمارەی (٢٥ یان ٢٦) یان لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووەو براوە وە ئەوانە ئەمانەی خوارەوەن:

١) آدم ٢) نوح ٣) ادريس ٤) هود ٥) صالح ٦) إبراهيم ٧) لوط ٨) إسماعيل ٩) إسحاق ١٠) يوسف ١١) يعقوب ١٢) أيوب ١٣) شعيب ١٤) موسى ١٥) هارون ١٦) الياس ١٧) اليسع ١٨) ذو الكفل ١٩)يونس ٢٠) داود ٢١) سليمان ٢٢) عزيز ٢٣) زكريا ٢٤) يحيى ٢٥) عيسى ٢٦) وَسيدنا محمد المصطفى (صلى الله عليهم وعلى نبينا وآله وصحبه وسلم) کە کۆتایی ڕشتەی پێغەمبەرانە چوونکە (خاتم النبيين)ە وەلەپاش ئەو پێغەمبەری تر نابێ و نایەت ، وە هەروەها ڕەوان کراوە بۆلای هەموو ئادەمیزادو (جن و ئینس) کەئیمانی پێ بێنن وە بەهۆی ئیمانەوە بگەن بە پیرۆزی هەتا هەتایی .

## ( باسێك له پێغەمبەرەکانی ( أولو العزم ) و بەڵێن وەرگرتنیان ئەکات )

جا هەروەها بزانن لەو پێغەمبەرانە پێنجیان گەورەو بەرێزن و بە (أولـو العزم) ناو ئەبرێن و (مەشهورن) کە لەم ئایەتەدا ناویان براوە وەك قورئـان ئەفـــــــەرموێت ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾سوورەتی الأحزاب: ٧ واتە باس بکە ئـەو کاتـەی بەڵێنمان لەهەموو پێغەمبەران وەرگرت کە ئایینی خوا بەخەڵکی ڕابگەیەنن ، هەروەها هەمان بەڵێنیشمان لەتۆ وەرگـرت ئـەی خۆشەویـست (ﷺ) وە له (نوح) و (ابراهیم) و (موسی) و (عیسی)شمان وەرگرت .

((تێبینی))

ئەوجا پێویسته بزانین چوونکە گەڵێ پێویسته ئینسانی ئیمانـدار بزانـێ بەظاهیر ئایەتی قورئانا بـڕوا بەڕێـدا ئیمـانی ببـێ بـەوەی کـە پێغەمبـەران (معصومن) واته بێگوناهن هەروەها پێویسته باوەڕی ببێ بەوەی لەناوئـەو پێغەمبەرانەکـە خـودا نــاوی بــردوون لــە قورئانــدا پێــنج کەسـیان لــە (باقیەکەیان) گـەورەترن کـە (مەشـهورن) بـە (أولـو العـزم) واتـە : ئەوانـە کەخاوەنی کاری زۆر گرنگ و (أهمیه) بوون چـوونکە دوژمنیـان زۆر بـووەو زۆر خۆڕاگربوون ئەو پێنجەی کە لەپێشەوە ناومان بردوون بەڵام هـەروەها لەناو ئـەو پێنجەشـدا ئـەهلی ویـژدان و سـوننەت و جەماعـەت ئەفـەرموون حەزرەتی مُحَمد (صلی الله علیه وسلم) لەهـەموویان گـەورەترە وە خـودای تەبارەك و تەعالا فەرموویـەتی: ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾ سوورەتـی الأحقاف: ٣٥ ، واتە: صەبر بگرەو دان بـە خۆتـا بگـرە خـۆڕاگر

بەو خۆت بگرە لەسەر ئازاری ووتارو ڕەفتاری نابارى ئەو دوژمنانەت (وەکو ئەو پێغەمبەرە خاوەن عەزمانە صەبریان کرد)چونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت﴿ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٥٣

واتە ئەو پێغەمبەرانە بازێکیانم گەورەکردووە بەسەر بەعزێکیاندا واتە ڕێزی هەندێکمیانمان داوە بەسەر هەندێکی تریاندا .

( پاشکۆ )

جا هەروەها بێگومان (یەکەم) پێغەمبەر (ﷺ) حەزرەتی بابە ئادەم بوو ئاخیر پێغەمبەریش (ﷺ) حەزرەتی (محمد المصطفی) ی نازدار بوو هەروەکو لەپێشەوە باسمان کرد کە گەورەی هەموو پێغەمبەرانە (سەلات و سەلامی خوایان لێبێت) دیسان پێویستە بزانین (جگە لەم بەڵێنەی پێشوو) خوای گەورە بەڵێنێکی تری لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووە کە ئەبێ ئیمان بە حەزرەتی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) بێنن وەئەگەر گەیشتنە سەردەمی وی ئەبێ ئیمانی پێ بێنن ویارمەتیشی بدەن[1] چوونکە ئەگەر ئێمە تەماشای (ئایەت و حەدیس) و (ئەدلەی) ئاین بکەین ئەوجا ئەزانین بێگومان حەزرەت (ﷺ) گەورەترە بەم (دەلیل) و بەڵگانە :

یەکەم) دین و ئایینی پێغەمبەر (ﷺ) هەروەها (عاممە) بۆ هەموو ئوممەتی و گشت خەڵکانی تر (ئینس و جین و خاص و عام) چوونکە خوا

---

(١) بڕوانە ئایەتی (٨١) ی (آل عمران) وە تەفسیری (موفسرین) وەکو طبري و قرطبي و ئالوسی و زۆرانی تریش..هتد).

بەڕەحمەتی هەناردووە بۆ هەموو عالەم).

دووەم) دین و ئاینی ئەو (ناسخی) واتە ڕەشکەرەوەی هەموو دین و ئاینی پێشوەکانە چوونکە دینی حەزرەت (ﷺ) نەسخ و تێکچوونی بەسەردا نایێ هەرگیزاوهەرگیز .

سێ هەم) ئوممەتەکەی چاکترە لەهەموو ئوممەتەکانی پێغەمبەران کەوابێ خۆشی گەورەتر ئەبێ لەسەر هەموو پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خوایان لەسەربێ) .

چوارەم) ئەوەڵ کەسێ کە لەڕۆژی قیامەتدا (شەفاعەتو تکاو ڕەجا ئەکا) هەر ئەوەو تاقە سواری مەیدانی مەحشەر .

پێنجەم) خۆی فەرموویەتی لە حەدیسی صەحیحدا (أنا سَیدُ وَلَدِ آدمَ وَلا فَخر) رواه الترمذي وقال حديث صحيح/ واتە : من گەورەی نەتوەی/ حەزرەتی ئادەمم/ و فەخر/ ناکەم واتە: بێ خۆ هەڵکێشان و شانازیەوە .

شەشەم) موعجیزەی ئەو کە قورئانی پیرۆزە پایەدارە تا ڕۆژی قیامەت وە گەلێ دەلیل و بەڵگەی تر هەیە لەسەر ئەم باسە.

## (باسی موعجیزەو صیفاتی پێویست بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت)

جا بێگومان ئەوەی ڕاستی بێت هەر پێغەمبەرێك داوای پێغەمبەرایەتی بکات ئەبێ لەلای خودا بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێ کە ڕاست ئەکات ئەم بەڵگەیە پێی ئەوترێ (مُعجِزة) واتە سەر سوڕمێن یا لە ڕادەبەدەر چوونکە

(موعجیزه) بیّ توانا کردن کاریّکه له سنووری توانـای ئـادەمیزاد دانییـه[1] خوای گەوره له کـاتی مەیدان خواستنەوەدا لەسەردەسـتی پیّغەمبـەرانی خوّی ئەیهیّنیّته جیّ تاوەکو باوەڕیان پیّ بکریّ کـه ئـەلیّ مـن پیّغەمبـەری خودامه/ وەکو نەسوتانی/ حەرزرەتی ابراهیم پیّغەمبەرو (ﷺ) یان وەکـو دار (عەصای) موسا پیّغەمبەرو/ یان وەکو/ مردوو زیندوکردنەوەی/ عیـسی پیّغەمبەرو (سەلامی خـوای لیّبیّـت) یـان لـەتکردنی مـانگ بـه (ئیـشارەی) ئەنگوسـتی پـیرۆزی پیّغەمبـەرمان (ﷺ) یـان/ هـەلّقولانی ئـاو لـەنیّوان پەنجەکانی پیرۆزی ...هتد[2]).

(**تیّبینی**)

ئەوجا بزانه (مُعجِزة) له بـەهیّزی بەلّگـەیی دا ئەگاتـه ئـەو پلەیـەی کـه خوای گەوره بفەرمویّ (بەندەی من ڕاسـت ئـەکات لەهـەموو ڕاگەیانـدنیّکی لەلای منەوه دیسان بزانه (واجبه) پیّغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) ئەم چوار سیفەته بەرزەو گەورانەیان لیّ بیّته جیّ :

یەکەم) پاریّزراوبن له گشت گوناهیّکی گەوره و بچووك.

دووەم) ڕاستگۆ بن له گشت ڕاگەیاندنیّکیاندا .

سیّهەم) ژیرو هۆشیارو زیرەك بن بۆ دەمکوت کردنی ئاژاوەچی .

---

(1) وەکو شاعیر ئەلیّ (موعجیزه کاری ئوممەت پیّی نەکریّ دەعوای نبوەتی پیّ تەرویج بدریّ)

(2) جا بیّگومان گەورەترین (معجزة) ی پیّغەمبەرمان (ﷺ) قورئانی پیرۆزه ، بڕوانه پەرتوکی (تحفة المرید) لاپەڕه ٦٦.

چوارەم) ڕاگەیەنەرین بۆ گشت ڕاگەیاندنێكی فەرمان كراو لەلایەن خوا كەوا بۆ دژی ئەم چوار سیفەتانە بۆ پێغەمبەران مەحالّ و ناگونجیّ وەكو (خیانەت كردن) بە تاوان كردن و درۆ كردن و كێلەكەیی و ناتێگەیشتن و ڕانەگەیاندن ؟چوونكە ئێمە فەرمان پێكراوین شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) بكەوین ، لە گوفتارو لە كردارو گشت ڕەوشتێكی تر خوای گەورەش فەرمانی بەخراپە ناكا حاشا وە لیللا[1] .

## ( ئایینی هەموو پێغەمبەران یەك ئایینە بەلاّم ڕێسالّەو بەرنامەیان جیایە )

جا هەروەها پێویستە بزانین یەكەم بانگەوازی هەموو پێغەمبەران (صەلاّتو سەلامی خوایان لێبێت) بە گشتی بۆ یەكتا پەرستی بووە ، واتە باوەڕ بەتاك و تەنیایی خواو دوور كەوتنەوە لە ڕێبازی شەیتان چوونكە خوای گەورە لەم ئایەتدا ئەفەرمووێت : ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾سوورەتی النحل: ٣٦ ئەمە لە پێشەوە تەفسیر كراوە پێویست بە دووبارە ناكاتەوە بەلاّم لە لقەكانی ئاییندا بەرنامەیان جیابوو هەروەك خوا لە قورئانا ئەفەرموێت ﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا ﴾سوورەتی المائدة: ٤٨ واتە: هەر یەكێك لە ئێوە پێغەمبەران جۆرە یاساو بەرنامەیەكمنان داوەتیّ، هەروەها

---

(١) بڕوانە پەرتوكی (ڕوونكردنەوەی العقیدة الطحاویة) لەوەرگێڕانی مامۆستا (مەلا عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی) لەگەلّ دەست كاری لاپەڕە ٧٢.

دەفــەرموێت: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ﴾ سوورەتی الشوری: ١٣ واتە: ڕێبازی ئـایین و بەرنامـەی ژیـانی بـۆ دانـاون ئەوەی کە فەرمانی پێکردووە بە نـوح هــەر بـەو شـێوەیە قورئـانیش بۆتـۆ ئەی محمد (ﷺ) وەحی و نیگاکردووە بە ئیبراهیم و مووسا و عیساشمان/ ڕاگەیاندووە/ کەڕێبازی ئاین و یەکخواناسی بەرنەدەن لەسەری پایەدارین.

**( ئاگاداری )**

جا بێگومـان خـوای گـەورە بـە نـاردنی حـەزرەتی (محمد المصطفی) (صـلی الله علیـە وسـلم) کۆتـایی بـەناردنی پێغەمبـەران هێنـا و کردیـە پێغەمبەری ئیسلام و بەشەریعەت و ەیاسای ئیسلام شەرع و یاسای گشت پێغەمبەران لەکار کەوت و ئاینیان (نەسخ) بوەوە بـەڵام یـەکخوا پەرسـتی گۆڕانکاری نەهاتە سەر جا هەروەها خوای گەورە لـەم بارەیـەوە هـەروەها لەبارەی ئـایین و دینـی ئیـسلامەوە ئەفـەرموێت: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ سـوورەتی آل عمـران: ٨٥ واتە هەر کەسێك جگە لە ئیسلام ئاینێکی تری بوێ واتە(بەرنامەی خوا پەرسـتی و ژیـانی دابنـێ) ئـەوا خـوای گـەورە لێـی وەرنـاگرێ و لـە ڕۆژی دواییشدا لە زەرەرمەندەکانە) ، ئەوجا بزانـە هـەروەکو خـوای گـەورە لـەم ئایەتەدا ناوی لە ئایینی ئێمە ناوە (ئیسلام) ناویشی لـە ئێمـەی ئوممـەتی محمد ی (صلی الله علیه وسلم) ناوە (موسڵمان) هەروەك ئەفـەرموێت : ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا ﴾ سوورەتی الحج: ٧٨واتـە: خـوا

ناوی له ئێوه ناوه موسڵمان لەپێش هاتنی قورئان ، وەلە قورئانیشدا ناوی ناون به موسڵمان ، بەڕاستی موسڵمان گەورەیە لای هەموو پێغەمبەران بەتایبەتی پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی (محمد المصطفى) ی نازدار (عليهم الصلاة والسلام) هەزار ڕەحمەت له (شاعیری) ئیسلام (عبدالرحیم مەولەوی) که ئەڵێ وئەفەرموێت:

له شەریعەتا به قەولی موختار رەسول شەخصێکە ڕاستن فیعل و گوفتار
له بەنی ئادەم و صاحب فەضائیل ازاد (مذكر) پاك له رەزائیل
ئەکمەل و ئەفضەل عەقلەن و خولقەن قووتەن ڕەئیەن فطنةً خَلقاً
به شەجاعەت و بەحیکمەت وجود حیفەت وتەقواو خەشیەت له مەعبود
بنسبه قطُ – لَم ------ تَقُم دناءة الأب خَناءَة الامّ
وا دەوێ پێیان ئیمان ئاوەرن باوەڕیکەی حەق هەڵی بژاردن
دەگەڵ ئەو هەموودوژمنی زۆرە ئەو طەعنە لۆمە ئەو شەڕو شۆڕە
گەیاندیان به سەعی بێ حەدوو غایەت پەیامی خودا ئایەت به ئایەت
بەیانیان فەرموو بەیانی موبین ئەصڵەن وە فەرعەن گشت ئەحکامی دین
طابَت الدُنيا بِدَعوَتِهم جزاهُمَ الله عَن أُمَتِهِم [1]

( پاشکۆ )

(ئایینی ئیسلام ئایینی خوایە) جا هەروەها ئیمامی(طحاوي) ئەفەرموێت (وَدينُ الله في الأرض وَالسماءِ واحدُ وَهوَ دينُ الإسلام[2]، واتە

---

(1) بڕوانه پەرتوکی (عقیدەی مرضية) له دانانی (سيد عبدالرحيم مەولەوی) شەرح وتەحقیقی (مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس) لاپەڕە ٣٤٩.

(2) بڕوانه پەرتوکی (شرح العقيدة الطحاوية) له نووسینی (القاضي علي بن علي محمد بن ابي العز الدمشقي) بەرگی ٢ ، لاپەڕە ٧٨٦.

بەڕاستی ئایینی ئیسلام لە ئەرزو ئاسماندا هەریەك ئایینەو کە ئەویش ناوی ئایینی ئیسلامە چوونکە خوای گەورەش لەم بارەیەوە ئەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ سـوورەتی آل عمـران: ١٩، واتـە : بەڕاسـتی ئایینی ڕاستەقینە لەلای خوا ئایینی ئیسلامە ، جا هەروەها خـوای گـەورە لەئایـەتێکی تـردا ئەفـەرموێت ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾سـوورەتی المائـدة: ٣ واتـە بێگومـان مـن ڕازیمـە لەئیـسلام ئـایینی ئێـوەبێ) جـا پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیـە وسـلم) لـەبارەی ئـایین و بـیرو باوەڕی پێغەمبەرانەوە ئەفەرموێت: (الأنبياءُ أخوةٌ من عَلاةٍ وأُمهـاتُهم شـتّى وَدينهم واحدٌ) رواه مسلم، واتە: پێغەمبەران زڕ بـرای یـەکن بـەلاّم دایکیـان لێك جیایە و ئاینیان یەك ئایینە واتە بنچینەی ئایینـان یـەك بنـچینەیە کـە خوا پەرستیە بەلاّم لە لقەکانی ئایین دا لێك جیانە، (خوایە گیان ڕەحممان پێ بکەی خوایە بە عەمەل و کردەوەی ئێمە نەکەیت ، خوایـە بەبـەر تکـاو (شەفاعەتی) پێغەمبەرمان بخەی/ خوایە خۆشەویستی پێغەمبەرانمان لـەلا زیاد بکەی بەتایبەتی پێغەمبەری خۆمان/ حەزرەتی (محمد المـصطفی) ی نازدارمان ئامین)، خوایە لە بەلاّو (موصیبەتی) دونیاو قیامـەت بمانپـارێزی و عەفومان بکەیت (ئـامین یـا ربّ العَـالمین ، نـبهني الله وإيـاكُمْ مـن نومـة الغافلِين وحَشَرَني وإيّاكُم تَحْتَ لِواء سيّد المُرسَلِين).

# ئامۆژگاری چل و سێ هەم
## ئیمان و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و قیامەت

الحَمدُ لله المُنفَرد بالقُدرةِ وَالبَقاء وَالكَمَال الذّي خَلَقَ الإنسانَ وَأحصى عُمرهُ ثُمَ يَخرجُهُ للْبَعثِ وَالحَشرِ والنَشر وَالحساب وَالسؤال وَنَشهَدُ أنْ لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ بلا قيل وَقال وَنَشهَدُ أن سيّدنا محمّداً عَبدَهُ وَ رَسُولَهُ الذي أرسَلَهُ الله بالهُدى وَصالح الأعمال الحَمدُ لله رَبِّ العالَمين وَالصّلاة وَالسَّلام عَلى سيّدنا مُحَمدٍ وَعَلى آله وَأصحابه أجمَعين وَمَن تَبِعَهُم بإحسان إلى يوم الدين، أما بَعد أوصيكم عيبادالله بتقوا الله وَطاعته وَلزوم أوامره) واته : لەپاش ئەمە موسڵمانینە وەسیەتتان لێ دەکەم بە تەقوای خوداو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا (موسڵمانینە) لە ووتارو خوتبەکانی ڕابردودا باسی چوار بەند لە بەندەکانی (ئەسڵی) ئیمان و باوەڕم بۆتان کرد کە ئەویش بریتی بوون لە ئیمان وباوەڕ بە خواو بە فریشتەکانی و هەروەها باوەڕو ئیمان بەپەڕتوك و کتێبەکان وەهەروەها ئیمان بە پێغەمبەران ، ئەوا لەو خوتبەو ووتارشەدا بەیارمەتی خوای گەورە باسی بەند و ڕوکنی پێنجەمتان بۆ دەکەم کە بریتیە لە تەسدیق و باوەڕ بەڕۆژی (قیامەت و عەزابی قەبرو) سوئالی ناوگۆڕو هەروەها زیندوو بوونەوەو (حیساب) لە ڕۆژی مەحشەردا هەوەها باوەڕ بە تەرازوو میزانی (حەق و عەدالەت) هەروەها سەواب و پادشتی باش بۆ پیاو چاك و سزاو عیقاب بۆ پیاوی خراپ وە هەروەها پردی (صیراط) وبەهەشت و جەهەنەم و شەفاعەتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) چوونکە بێگومان دەبێ موسڵمان باوەڕی وابێ کەئەمانە هەمووی (هەقن) و ڕاست و درووستن

(چوونکه دەلیلی عەقڵی و نەقڵی) لەسەر ڕۆژی قیامـەت ئەوەنـدە زۆرن لـە (حیساب) نایـەن بـۆت نـاژمێردرێ ، موسـڵمانینە واتـێ نەگـەن کـە خـوای گەورە ئێمەی بە خۆڕایی درووست کـردووە ، هـەروەکو خـوای گـەورە لـە قورئانـــدا ئەفـــەرموێت ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾ سوورەتی المؤمنون: ١١٥ واتە : ئایـە گومانتـان وا دەبـرد کـە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست درووست کردووە و ئێوە بۆلای ئێمە ناهێنرێنـەوە وەناگەڕێنـەوە ؟) یـان ئـەوەتا هەنـدێ گومانیـان وایـە کـە ناگەڕێنـەوە بـۆلای خـوای گـەورە وەیـان گومانیـان وایـە هەنـدێ لـە بـێ باوەڕەکان کە ساغ نابنەوەو زیندوو ناکرێنەوە بـەلام خـەیاڵیان خـاوە بـێ ئاگان لە بارەی (حوکمی) خوداو ئا لـە وەلامـی ئـەو جـۆرە کەسانەدا کـە دەڵێن کێ ئەتوانێ ئەو ئێسقانانە کـە دەڕزن و دەبنـەوە بـە خـاك و خـۆڵ چۆن خـوا ئـەتوانێ زینـدوویان بکاتـەوە ﴿ مَن يُحْيِ الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴾ سوورەتی یس: ٧٨ واتە: بێ باوەڕەکـان ئـەیان گـووت کـێ ئـەم ئێـسکانە زیندوو دەکاتەوە لـە کاتێکدا کـە ڕزیـوو پرتوکـاون ؟!) ﴿ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ ســوورەتی یــس: ٧٩ واتـــە : پێیانبڵێ ئەو زاتەی کە یەکەم جار درووستی کـردو هـەر ئـەویش زینـدووی دەکاتەوە ، ئەو بە هەموو دروست کراوێك زانـاو ئاگایـە (درووسـت کـردن و درووست کردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە[1]،چوونکە بێگومان یەکێ لـە

(1) جا بێگومان ئەو کەسە زیندوویان دەکاتەوە کە لە ئەوەلەوە لە خاك درووستی کردوون خۆ زیندوو کردنەوەو درووست کردنەوەیان زۆر ئاسانترە لە جاری یەکەم کە لە نەبوونی درووستی کردووە .

بنچینەکانی بیرو باوەڕی ئیسلام وە هەروەها یـەکێ لـە پایـەکانی ئیمـان و باوەڕ ئەوەیە کە بڕوایەکی پتەوت هەبێ بەوەی کە خوای گـەورە لـە ڕۆژی دوایی گشت درووست کراوەکـانی زینـدوو دەکاتـەوە لـە دوای مردنیـان وە هـەروەها گـشت ئەندامـەکانیان کـۆ دەکاتـەوە دوای بـڵاو بوونـەوەیان وە گیانیان بۆ دەگێڕێتەوە دوای گیان لێ دەرچوونیان وە پێشتر لە دونیا چۆن بـووە ئاوایـان لێ دەکاتــەوە هــەروەکو خــوای گــەورە لـــەم ئایەتـــەدا ئەفەرموێ﴿ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ٢٩، واتـە: هەرچـۆنی درووست کردوون لە سەرەتاوە لە ئایندەشدا بۆلای ئـەو دەگەڕێنـەوە، جـا بێگومـان دەلیـل و بەڵگـەی عـەقلیش زۆرن لەسـەر زیندووبوونـەوەی ڕۆژی (قیامەت)، واتە دوایی و جایەکێ لەم (دەلیل) و بەڵگانە زانایان ئەفەرموون ئەمەش دەقەکەیەتی کە ئەڵێن : ((وَمنْ الأدلة العَقْلية عَلى أحياء المَوتَى فِي القُبور أمرُ النّائم فإنَهُ يَرى فِي مَنامه حَيَةٌ عَظيمةٌ تَلدَغه وَهوَ يتألَم بذَلكَ حَتّى يَرَى فِي نَومه يَصحُ وَ يَنزَعجُ عَن مَكانه وَيتأذى كَما يَتأذى اليقظان وَأنتَ ترى ظاهرة ساكنا ولا ترى في حوله حية والحالُ أن الحية موجودةٌ في حَقه وَالعَذابُ حاصلٌ وَلاكنَ فِي حَقكَ غَير مُشاهدٌ)) واتە : یەکێك لەوانە کە بەڵگـەو دەلیلـە لەسەر زیندوو بوونەوە لە ناوگۆڕدا خەونی ئینـسانی نووسـتوە لـە خەویـدا (مارێکی) زۆر گەورە پێی وەدەدا و ناڕەحەتی دەکا دەست بە هاوار هـاوار دەکا و لە خۆی دەداو ئینجا لەترسان ڕادەکاو هەروەکو ئینسانی بەخەبـەر هەر لەوکاتەدا کە ئەو ئەوخەونە ئەبینێ جەماعەتیٚ لە دەوری دابنیشن نە مار دەبینن نە دەزانن کە ئەو لە خەودا عەزاب دراوە نـە دەبیـنن حەرەکـە بکاو بجولێ .

## (ئاگاداریەکی گرنك)

جا هەروەها بێگومان ئادەمیزاد پێویستە بیر بکاتەوە لە حاڵی خۆی چوونکە بەبێ هودەوبەلاش درووست نەکراوە هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد) بەڵکو خاوەنی بەرنامەیە و (مەسئولە) و واتە بەرپرسیارە لەبەردەم دادگایی پەروەردگاری هەق و ماف خودا هەروەکو خوای گەورە لەم چەند ئایەتەدا کە لە قورئاندا ئاماژەی کردووە لە سورەتی القیامەدا ئەفەرموێت﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴾ سوورەتی القیامة: ٣٦ واتە : ئادەمیزاد وا دەزانێ وازی لێ دەهێنرێ بەپشتگوێ خراوی و زیندوو ناکرێتەوەو پاداشت و تۆڵەی نییە ؟!) وە ئەفەرموێ ﴿ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِىٍّ يُمْنَىٰ ﴾ سوورەتی القیامة: ٣٧واتە ئایە ئەو نوتفەو ئاوێك کەم نەبوو لە مەنی پیاو دەرێژرایەناو منداڵدانەوە ؟ ئەی بۆچی وازوو گۆڕا ؟! ﴿ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴾ سوورەتی القیامة: ٣٨ واتە دوایی بووە خوێنێکی مەییو خۆ هەڵواسراوە وەك زەڕوو ئینجا خوا درووستی کردولە جوانترین شێوە ڕێکی خست و گەشەی کردو ڕۆح وەبەرکردو زۆر بە ڕێك و پێکی لە جوانترین وێنەدا بەدی هێنا دە بۆ بیرناکاتەوە؟﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴾ سوورەتی القیامة: ٣٩ واتە هەر لەو دڵۆپە ئاوە جووتێ نێرو مێ (کوڕو کچ) بەدی هێناوە بەدەسەڵاتی خۆی جا بێگومان کەسێك ئاوا درووست کرابێت چۆن یەکەم درووست کەری ئەو ناتوانێت بۆ جارێکی تر زیندوی بکاتەوە وەك ئەفەرموێ ﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾

سوورەتی القیامة: ٤٠ واتە ئایە خوایەکی بالاّ دەستی وا ناتوانیّ بۆ جاریّکی تر مردووەکانزیندووبکاتەوە؟ دیارەدەسلاّتی هەیە بەسەر هەموو شتیّکدا ئینجا پیّغەمبەریش (ﷺ) لە وەلاّمدائەیفەرموو (سُبحانَكَ أللّهُمَ بَلى) رواه أبو داود و أحمد ، واتە : پاك و بیّگەردی بۆتۆ خوایە بەلّیّ توانا و دەسەلاّتداری هەر لایەقی تۆیە چوونکە ئەو بەلگەو دەلیلانە رۆن وئاشکرانە لەسەر دەسەلاّتی تۆ .

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا هەروەها ئەگەر ئیسنان بیر بکاتەوە لە درووست بوونی خۆی زۆر بەباشی دەیسەلمیّنیّ کە هەر ئەو خوایە دەتوانیّ جاریّکی تریش گیانت بکاتەوە بەبەر یا بەلّکو لەجاری یەکەمدرووست کردنەوەی ئاسانترە وەك خوای گەورە لە قورئاندا بۆمان بەیان ئەکا و ئەفەرمویّت ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾ سوورەتی الروم: ٢٧واتە ئەو خوایە لەسەرەتاوە گشت خەلّکی درووست کردوو بەدی دیّنیّ لە پاشان دوای مردن و تیاچوون وەك خۆی لیّ دەکاتەوە وەزیندووی دەکاتەوە ﴿ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ ﴾سوورەتی الروم: ٢٧ واتە : ئەوەش بۆ ئەو ئاسانتریشە لە جاری یەکەم چوونکە جاری دووەم لەسەر بنەڕەت و بناغەیەك درووستی ئەکاتەوە دیارە ئەم ئاسانی و نائاسانیە بەپیّی توانا و ژیری مرۆڤە ئەگەر نا هەموو شتیّك بۆ خوا وەك یەکە بۆیە ئەفەرمویّ ﴿ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾واتە مەسەلەو وەصفی هەرەبەرز لە

ئاسمانــەکان و زەویــدا هــەر شــایانی ئــەوە ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ سوورەتی الروم: ٢٧ واتە ئەویشە دەسەلأتدارو کار جوان .

**( سەرنجێك )**

بۆچ دەڵێن (الیوم الآخر – واتە ڕۆژی دوایی ؟!) چوونکە بێگومان هـەر کەشێك بمرێ ئەوا ژیانی دونیای کۆتایی پێ دێ هەروەها ئەم ئینسانە پـێ ئەنێتە ژیانێکی تر کـە پێـی ئـەگوترێ ژیـانی ڕۆژی دوایـی ، کەواتـە ڕۆژی دوایی (الیوم الآخر) چوونکە لە مردنـەوە دەسـت پـێ ئـەکات ئـەوجا بزانـە ئەوژیانەی ڕۆژی دوایی دوو قۆناغە :

یەکەم) زیندوو بوونەوەی ناو (قەبر) واتە (گۆڕ) دوای مردن جاهەروەها لـە (حەدیـسدا) هـاتووە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی (إنَ القَـبرَ أولَ مَنازِلِ الآخِرة فإن نَجا مِنهُ فَما بَعدَهُ أيسَر مِنهُ وَإن لم يَـنجَح مِنـهُ فَمـا بَعـدَهُ أشَدُ مِنهُ) رواه الترمذي عَن عثمان بن عفان (رضي الله عنه) واتە: بەڕاستی گـۆڕ لـە دوای مـردن یەکـەم قۆنـاغی هوارگـەکانی ڕۆژی دواییـە ئەگـەر موسڵمانێ لەم قۆناغە ڕزگـار ببـێ هـەروەها لەقۆناغـەکانی تـر بـە سـەهلی ڕزگاری ئەبێ بەلأم ئەگەر ڕزگاری نەبێ ئـەوا لـە قۆناغـەکانی تـر توند تـر گرفتار ئەبێ [1] خوای گەورە بمان پارێزێ بە لوتف و گەورەیی خۆی .

(1) ئەوجا بزانەلەم زیندووبونەوەدا جیاوازی نییە مردووەکە نێژرابێ یا نەنێژرابێ ، یان سوتێنرابێ یان کوژرابێ و یان پارچە پارچە کرابێ وە یان لەسەر زەوی فڕێدرابێ ..هتد).بڕوانە ئەم پەرتوکانەش شەرحی(عەقیدەی نەسەفی) یا شرح عقیدە الطحاویی/ یان (نثر اللؤلؤي) و/ یان (جمع الجوامع) ی/ ئیمامی سبکي و) .

دووەم) زیندوو بوونەوەی (قیامەت) کە بە (نفخ الصور) دووەم دەست پێدەکات بەڵام ئەم ژیانەی دوای مردن تا زیندوو بوونەوەی (قیامەت) پێی ئەگوترێ (بەرزەخ) واتە (مەرحەلە) ی نێوان دونیاو زیندووبوونەوەی قیامەت ، چونکە خوایە گەورە ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە وە ئەفەرموێت ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ سوورەتی المؤمنون: ١٠٠ واتە : لەبەردەم ئەو مردوانە پەردەیەك هەیە تا ئەو ڕۆژەی زیندوو ئەکرێنەوە (قالَ إبن كثير في تفسيره : قالَ مُجاهِد (البَرزَخُ الحاجِزُ ما بينَ الدّنيا والآخرة) واتە ئیبن کەثیر لە تەفسیرەکەیدا و لە(موجاهیدی) وەرگرتووە ئەڵێ بەرزەخ (حاجیزە) لە بەینی دونیاو قەیامەت (قالَ بَعضُ المُفَسِّرين البَرزَخ المَقابِرُ لاَ هُمَ في الدّنيا وَلاهُم في الآخِرة فهم مُقيمُون إلى يوم يُبْعَثُون) ، واتە: هەندێکی تر لە موفەسیرەکان ئەڵێن واتە پاش مردن حالەتی بەرزەخ یان دێ ئەویش نەوەك حالەتی قیامەتا پاداش و تۆڵە وەرگرن نەوەك باری دونیاشە تا خۆراك و ئیسراحەتی هەبێ).

## (باسێك لە ژیانی بەرزەخ واتە ژیانی ناو گۆڕ)

جا هەروەها بێگومان لە هەموو مەنتیقەو واتە کیشوەرو ناوچەو شارو دێهاتەکانی جیهان لە هەموو ژێنگەیەکی کۆمەڵایەتی خەڵك لە هەموو جێگایەك کۆمەڵی مرۆڤی لێ دەژی ، لە ڕووبەرێکی دابڕاو لە ئاوایی و شوێنێکی تایبەتی یان تەرخان کردووە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی بەشی ژیانیان تەواو دەبێ و دەمرن بۆ ئەوەی بگوازرێنەوەو چاڵێ هەڵبکەنن و جەستەکەی لەناودا بنێژن ، ئەم شوێنە لەلای ئێمە پێی دەڵێن گۆڕستان یا

(قەبرستان) ئینجا گۆڕستان ووشەیەکی سامناکە چوونکە خۆی شوێنگەی کۆبوونەوەی شتێکی سامناکترە کە گۆڕە کاتێ بەناویدا تێدەپەڕین کش و ماتە دەنگ و هەراو هۆریاو دونیای لێ نییە مەگەر خشەخشی قاچەکانمان چریکەی چۆلەکەو باڵندەکان نەبێ بەلاَم لەڕاستیدا ئەمە هەر لەلای سەرەوەدایە لەخوارەوە جیهانێکی زۆر فراوانترە وەك لەوەی ئێمە پێشبینی دەکەین جیهانێکە زیندوو وەکو جیهانی دونیا مردووەکان لەژێرخاکدا هەندێکیان گەلێ شادومانن لەخۆشی داینەو کەیفیان هەیە بەلاَم هەندێکی تریان دڵتەنگن حاڵیان گەلێ شڕە ئازارێکی گەلێ زۆریان لەسەر پشتە ، قیژەو ناڵەو هاوارێکی زۆریان لێوەدێ بەلاَم چی یە ؟ ئەوەیە خوای گەورە لە فەزڵ و بەزەیی خۆی بۆ ئێمە نەیهێشتووە ئەم قیژەو هەرایەمان بەر گوێ بکەوێ هەر ڕۆژەی چەندەها کەس لەخەڵکی دێ وشارەکەمان ڕەوانەی ئەم شوێنەو یەکێ لە چاڵەکانی دەکەین و سەری لێ دادەخەین بەلاَم ئێمە هەرئەوەندەی لێ دەزانین کە چاڵێك قوڵەو هیچی تر نابینین لەوانەی کە بەسەر مردووەکە دادێ دوای ئەوەی کە خۆمان دەگەڕێینەوە ئەو بەتەنیایی لەوێ بەجێ دەهێڵین).

جا هەروەها بێگومان ڕۆژێ چەندەها کەس بەڕێ دەکەین و بن خاکیان دەخەین ، بەلاَم هەرگیز بیرمان بۆ ئەوە ناچێ کە ڕۆژێ دێ کەسانێکیش ئێمەی بۆ بەڕێ دەکەن و بەتەنیای لەوێ بەجێمان دەهێڵن ئەوەیە (حاڵی دونیا) ، جا هەروەها لە ڕاستیدا ئەم گۆڕە دەبێ هەموو کەسێکی بچێتە ناوی چ سەرۆك کۆمارو پاشا بێ چ گەدا یان هاوولاَتیەکی (سادە) بێ وە من وتۆش ڕۆژێکمان لەپێشە و ئەبێ ڕاسپاردەی ئەو خاکە بکرێینەوە وە

دەرگای دونیامان لەسەر دابخەن ، بەڵێ ئەم چاڵە تەنگە ئەم چاڵە تاریك و ناخۆش و ترسناکە کە ماڵی (حەقیقیمانە) خاکمان بەسەر جا ئەم چاڵە تاریکە جێگامانەو ماوەیەکی دوورو درێژ تەنیا ئەمێنینەوە ، چوونکە ئینسان کە ئەمرێ و لە ژیانی ئەم جیهانە دەچێتە دەرەوە ئەوا لە ڕستیدا دەچێتە جیهان و ژیانێکی تر کەپێی دەڵێن ژیانی (بەرزەخ) چوونکە بێگومان ئەوەی ڕاست بێت مرۆڤ بەسێ ژیان دا دەڕوات :

١) ژیانی دونیا کە ئێستا لەناویدایە .

٢) ژیانی بەرزەخکە دوای ژیانی دونیاو مردنی مرۆڤەکە دەست پێدەکات .

٣) ژیانی دوایی کە لەدوای هەڵسانی قیامەت و زیندوو کردنەوەی بوونەوەرەکان دەست پێدەکات کەواتە ژنیانی بەرزەخ دەکەوێتە نێوان ژیانی دونیاو ژیانی دوایی) هەزار ڕەحمەت لەو کەسەی کە ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئەمەبەرزەخە تا وەختی مەحشەر | ئەوجا (میعادە) تۆ بکە باوەڕ |
| ئەعضا دێتەوە لەگۆشت و پیشە | خوێن و پیست و موو هەم ڕەگ و ڕیشە |
| وەك لە دونیادا (جەمع) ئەبین یەکجار | ئەچین بۆ مەحشەر بە ئەمری قەهھار) |

## (قەبر واتە گۆڕ چی یە ؟)

قەبر واتە گۆڕ ئەو ماڵەی ئادەمیزادەکە دوای مەرگ بۆی دەگوازرێتەوە ئەو جێگایەیە کە ئینسان چۆن کاتی خۆی بە ڕووتی هاتە سەر دونیا ئاوا دەچێتە ناو بەرگی (کفن) و چی تر نییە ، ئەو جێگایەیە کە گیانداران لە کرم و دووپشك و ماروو مێروولە بە ئارەزووی خۆیان جەستەی مرۆڤەکەی

نـاوی دەخەنــە بەرچــەنگ خـۆراکی خۆیــان (قــەبر) ئــەو جێگەیەیــە کــە ئادەمیزاد تیایدا ئەبێتەوە خاك و خۆڵ ئەم خانووە وەکو هـی دونیـا نییـە هی دونیا لەسەر خاکە بەڵام ئەمەیان چەند مەترێ لەژێرخاکە ، هـی دونیـا فراوانەو بە ئاسانی لەناوی دەگەڕێ کەچی ئەمە تەنگ و تاریکە بـەڵام هـی دونیا ڕووناکە لە دونیا لەسەر ڕایەخی پەمۆ دەخـەوی بـەڵام لـەوێ لەسـەر خـۆڵ و خـاك بـەبێ سـەرین درێـژ کـراوی ، ئیمـامی (طـبرانـی) لـە ئـەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە ئـەڵێ جارێـك لەگـەڵ پێغەمبـەردا (صـلی الله علیـە وسلم) بووین بۆ بەڕێکردنی تـەرمێك دەرچـووین لەسـەر گۆڕێـك دانیـشت و فەرمووی (ما يأتي عَلى هَذا القَبر يَومٌ إلا وَهوَ يُنادي بصوتٍ ذلق يا إبـن آدم نسيْتني أَلَم تَعلَم إني بَيتُ الوحدَةِ وَأَنا بيتُ الغُربَةِ وَأنا بيت الوَحشة وَانا بيتُ الدود وَبيتُ الَضيّق إلا مـن وَسَـعي الله عليـه) واتـە هـەر ڕۆژێ بەسـەر ئـەم گۆڕەدا دادێ بەدەنگێکی زوڵاڵی گەورە دەڵێ هۆ ئادەمیزاد منت لەیاد چوو ؟ ئایە نـەت دەزانـی مـن خـانووی تـەنیایی و خـانووی نامۆیی و خـانووی تاریکی و خانووی کرم و مارو مورم ئەمن خانووی تـەنگیم بـۆ کەسـێك کـە خوا بۆی فراوان کردبم ؟ ئینجا فەرمووی (القَبرُ إمّا رَوضةٌ مِن ريـاض الجَنـة وَإما حُفرةٌ مِن حُفَر النار[1] جا هەروەها بێگومان ئەوکاتەی دەتبەن بـۆ نـاو قەبر واتەگۆڕی تەنگ و تاریك و بەتـەنیایی شـۆڕت دەکەنـەوە نـاوی وەبـە ڕووت و قـووتی وەك لـە سـکی دایکـت هاتیـە دەرەوە ئاوایـە چـۆن بـووی هەمان شت ئاوا دەگەڕێتەوە ناو سکی ئـەم خاکـە هـاوار لـەخۆمان ڕۆو بـە

---

(1) ئەمە لەپێشتر تەخریج و تەرجەمە (کراوە) پێویست بە دووبارە ناکاتەوە بڕوانەپەرتووکی (الترغيب والترهيب) دانراوی (الحافظ المنذري) ج٤، لاپەڕە ٢٣٨.

ڕووت و قووتی تەنها ئەو دووسێ مەترە کفن و چاوپانەی کە تیایدا لـوول دراوی بەس ئەوجا خوای گەورە ئاماژەی ئەمەی کردووە لـە قورئانـدا وەك ئەفـــــەرمویێت ﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ ســــــوورەتی الأنعـام: ٩٤ واتـە بێگومـان بەتـەنیایی بۆلامـان دێنـەوە و ئەگەڕێنـەوە هــەروەك چــۆن جـاری یەکــەم خــەلقمان کردبــوون ئـاوا)، پێغەمبــەری خۆشەویستمان ئەفەرمویێت (يَتْبِعُ المَيِّت ثَلاثـةٌ فَيَرجَـع إِثنـان وَيَبقـى مَعَـهُ واحِدٌ يَتبعهُ أهله وماله وَعَمَلهُ فَيَرجَع أهلَهُ وَمالَهُ وَيَبقى عَمَلَهُ) متفـق عليـه ، واتە : سێ شت دوای مردوو دەکەوێ تا سەر لێـواری گـۆڕ لەگـەڵی دەچـن بەڵام لەوێ دوانیان دەگەڕێنـەوە یـەکێکیان لەگـەڵی دەمینێتـەوە کـەس و کارو کردەوەکانی لەگەڵ دەچن بەڵام کەس و کـاروماڵەکـەی دەگەڕێنـەوە وە تــەنها کردەوەکــانی لەگــەڵی دەمینێتــەوە بــەڵی تــەنها عەمــەل و کردەوەکانت بۆ خوارەوە لەگەڵت شۆڕ دەبنەوە نـاو گۆڕەکـەت ، چوونکە پاشان گۆڕەکەت ئەگەر بە عەمەل و کردەوەی چاك ئەنجام دابێ بەڵێ ئەوا قەبرەکەت فراوان ئەبێ گوشادئەبێ و ئەگـەرنا بـەخوای گۆڕەکـەت لەسـەر دادەخەن چارەنووست دیار دەکـا ئایەلەخۆشـی دا دەبـی یـان ناخۆشـی ، ئـەوەی مـاڵ و سـامانێکیزۆری لـەدوا بـەجێ بمینـێ ئـەوا کەسـانێکی تـر دەستی بەسەر دادەگرن وە دەبیتە هی ئەوان جا خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرمویــــچت ﴿ كَمْ تَرَكُوا مِن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا فِيهَا فَاكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ سوورەتی الدخان: ٢٥ — ٢٩

واته : چەندین باخات و کشتوکاڵ و ڕەزو باخ و سوکناو قەصرو قصورو خانووی خۆش گوزەرانیان بەجێ هێشت کە تیایدا بەخۆشی ڕایان دەبوارد ،ئینجا نەتەوەیەکی دیکەمان کردە (میراتگر بۆ ئەمبەخششانە) خۆ نە خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی بۆیان گریان نە دواش خران لەو کاتەی بۆیان دانرابوو ، وەساتێکیش مۆڵەت نەدران و دوانەخران بۆ کاتێکی تر بەڵکو بەپەلە سزا دران[1] .

## (گۆڕمو شار گوشینی گۆڕ)

جا هەروەها بێگومان هەروەك لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر دا (ﷺ) هاتووە : مردوو دوای ئەوەی لەناو گۆڕ دەنرێ گۆڕەوشار دەکرێ واتە گۆڕەکەی وێك دێتەوەپاڵە پەستۆیەکی زۆر دەخاتە سەر جەستەی مردووەکە ئینجا وەکو خۆی لێ دێتەوە (عَن إبن عُمَر (رضي الله عنهما) عَن النبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ هذا الذي تحرك له العرش وَفُتِحَت لَهُ أبوابُ السَماء وَشَهَدَهُ سَبعونَ ألفاً مِنَ الملائيكة لَقَد ضُمَ ضمة ثُمَ فرج عَنهُ) رواه النسائي، واته : ئیبن و عومەر (خودا لێیان ڕازی بێت) گووتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئا ئەمە (سەعدی کوڕی موعاذە) کە بارەگای خودا بۆی هاتەهەژان و کەیفو خرۆش و دەرگاکانی ئاسمانی بۆ خرانە سەر پشت (حەفتا هەزار) فریشتە هاتنە دیدەنی و دیاری لەکاتی سەرەمەرگیا لەماتی بەڕی کردنی تەرمەکەیدا ئەم (سەعدە) کە ئەمەپایەکەیتی لەلای

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (لەژیانی دونیا تا ڕۆژی دوایی) دانەر ناوی خۆی نەنوسیوە (خوا ئەجرو پاداشتی بداتەوە) لاپەرشە ١٢٠.

خودا لەگەڵ ئەوەشا گۆڕەو شارێکی وەهادرا کە پەراسوی ڕاست وچەپی تك پەڕاند لەپاشا قوتاری بوو چوونکە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا ئەفەرموێت (لَونَجا مِن ضَمة القبر أحَدٌ لَنَجا سَعدُ بن معاذ ولقد ضّم ضمة ثُمَ ارخي عنه رواه الترمذي والطبراني والبيهقي ، واتە : ئەگەر کەس لە گۆڕەوشار قوتاری ببوایە ئەوا سەعدی کوڕی مەعاذیش قوتاری ئەبوو بەڵام ئەویش گۆڕەو شار کراو پاشان قوتاری بوو .

**( ئاگادارییەك )**

جا هەروەها بێگومان لەسەرچاوە باوەڕ پێکراوەکاندا ئەڵێ گۆڕەوشاری ئیماندار گەلێ ساناو سوکترو بێ ئازارتر دەبێ لە هی (کافر) و دوو ڕووەکان ، هەروەکو لە (حەدیسدا) بەیان کراوە وە ڕوونکراوەتەوە . هەزار ڕەحمەت لەوەبێ کە فەرموویەتی :

بۆ مردوو دێتۆ لە قەبر حەیات — یَدري الحَسَنات مع السيئات

نەکیرو مونکەر زۆر بە ئیستیعجال — نازل دەبنە لای لێی دەکەن سؤال

خودات و ڕەسوڵت ئیمانت دینت — کێ یەو کامەیە ؟ چیی یە ئایینت؟

گەر جوابی داوە ئازاو ئامادە — فوراً قەبرەکەی دەبێ گوشادە

دەبینی بەچاو بەعەقڵ و بەهۆش — جێی خۆی لەبەهەشت زۆر شیرین و خۆش

ئەگەر نەتوانی بەیان کا جەواب — لێی ئەدەن بە گورزەی ئامادەی عەزاب

غەیری جین و ئینس دەنگی ئەژنەوی — فوراً بێ غایەت قەبری تەنگ ئەوی

پالووی ڕاست و چەپ ئەچن بەیەکدا — جێی خۆی دەبینی لە جەهەنەمدا

بەعەزابی سەخت بەڵاو نەدامەت — گرفتار ئەبێ هەتا قیامەت

## (باسێك له سزاو عەزابی قەبرو پرساری فریشتەكان لەناو گۆڕا)

جا هەروەها زۆربەی سەرچاوە باوەڕ پێكراوو (كتێبە) عەقیدەییەكان ئەڵێن (وَسؤالُ مُنكَر و نكرٍ في قَبرهِ عَن ربِهِ ودِينه ونَبيه) واتە: ئەبێ باوەڕمان وابێ بەپرسیاركردنی مونكەر و نەكیر) واتە : دوو فریشتە ناو گۆڕەكە پرسیار ئەكەن لە مردوو خوای وی كێیەو ئایینی چی یە ؟ وە پێغەمبەری كێ یە ؟ هتد....(عَلىَ ما جاءت به الأخبار عَن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) واتە : بەدەڵیلو بەڵگە چەند فەرموودەیێ (صحيح) كەلە پێغەمبەرەوە هاتووە (ﷺ) (وَمنَ الصَحابَة رضوان الله تعالى عليهم أجمَعين وەلە سەحابیەكانیشەوە هاتووە (ڕەزاو ڕەحمەت خوایان لێبێت) گوتراوە عەزابی قەبر هەقەو گومانی تێدانیە چوونكە پێغەمبەر (ﷺ) لەزۆربەی دوعایەكانی ئەپارێتەوە و ئەیفەرموو : (اللهُمَ إني أعوذُ بكَ مِن عَذاب القَبر) متفق عليه/ واتە:خوایە خۆم ئەپارێزم بەتۆ لەئازاری ناوگۆڕ ، جا هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) له حەدیسێك فەرموویەتی (إذا قُبرَ الميتُ أتاه مَلَكان أسوَدانِ أزرقانِ يُقال لإحَدهما المُنكر وللآخر النكير ... الحديثُ بطوله) ، رواه ابن حبان والترمذي وَقالَ حَديثٌ حسن) ، واتە كاتێ مردوو خرایە ناو گۆڕ (خاكی بەسەردا كرا) ئینجا دوو فریشتەی ڕەش و شین دێنە لای یەكێكیان پێی ئەگوترێ (منكر) وە ئەوەی تریان پێی ئەگوترێ (نكير) تا كۆتایی (حەدیسەكە) بە درێژایی و جا (قەبر) واتە گۆڕ یا ژیانی بەرزەخ دوای مردن یان (روضة من رياض الجَنة) واتە یا باغێكە لە باغەكانی بەهەشت بۆ پیاوچاكان (أو حفرَةٌ منْ حُفَر النيران) واتە یان خەندەقێكە لە خەندەقەكانی ئاگر بۆ پیاو خراپان ، هەروەكو حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (إنّما القَبرُ رَوضةٌ مِن رياض الجَنة أوْ حُفرةٌ مِنْ حُفَر النارِ) رواه الترمذي وَقالَ حَسَن غريبٌ)

## (دوو ئاگاداری)

یەکەم) زۆر لە زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەفەرموون پرسیارو ئازاری گۆڕ بۆ گیان و لاشەی مردووەکەیە چوونکە ئەفەرموون ئازاردانە ئازاری بەرزەخە وە هەر کەسێ (موستەحەقی) سزادان بێ بەشی خۆی لەم ئازارە ئەگاتێ ئینجا جیاوازی نییە نێژرابیتە ناو گۆڕ یان درندە خواردبیەتی یان سووتابێ تا ئەبێتە خۆڵەمێش یان لە قەنارە درابێ یان لە دەریادا خنکابێ هەموو ئەوانە گیان و لاشەکەیان ئازار ئەبینێ [1] .

دووەم) مەبەستی ئەم فەرمودانەی پێشوو ئەوەیە لاشەیەکی بەرزەخی یە ئێمەش چۆنیەتی ئەم لاشەیە نازانین چوونکە جگە لەچەند جۆرە کەسێك بەزۆری وا ڕوو ئەدا لاشەی دونیا نامێنێ بەهۆی سووتان یا ڕزین و بوونەوەی بە خاك و خۆڵ ...هتد. تا ڕۆژی قیامەتیش درووست ناکرێتەوە چوونکە هەموو ئەندامەکانی ئەبن بە خاك و ڕزی ئەبێ مەگەر کلێنجە نەبێ و ئەو ناڕزێ ئینسان لەوەوە ئەڕوێ .

## (باسێك لە کلێنجە /عَجَبُ الذنب)

جا هەروەها بێگومان تەنها بەشێکی بچووك نەبێ و ناڕزێ و کە پێی دەڵێن (عَجُب الذنب) واتە سەری ئێسکی کەلێنجە کە بریتیە لەو تۆوەی یەکەم جار مرۆڤی لێ درووست بووە و لە باوکە ئادەمەوە هاتووە ئەم بەشە خاك نایخوات و وقەت ناڕزێ بە ئەمری خودا وەك پێغەمبەر (ﷺ)

---

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (شرح الطحاوية) ، (لأبن أبي العز) ، لاپەڕە ٥٧٩ ، بەرگی دووەم ، چاپی بەیروت.

فەرموویەتی (كُلُ بني آدم ياكلُهُ التراب إلا عجبُ الذنبِ منهُ خلق وفيه يَركبُ) مُتَفق عليه/ واتە هەموو جەستەی بەنی ئادەم خاك و خۆڵ دەیخوا تەنها سەری ئێسکی (کلێنجەکە) نەبێ کە لێیەوە درووست کراوە و لێیەوە پێك دەهێنرێتەوە) وە هەروەها هەندێ لە زانایان ئەفەرموون ڕووحەکەش بۆ ئەو جێگایە دەردەچێ کە خوا بیەوێ تا ڕۆژی قیامەت چوونکە لەکاتی زیندوو کردنەوەی ڕۆژی قیامەتیش ئەم سێ بەشە بۆ جاری دووەم کۆدەبنەوە کاتێ زیندوو کردنەوە هات بارانێك لە ئاسمان دەبارێت و بنچینەکەی سەری کلێنجەکە پێی دەڕوێتەوە و شین ئەبێتەوە چوونکە نەڕزیوە وەکو لە حەدیسدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ثُمَ يُنزِلُ مِنَ السَماء ماءً فَيَبنتُونَ كَما يَنبُتُ البقل ولَيس مِن الإنسان شيءٌ إلا يُبْلىَ إلا عَظماً واحداً وَهوَ عجبُ الذنْبِ منهُ يُركَبُ الخَلق يَومَ القيامة) رواه البخاري ومسلم ، واتە : پاشان خوای گەورە بارانێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت ئیتر وەکو وپاقلە دەڕوێن ، شین ئەبنەوە ، وە هیچ جێگایەك نییە لە ئینسان نەڕزێ ئێسقانێك نەبێ کە کلێچکەیە وە خەڵك لەوەدا پێك دەهێنرێتەوە لە ڕۆژی قیامەت واتە دوایی .

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها گوێگرە بەڕێزەکانم ئەوەی لە دونیاش ڕوو ئەدات هەر لەمە دەچێ تۆ بزانە دەبینی دارو بەردەکان لە ئەرزو تەنیا تۆوەکانیان نەبێ لە ژێر خاك و لەنێو بەردا دەبن وە بەچاو نابینرێن کە باران دەبارێ ئەو تۆوانە دەڕوێن و دارو بارو ڕووەکەکان پەیدا ئەبن هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی ﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ

ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَاۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾ سـوورەتی الـروم: ١٩، واتــه : خـوا زینـدوو لـه مـردوو دەردەهێنـێ وه مـردووش لـه زینـدوو دەردەهێنـێ وه زەویش لەدوای ئـەوەی گیـاو گۆرەکـەی ووشـك ئـەبێ دەمـرێ ئینجـا خـوا دەیژیێنێتەوەو، وه به ڕوواندنی جۆره ها ڕووەك له کشتوکاڵ و له سەریدا وه هەر بەم شێوەیەش ئێوه زینـدوو دەکرێنـەوه وه لـه گۆڕەکانتـان دێنـه دەرەوه ، هــەروەها هــاتووه لــه فەرموودەیەکـدا پیاوێــك پرســیاری لــه پێغەمبەری خوا کرد (ﷺ) لەم بارەیەوه ووتی پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیه وسلم) خودا چۆن خەڵکی زیندو دەکاتەوه وه بەڵگه بۆ ئەمه چی یه؟ ئەویش له وەڵامی ئەو پیاوه فەرمووی : (أَمَا مَرَرْتَ بوادي قومِكَ جُدْباً ثُـمَ مَرَرْتُ بهِ حضراً ، قالَ فَتِلْكَ آيَةُ الله في خلقهِ كَذلِكَ يُحيي المَوْتى) رواه أحمد، واته: قەت بەلای دۆڵی خەڵکی لای خۆتان دانه ڕۆیشتی له کاتی بێ بارانی، فەرمووی جا ئەمیه بەڵگەی خوا لـه درووسـت کراوانـی خـوا بـەم شـێوەیه مـردووان زینـدوو دەکاتــەوه ، جـا کـه ســەر کلێنجەکـه لـه خاکـدا ڕوا وه جەستەکه درووست بۆوه ئینجـا هــەر (ڕۆحێـك) دەچێتەوه نـاو جەسـتەی خــۆی هــەر بۆیەشــه خــوای گــەوره فەرموویــەتی ﴿ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴾ سوورەتی التكوير: ٧ واته وه دەمێك که هەموو ڕوحەکـه جـووت کرایـەوه لەگەڵ جەستەیا بەم شێوه دەبینین مرۆڤ چۆن جاری یەکەم درووست بووه ئاواش بۆ جاری دووەم درووست دەبێتەوه).

أقولُ قَولي هذا وَأستغفر الله لي ولَكُم وَلِسائر المؤمنين ، نَبَهني اللهُ وَإياكُم مِن نَومَةِ الغَافلِينَ وَحَشَرَني وَأياكُم تَحْتَ لِواءِ سَيدِ المَرسلينَ ، اللهُمَ إغفر لَنـا آمين).

# ئامۆژگاری چل و چوارەم

## باسی تێك چوونی دونیاو زیندوو بوونەوەی عالەم له دوارۆژدا

الحَمْدُ لله ثُمَ الحَمْدُ لله ما تَوفيقي ولاْ إعتصاميةَ إلاّ بالله عليهِ توَكلْتُ وَاليهِ أنيب وَ أشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ يقول الله تبارك وَتعالى: ﴿ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوۡمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾ سوورەتی المطففین: ٤ – ٦ وَ أشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمَداً عَبدَهُ وَ رَسولهُ سَيدِ الأولين والآخرين والصلاة والسلام على سيدنا محمد (صلى الله عليه وسلم) وعلى آله وأصحابه أجمعين ومن تَبِعَهُم بإحسانٍ إلى يوم الدين) أمّا بَعدُ أيّها المُسلِمُون أوْصيكُم عِبادَ الله أولاً بتقوا الله وكُثرةِ مَخافتهِ في جَميعِ أوْقاتكم) واته: پاش هەندێ ئەی برا موسڵمانەکان یەکەم جار وەسیەتتان لێ دەکەم بە تەقوای خواو بە ترسانێکی زۆر لە هەموو کات و ساتێکدا ، چوونکه خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٌ ﴾ سوورەتی الحج: ١ واته ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن چوونکه بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی (الکون) واتە بوونەوەر بێگومان کارەساتێکی زۆر گەورەیە و ڕووداوێکی سامناکه ﴿ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ

حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ

﴾ سوورەتی الحج: ٢، واتە لەو ڕۆژەدا کارەساتەکە دەبینن هەموو شیر دەرێك لە شیرەخۆرەکەی بێ ئاگادەبێت و فەرامۆشی دەکات هەموو سك پڕو دوو گیانێکیش کۆرپەکەی دادەنێت و خەڵکی دەبینیت وەکو سەرخۆشن لە ڕاستیدا سەرخۆشیش نین بەڵکو سزای خوا زۆر سەخت و سامناکە وە سەری لێ شێواندون).

(فاللهُ سبحانَهُ ينادي الناسَ جميعاً إلى طاعته ويُخوفهُم زَلزَلة الساعة واضحاً لَهُم الرعْبَ والفَزَع الذي سينالُهُم ويَذهل عقُولُهمْ وقلوبهم) واتە خوای گەورە بانگی گشت خەڵك دەکات بۆ بەندایەتی بۆ کردنی وە ترسیان وەبەر دەنێت لە مەرگەساتی ڕۆژی دوایی و وێنەی ئەو ڕووداوە ترسێنەرە پڕ لە ناخۆشەیان بۆ دەکێشێ کە تووشی دەبن وەبیرو هۆشیان لێك دەداو سەریان لێ دەشێوێنێ هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (يُحشرُ الناس يَوم القيامة حفاة عراة غُرُلاً ، فَقالت عائشة الرجالُ وَالنساءُ جميعاً ينظرُ بَعضُهم الى بعض؟ قالَ الامرُ أشدُ من أن يهمهم ذلك وفي رواية (الأمرُ أشدّ مِن يُنْظَرَ بَعْضُهُمْ الى بعض) رواه البخاري و مسلم ، واتە خەڵکی ڕۆژی دوایی کۆدەکرێنەوە بە پێخواسی و ڕووتی و سوننەت کراوی ئینجا خاتوو عائیشە ووتی پیاوان و ژنان بەیەکەوە ڕادەوەستن بەیەکەوە ئەی سەیری یەکتری ناکەن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کارەکە زۆر لەوە گەورەترە کە خەڵك تەماشاو سەیری یەکتر بکەن بڕواننە یەکتری (أجَل إن يَومُ الحَشْرِ يَومٌ عَظِيم الهولِ والمَخَاوف شَديد الكُرْب والغَم عظيمُ الحرِ والهَم فالشَمسُ دانيةٌ مِنَ الرؤوس مَعَ أن بُعدَها عنّا الأن يبلغُ (مئة وخمسين مليوناً) من الكيلومترات والنيران تحيطُ بأهل المَوقف مِن كُلِ جانب وَيَبلغُ العَرَق من

النَاسَ مِن شِدَةِ الَحرِ عَلى قَدَرِ أعمالِهم)[1] واته : بەڵێ ڕۆژی قیامەت ڕۆژێکی زۆر گەورەو مەترسیدارە شوێنی غەم و حەسرەتە ئەو زۆر گەرم و غەم دەرە چوونکە ڕۆژ زۆر لە سەری خەڵك دا نزیك دەکەوێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا دووریەکەی لێمان (سەدو پەنجا) ملیۆن کیلۆمەترە ، چوونکە ئاگر لە ڕۆژی دوایی دەورە لە خەڵك دەدات لەهەموو لایەکدا وە ئارەقەی لاشەی مرۆڤ دەگاتە نقوم بوونی لەگەرمیدا لەبەر پلەی گەرمی بەگوێرەی کردەوەکانیان).

## (تێبینیی یەکی گرنگ)

جا هەروەها بێگومان هەر کاتێك خوای گەورە ویستی دونیا وێران بکا ئەوجا فەرمان ئەکاتە فریشتەیەك بەناوی (إسرافیل) (سەلامی خوای لێبێت) ئینجا فوو ئەکاتە صور [2] ئەم دونیایە بە ئاسمان و زەمینەوە وێران ئەکاو گشت گیان لەبەرێك ئەمرێ جگە لەچەند کەسێك نەبێ کە خوا حەز بکا ئەمرن و ئینجا جاری دووەم فوو ئەکاتەوە صور گشت گیاندارێك زیندوو ئەبێتەوە جا خوای گەورە لەم بارەیەوە ئەفەرموێت ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ

---

(1) بڕوانە پەرتووکی (منهل المؤمنين ومورد الخطباء في الجمع والمناسبات) لە نووسینی (الدكتور محمود احمد البرشه) لاپەڕە ٤٦٥.

(2) هەزار رەحمەت لەو کەسە کە گوتویەتی (چوارەم اسرافیل (مەئمورە) بە صور بە ئینتیزارە تا وەقتی دەستور)

(صور شاخێکە ئەو فووی دەکا پێیدا          بەقەدەر ئەرواح کونی واتێدا)

بڕوانە (عەقیدەی ئیمان و ئیسلام) دانراوی مەلا (عبدالكريمی مدرس) لاپەڕە ١٣.

﴿...أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ سووره‌تی الزمر: ٦٨، واته هه‌ر كه له‌لایه‌ن (ئیسرافیله‌وه) فوو ئه‌كرێته صور هه‌ر چی له ئاسمان و زه‌میندایه گیانی ده‌رئه‌چیّ جگه له‌و كه‌سانه‌ی خوا بكه نه‌مرن وه‌كو هه‌ڵگرانی عه‌رش و هتد...) ئینجا دوایی فوێكی تری تیّ ئه‌كا گشتیان زیندوو ئه‌بنه‌وه چاوه‌ڕوان ئه‌كه‌ن چیان به‌سه‌ر دیّ ؟ هه‌روه‌ها عبدالله ی كوڕی عومه‌ر (خوا لێیان ڕازی بێت) ئه‌ڵێت : سُئِلَ النبي (صلى الله عليه وسلم) ما الصُورُ قالَ قَرنٌ يُنفَخُ فيه) رواه الترمذي و أبو داود واته : پرسیار له پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كرا (صور) چیه ؟ ئه‌ویش له وه‌ڵامدا فه‌رمووی قۆچێكه فووی تیّ ئه‌كرێتیّ له ڕۆژی قیامه‌ت، جا بێگومان ئاگاداربه فووكردنی (نه‌فخی) صور یه‌كه‌م كه دونیا وێران ئه‌كا له قورئانی پیرۆز به چه‌ند ناوێك هاتووه وه‌كو (الساعةُ الأزمة، الحاقة، الغاشية، الواقعة، القارعة، الراجفة) هه‌روه‌هاش فووكردنی (نه‌فخی) صوری دووه‌م كه خه‌ڵكی پیّ زیندوو ئه‌بێته‌وه ئه‌ویش به‌چه‌ند ناوێك له قورئان و حه‌دیسدا هاتووه وه‌كو (یوم البعث، یوم الدین، یومالفتح، یوم التلاق، یوم الحَسرة، یوم الجَمع، یوم التَغابُنْ، یوم الخروج، یوم التناد، الرادفة، الطامة الكبری، الصاخة، هتد ...) .

ئه‌وجا بزانه (الیوم الآخر) ڕۆژی دوایی به هه‌ردووكیان ئه‌گوتریّ ، ئیمامی ئه‌وه‌ی ئه‌ڵیّ له گێڕانه‌وه‌یه‌كدا هاتووه كه نێوان هه‌ردوو فووكردنه‌كه(چل ساڵه) به فه‌رموده‌ی (حه‌دیسی صحیح) كه وارید بووه[1] له زاری پێغه‌مبه‌ر (ﷺ)

---

(1) بڕوانه په‌رتوكی (إرشاد الساری شرح صحیح البخاری) دانراوی (الامام القسطلاني) لاپه‌ڕه ٣٢٣ ، به‌رگی ٧ ، دار الفكر .

## ( سه‌نجێکی گرنگ )

جا هـه‌روه‌ها بێگومـان لـه‌م زیندووبوونـه‌وه‌ی ڕۆژی قیامـه‌ت لاشـه‌كه‌ی دونیای ئاده‌میزاد به‌ته‌واوی درووست ئه‌كرێته‌وه چونكه سه‌ر لـه‌نوو گیـانی دێته‌وه‌به‌ر به فه‌رمانی خودا (عَن عبدالله إبن عباس) رضي الله عنه ، قـالَ : قالَ النبي (صلى الله عليه وسلم) (يَا أيّها النّاس إنَكُم تحْشَرُونَ إلى الله حُفـاةَ عُراةً غُرلاً) [1] كَما بَدأنا أوّلَ خَلقٍ نعيدَهُ [2] رواه البخـاري ومسلم/ واتـه لـه عبدالله ی كوڕی عه‌باسه‌وه (خوایـان لێ ڕازی بێـت) ئـه‌ڵێ پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی (ئه‌ی خه‌ڵكینه ئێوه (حه‌شر) ئه‌كرێن بۆلای خوا به پێخواسـی و به ڕووتی به سوونه‌ت نه‌كراوی (مه‌به‌ست چه‌رمه‌كه‌ش ئه‌درێته‌وه) .

## ( باسێك له وه‌ستانی گۆڕه‌پانی مه‌یدانی مه‌حشه‌ر ( الحَشرُ في الموقف )

ئه‌وجا بزانه كه ئه‌م خه‌ڵكه زیندوو كرانه‌وه‌و سه‌ر لـه‌نوێ بـه‌م شـێوه‌یه (حه‌شر) ئه‌كرێن واته له گۆڕه‌پانی مه‌یدانی مه‌حـشه‌ر كـه پێـی ئـه‌گوترێت (المَوقـف) كـۆ ئه‌كرێتـه‌وه هـه‌روه‌ك پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) ئه‌فـه‌رموێت (إنَكُـم مَحْشورُونَ رِجالاً ورُكباناً وتجرُونَ عَلىَ وُجُوهِكم) رواه الترمذي/ عَن بهـز بـن حكم عَن أبيه عَن جدهِ (رضي الله عنهم) واتـه ئێـوه ئه‌بردرێنـه گۆڕه‌پـانی

---

(1) غُرلاً : الغُرلة ، القُلفة التي تقطعُ من جلد الذكر ، وهوَ موضع الختان، واته ئه‌و پارچه چه‌رمه‌ی كه له پێشدا سوننه‌تكرا بوو جارێكی تریش ئه‌بێته‌وه‌و ، مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه هه‌موو ئه‌ندامه‌كانی وه‌كو جاری پێشوو ئه‌درێته‌وه پێی).

(2) ئه‌مه له پێشه‌وه ته‌فسیر كراوه .

(مەحشەر) هەندێك بە سواری هەندێك بە پیادە وە هەندێك لەسەر ڕوو ڕائەكێشرێن ، جا هەروەها بزانە ئەم گۆڕەپانەی (مەحشەر) خاك و زەویەكی ترە جگە لەو خاكو زەویەی ئێستا هەروەكو خوا لە قورئاندا ئەفەرموێت :﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾ سوورەتی إبراهیم: ٤٨ ، واتە : لە ڕۆژێكدا كە ئەم زەویە دەگۆڕێت بە زەویەكی تر جگە لەو خاك و زەویەی ئێستا هەروەها ئاسمانەكان دەگۆڕێن بە شێوەو شێوازێكی تر چوونكە هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێت : (يُحشَرُ الناسُ عَلى أرْضٍ بَيْضاء عَفراء كَقُرصة نَقي) رواه البخاري و مسلم ، عَن سهلٍ (رضي الله عنهُ) واتە : ئەم خەڵكە لەسەر زەویەكی سپیاتی وەكو نانێكی سوركراوەیە لەم گۆڕەپانەدا حەشر ئەكرێ [1] .

## (باسی سەختی و ناخۆشی ئەو ڕۆژە)

عَن أبي هُريرة (رضي الله عَنهُ) قالَ : قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يَقبض الله تَبارَكَ وَ تَعالى الأرض يومَ القيامة ويَطوي السموات بيمينه ويَقول (أنا المَلِكُ أينْ مُلُوك الأرضِ ؟) واتە : ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی خوای تەبارەك و تەعالا زەوی دەخاتە چنگیەوەو لەڕۆژی قیامەتداو وە ئاسمانەكانیش ڕاستەوخۆ دەپێچێتەوە ئینجا پاشان ئەفەرموێت: (من پادشام كوا

(1) بڕوانە پەرتوكی (شرح مسلم) دانراوی (الإمام محي الدين النووي) لاپەرە ٢٠٢ ، بەرگی ١٠.

پادشاکانی زەوی) ئا لەم ڕۆژە تەنگاویە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەفەرموێت (تُدنی الشمسُ یَوْمَ القیامةِ مِنَ الخَلقِ حَتی تکونَ مِنهُم کَمقدار میل فیکون الناسُ علی قدر أعمالهِم في العَرَقِ فَمِنهُم مَن یَکونُ إلی کَعبیهِ وَمِنهُم مَن یَکونُ إلی رُکبَتَیهِ وَمِنهُم مَنْ یَکونُ إلی حَقویهِ وَمِنهُم مَن یَلجُمهُ العَرَق إلجاماً وَأشارَ (صلی الله علیه وسلم) إلی فیهِ) رواه مسلم. واتە : لە مەیدانی مەحشەر کە خەڵك وەستاوە ئینجا ڕۆژ لێیان نزیك دەبێتەوە بەئەندازەی میلێك ئینجا ئەو خەڵکەو لەبەر کوشندەیی گەرماو قەرەپەستانێ و پاڵپێوەنانی یەکترو ئینجا ئارەقە لێی ئەتکێتە خوارەوە هەر کەسە بە گوێرەی کردەوەکانی خۆی لە گۆمی ئارەقەدا نقوم دەبێ جا هەندێك تا گۆزینگ هەندێك تا ئەژنۆ هەندێك تا پیشتێنی هەندیچك تا دەم و لووتی ئارەقە لغاوی ئەکات.

## ( ئاگادارییەکی گرنگ )

جا بێگومان پێویستە بزانین لە ڕۆژی قیامەت خزمایەتی و دۆستایەتی و پلەو پایەی دونیا سوودی نیە هەروەها پێویستە بزانین چەند جۆرە کەسێك لە بن سێبەری خودا (عَرش الرّحمان) ڕادەگیرێن و لە سەختایی ئەوڕۆژە ئەپارێزرێن هەروەك لە (حەدیس صحیح) دا هاتووە ئەفەرموێ (عَن أبي هریرة (رضي الله عَنهُ) عَن النَبي (صلی الله علیه وسلم) قالَ: سَبعَةٌ یَظلُّهُم اللهُ في ظلهِ یَومَ لا ظلَ إلا ظله ، إمامٌ عادلٌ وَشابٌ نَشأ في عبادة الله عَزَ وَجل وَرَجُلٌ قَلبَهُ مُعَلقٌ بالمَساجد وَرَجلان تحابّا في الله إجتَمَعا عَلَیهِ وَتَفرَقا عَلیهِ وَرَجُلٌ دَعَتهُ إمرأةٌ ذاتُ مَنصِبٍ وَجَمال فَقالَ إني أخافُ الله رَب العالَمین

وَرَجُلٌ تَصَدَقَ بِصدَقَةٍ فَأخفاها حَتى لا تَعلَمَ شِمالُهُ ما تُنفِقَ يمينـهُ ، وَرَجُـلٌ ذكَرَ اللهَ خالياً فَفاضَت عَينـاهُ) مُتَفَقٌ عَليـه، واتـه: ئـهبو هـورهيره (رِهزای خوای لێبێت) كهوا پێغهمبـهر (ﷺ) فهرموويـهتی (حـهوت جۆره كهسـان خودا ئهيانخاته ژێر سێبهری خۆی كهلهو ڕۆژهدا تهنها ئهو سێبهره ههيه ، سـهركردهو پێـشهوايهكی دادگـهر گـهنجێك ڕاهاتبێـت وپـهروهرده بووبێـت لهسهر عيبادهتی خودای گهوره پياوێك دڵی پهيوهست بێت به مزگهوتهوه دوو پياو لهبهر خاتری خوا يهكتريان خۆش بوێ ههروهها بهيهك بگهن ههر لهسهر ئهمهش جيـاواز ببنـهوه ، پياوێـك ئـافرهتێكی خـاوهن پلـهو پايـهو جوان بانگی بكات پياوهكه پێی بڵێت من له خوای گهوره ئهترسم ، پياوێك خێرێك دهكات ئهيشارێتهوه ههتا دهسـتی چـهپی نـهزانێ دهسـتی ڕاسـتی چی بهخشيوه پياوێك له خهڵوهتكا يادی خوا دهكات فرمێسك دهبارێنێ له ترسی خودا).

وَعَنهُ قالَ : (قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) إنَ اللهَ تعالى يقول يوم القيامة أينَ المُتَحابون بجلالي ؟ اليومَ أظلـهُم في ظلـي يـومَ لا ظِـلَ إلاَ ظلّـي) رواه مـسلم ، واتـه : پێغهمبـهر (ﷺ) دهفـهرموێ خـوای گـهوره لـه ڕۆژی دواييـدا دهفـهرموێ كـوانێ ئهوانـهی لهبـهر خـاتری مـن يـهكتريان خـۆش دهويـست؟ ئـهمڕۆ ئهيانخهمـه ژێـر سـێبهری خـۆم كـه لـهم ڕۆژهدا هـيچ سێبهرێك نييه تهنها سێبهری من نهبێ .

( **پاشکۆ** )

مامۆستا عبدالله هەرتەلّی لە عەقیدەکەیدا[1] ئەڵێ ئینجا بزانە مرۆڤ لە دونیادا شوێن کەوتوی کام یاساو کام سەرکردە بووبێ لە مەیدانی (مەعشەریش) هەر شوێنی (ئەم سەرکردەیە) ئەکەوێ وە لەژێر ئاڵای ئەودا (حەشر) ئەکرێ خوای گەورە فەرمووییەتی ﴿ يَوْمَ نَدْعُواْ كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَٰمِهِمْ ﴾سوورەتی الإسراء: ٧١، واتە : ڕۆژی قیامەت هەموو خەڵکێك لەگەڵ پێشەوای خۆیانە بانگ ئەکەین جا چاك بێ یان خراپ بێ (عَن عبدالله) (رضي الله عَنهُ) قالَ: قالَ النَبي (صلى الله عليه وسلم) (المرأ مَعَ مَن أحَب) رواه البخاري ومسلم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لە ڕۆژی قیامەت مرۆڤ لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆیدا (حەشر) دەکرێ کەوابوو ئەی موسڵمان هەر ئێستا بزانە کێ پێشەواتە ؟ شوێن کەوتووی کام کۆمەڵی ؟ ڕۆژی دوایی گلەیی لەکەس مەکە جا هەزار ڕەحمەت لەم کەسە بێ کە لە بارەیەوە هۆننەوەی هەیە و کە ئەمیش:

مامۆستا (مەلا عبدالكريمی مدرس)ە لە سەرچاوەی ئایینیدا ئەفەرموێت:[2]

هەندێك بە سواری هەندێك بە پێیان هەندێك ڕائەکشێن لەسەرڕووی خۆیان

بەرەو مەیدانی مەحشەر ئەبردرێن تا خوا حەز بکا لەوێ ڕائەگرێن

---

(1) بڕوانەعەقیدەی ئیسلامی لەسەر ڕاڕەوی (أهل السنه والجماعه) لە دانانی (مەلا عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی) لاپەڕە ٤٥.

(2) بڕوانەپەرتوکی (سەرچاوەی ئایین) ، لە دانانی خوالێخۆشبوو (مەلا عبدالكريمی مدرس)، لاپەڕە ٢٥.

له ترسان هیچ کەس خزمی کەس نییە　　ڕۆژ نزیك ئەبێ و سێبەری نییە

لەبەر گەرمایی ئارەق دێتە خوار　　زۆر کەس لە گۆمی ئارەق دەچنە خوار

ئەمە بەرزەخە تا ڕۆژی مەحشەر　　ئەوجا (میعادە) تۆ بکەی باوەڕ

ئەعزای دێتەوە لەگەڵگۆشت و پیستە　　خوێن و پیست و موو هەم ڕەگ و ڕیشە

وەك لە دونیادا (جەمع) ئەبین یەکجار　　ئەچین بۆ (مەحشەر) بە ئەمری قەهار.

خوایـە عـەفومان بکـەی خوایـە لەئێمـەو موسـڵمانان خـۆش ببـی و بەتایبـەتی لـە دایـك و باوکمـان خـۆش ببـەو خوایـە لەبـەر خـاتری خۆشەویستەکەت نـەجاتمان بـدە لەمەیـدانی (مەحـشەر) خوایـە لـە بـەلاو موسیبەتی دونیاو قیامـەتمان بپـارێزە ئـامین (نَـبَهَني الله وَإيـاكُم مِـن نَومـة الغافلين وَحَشَرَني وَإياكُم تحتَ لِواء سيّد المُرسَلين، اللّهُمَ إغفِر لَنَا آمين).

# ئامۆژگاری چل و پێنجەم

## باسی ( الشفاعة العظمى ) واتە تکا گەورەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە گۆڕەپانی مەحشەر ئەکا

(الحَمدُلله ثُمَ الحَمدُ لله ما توفيقي وَلا إعتصامية إلا بالله عَليهِ تَوَكَلت وَإليهِ أُنيب، الحَمدُ لله الذي تَدَكدَكَت لِعَظَمَتِه الجبال وَسَجَدَت لِهَيبَتِه الجِباه العليم الذي علِمَ حقائقَ الأحوال وَدَقائق ما أسَرَهُ العَبدُ وَأخفاه الجواد الذي جاد بالنوال مَن أطاعَهُ وَمَن عَصاه أحمَدُهُ سُبحانَهُ وَتعالى حَمداً لا بلُوغَ لِمُنتَهاه ُ وَأشهَدُ أن سيدنا وَنَبينا مُحَمداً عَبدَهُ وَرَسولَهُ يالَهُ مِن نَبيٍ أكرَم الخَلق وَصاحِبُ الخُلق الكريم وَصاحِبُ الشَفاعة العُظمى يَومَ المَعشَر، وَالصلاةُ وَالسَلامُ عَليهِ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ أجمَعين إلى يوم الدِّين، أما بَعدُ أيّها المُسلِمون أوصِيكُم بِتَقوا الله وَطاعَتِهِ وَلزُومِ أوامرهِ وَفي جَميع أوقاتَكُم)، واتە: لەپاش ئەمە ئەی موسڵمانەکان وەسیەتتان لێ دەکەم بە تەقوای خوداو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودای گەورەهەروەها بە ترسان و تەقوای خودا لەهەموو کاتێك و ساتێکدا جا هەروەها برایانی خاوەن باوەڕان دەمەوێ لە وەتاری ئەوڕماندا باسی (شەفاعەتی) پێغەمبەرتان (ﷺ) بۆ بکەم چوونکە بزانەئەم تکا گەورەیە هەروەك پێی دەگوترێ (الشَفاعة العُظمى) واتە تکای گەورە هەروەها پێشی ئەوترێ (المَقام المَحمود) چوونکە بێگومان لەم تکایەدا جیاوازی لەنێوان ئوومەتی خۆی و خەڵکی تر ناکا هەروەك خۆی فەرموویەتی (وَهوَ المَقامُ المَحمود الذي قالَ الله تعالى ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ سوورەتی الإسراء: ٧٩،

به ئومێد به پەروەردگارت بتنێرێته شوێن و جێگایەکی پەسەندو بەرێزەوە (مەقامەلمەحمود) پێشینان و پاشینانیش سوپاست بکەن ئەو جێگایەش پێی دەڵێن (الشفاعةالعظمى) چوونکەبەڕاستی لەوێ تکا بۆ هەموو موسڵمانان بەگشتی دەکرێت ، هەروەها ئیمامی ترمذیش ، (ڕیوایەت) ئەکا لە حەزرەت (ﷺ) کەوا فەرموویەتی (ئەو تکایە ئەو مقام محمودە) یە کەخوا لە قورئان (وەعدی) پێ داوم و خەڵك سوپاسم ئەکا جا هەروەها موسڵمانان لەو کاتەی خەڵك زۆر نارەحەته بەهۆی مانەوەیان لە مەیدانی (مەحشەر) دا چاویان لە مۆڵەق ڕاوەستاوە سەریان بریوەتەئاسمان و چاوەڕێی فەرمانی خودا دەکەن چوونکە خەڵکەکە هەمووی بێزار بوونە لەبەر نارەحەتی ئەو ڕۆژەدا نازانن چی بکەن و ئینجا ڕاوێژ دەکەن کە بچنە خزمەتی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) بۆ ئەوەی (دوعایان) بۆ بکەن تا لەو وەزعە ڕزگاریان بێت بەڵام پێغەمبەرانیش بەخۆو بەوهەموو گەورەییەی خۆیان هیچیان لەدەست نایەت ئەنجامی بدەن .هەر ئەڵێن ئای لەو ڕۆژەی هەر (نەفسی نەفسیە) هەر یەکێ لەوپێغەمبەرانە ڕەوانەی لای یەکێکی تری دەکات وە ئەڵێ من تکام لەم ڕۆژە (سامناکە) بۆ کەس پێ ناکرێ چوونکە هەر یەکە مەشغولەبەحاڵی نەفسی خۆی ئەوجا لەپاشان دێنە خزمەت پێغەمبەری ئازیز خۆشەویستمان کە (عیلاجیان) بکات و ئەم خەڵکە لەو (میحنەتە) قوتار بکات ئەوجا داوا دەکەن کە (شەفاعەتیان) بۆ بکات ئەویش جەنابی هەڵدەستێ بە فەرمانی خودا دەچێتە بن حەرشی خوداو دەست بە (سوجدە) بردن ئەکاو ئەپاڕێتەوە لەپەروەردگاری خۆی ئینجا خودا لێی قەبوڵ ئەکات بەڵام لە(ڕیوایەتی) تردا ئەفەرموێت دەست بەسوجدەو کڕنۆش ئەکات سەر بەرز ناکاتەوە تا خوای گەورە پێی

دەفەرموێ (يا مُحَمّد إرْفَعُ رأسَكَ سَلْ تُعطهِ أشْفَعْ تُشفَع) رواه البخاری ومسلم، واتە: پاشان دەوترێت ئەی (محمد) سەرت بەرز بکەرەوەو داوا بکە پێت بدرێت (شەفاعەت) بکە لێت وەردەگیرێت جا هەروەها ئەم حەدیسەی ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) کەبوخاری و موسلم هێناویانە وەك ئەفەرموێت (عَن أنَس (رضي الله عنه) عَن النبي (صلى الله عليه وسلم) يَجمَعُ الله الناسَ يَومَ القيامةِ فَيَهتَمُّونَ لِذَلكَ فَيَقولونَ لَو إستَشفَعْنا إلى رَبِّنا حتى يَريحنا مِنْ مَكاننا هذا قالَ فَيأتونَ آدمَ ثُمَ نوحاً ثُمَ إبراهيم ثُمَ موسى ثُمَ عيسى (عليهم الصلاة والسّلام) وَكُلُ واحدٍ مِنهُم يَقولُ لَستُ هُناكم قالَ النبي (صلى الله عليه وسلم) فَيأتوني فأستأذن رَبي فَيؤذَنُ لي..الخ) فەرموودەکە/ واتە بێگومان ئەو خەڵکە لەمەیدانی مەحشەر خوای گەورە کۆیان ئەکاتەوە هەوڵ ئەدەن و ئەڵێن وا باشە ئێمە داوای شەفاعەت بکەین لەلای خوا تاکوەخوای گەورە لەم ڕاوەستان و ئەزیەتە بمانحەسێنێتەوە ئەوجا ئەچنە لای حەزرەت حەزرەتی باوکە ئادەم و نوح و إبراهیم وموسی و عیسی (درودی خوایان لەسەر بێت) تاکو لەلای خوا تکاو (شەفاعەتیان) بۆ بکەن بەڵام ئەم بەڕێزانە هیچیان لە ترسی خوا ناوێرن تکایان بۆ بکەن هەرکەسیان ئەڵێن من شایەنی ئەوە نیم ئەم پلەیم نیە تکا بکەم ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دێنەلای من و منیش داواو ئیزن لە خوای گەورە وەرئەگرم و خوا بە میهرەبانی خۆی ئیزنم ئەدا واتە ئەوجا تکاو (شەفاعەتیان) بۆ ئەکەم و جا خوای گەورە تکاو (شەفاعەتم) وەرئەگرێ و دادگای (مەحشەر) دەست پێ دەکا تا کۆتایی حەدیسەکە .....).

**( فائيدەو سودێك )**

برایانی خاوەن باوەڕان فەرمووده زۆرن لەسەر تکاو (شەفاعەت) بەلاّم من نامەوێ باسەکەمان زۆر درێژ بێت جا هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) ئەفەرموێت (قَالَ : قالَ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) لِكُلِ نَبيٍ دَعوةً قَد دَعاها لأمتِه وَإني أختَبأتُ دَعوَتي شَفاعةً لأمتي) رواه البخاری، واتە: بەڕاستی هەموو پێغەمبەرێك دوعایەکی هەیەو بۆ ئومەتەکەیان کرد وە من دوعاکەی خۆم هەڵگرتووەو شەفاعەتیان بۆ دەکەم جا هەروەها بێگومان ئاگاداربە پێغەمبەر (ﷺ) پێنج شەفاعەتی هەیە :

١) شەفاعەتی (عظمی) : ئەمە بۆ هەموو خەڵکە کە حەسانەوەی خەڵکە لە ڕاوەستانی زۆر لەمەحشەر تا دەست دەکرێت بەحیساب کردنیان.

٢) بۆ هەندێ کۆمەڵ کە داخلی بەهەشت دەبن بەبێ حیساب .

٣) بەرزکردنەوەی پلەی هەندێ کەس ئەوانەی کە لە بەهەشتن .

٤) کۆمەڵێك فەرمانی دۆزەخیان بۆ دەرچووە بەلاّم بەر (شەفاعەتی) پێغەمبەر (ﷺ) دەکەون داخل نابنە (جەهەنەم) واتە (دۆزەخ).

٥) هێنانە دەری هەندێ گوناهبار لە دۆزەخدا کە حەزرەتی (فەخری عالەم) تکایان بۆ ئەکات هەروەکو لە (حەدیسدا) هاتووە).

**( پاشكۆ )**

جا هەروەها بێگومان بەم شێوەیە خەڵك هەمووی دەستە دەستە ڕێز دەبێت بەرەو ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) دەچێت بۆ ئەوەی (شەفاعەتیان) بۆ

بکات، هەر تکاو (شەفاعەت) دەکات هەتا خودا پێی ئەفەرموێ (ئایـە ڕازی بووی (ئەی محمد)، وەك خوای گەورە لە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴾ سوورەتی الضحی: ٥ ، واتە: لە ئایندەداو لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگارت ئەوەندە ناز و (نیعمەتت) پێ دەبەخشێ تۆپێی ڕازی ئـەبی دڵـی پـێ خـۆش بکـەیت واتـە (مەقامـەڵ مـەحمودی) دەداتـێ و (شەفاعەت) و تکا بۆ گشت ئوممەتەکەی دەکا خواش لێـی وەردەگرێـت) ، هەروەك حەزرەتی عەلیش (خوا لێی ڕازا بێت) دەگێڕێتـەوە (أشـفَعُ لأمَـتي حَتّى يُناديني ربِّي تَبارَكَ وَ تعالى فيقول (أقَدْ رَضَيُتَ يا محمّد فأقولُ أي رَبيِّ قَد رَضـيت) رواه البـزار والطبرانـي). لـە کۆتاییـدا ئـەڵێن پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفەرموێت (هەر کەسێك وەڵامی بانگ بداتەوەو پاشان ئەم دوعایەی بکـاو بڵێ (أللّهُمَ رَبَّ هَذهِ الدّعوَةَ التّامة وَالصّلاةَ القائمة آتِ سيّدنا مُحَمّداً الوَسـيلَةَ وَالفَضيلة وَأبعَثهُ مَقاماً مَحْموداً الذّي وَعَده إنّـكَ لا تُخلِـفُ الميعـادْ) بخـوێنێ ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا بەر شەفاعەتی من دەکەوێ) بڕوانە (فتح الباری شرح صحيح البخاری) ج٨، لاپەڕە ٣٩٩.

## (باسی (العرض) بردنە لای خودا بۆ (السؤال) واتە پرسیار کردن)

خـوای گـەورە لـە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴾ سـوورەتی الحاقـة: ١٨ واتـە : لـە ڕۆژی قیامـەت ئـەم خەڵکـە ئەهێنرێنە لای خوا بۆ پرسیار لێکردنیان هەر کارێکی پەنهانیش کردووتانە لێتان ناشاردرێتەوە گشتی ئەهێندرێتە بەر چاوتان ئینجـا کـە ئـەم خەڵکـە

هێنرا مەیدانی مەحشەر لەبەردەستی (قودەرتی) خوای گەوەرر ڕائەگیریّ و پرسیاریان لیّ ئەکا).

جا لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ٦واتە : ئێمە پرسیار لەو کەسانە ئەکەین کەپێغەمبەریان بۆ ناردوون و پرسیار لە پێغەمبەرانیش ئەکەین، جا بێگومان پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێت (لا تُزول قدَما عبدٍ يومَ القيامة حتّى يُسأل عَن عُمره فيمَ أفناه؟ وعَن عمَله فيمَ فعَلَ؟ وعَن مَاله منْ أينَ إكتَسبَهُ وفيما أنفقَهُ ؟ وعَنْ جِسْمه فيمَ أبلاهُ؟) رواه الترمذي بسند صحيح. واتە قاچەکانی بەندە لە شوێنی خۆی ناڕوات و لاناچیّ هەتا پرسیاری لیّ نەکریّ تەمەنی چۆن بردۆتە سەر؟ کردەوەی بۆچی کردووە؟ هەروەها ماڵ و سامانی لەکویّ بەدەست کەوتووە لەچی سەرف کردووە؟ جەسەدی خۆی لەچی بەکارهێناوە؟ جا هەر کەسێك وەڵامی ڕاست نەداتەوە، ئەوا گشت ئەندامەکانی (شاهیدی) لەسەر ئەدەن، هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ سوورەتی النور: ٢٤، واتە : لە ڕۆژی قیامەت زمان و دەست و قاچیان لێیان دەبێتە (شاهێد) واتە لەبەرامبەر ئەو کردەوانە کە ئەنجامیان داوە بەوەی کە کردوویانە .

## ( باسێك لەبارەی ( صُحُف الاعمال ) واتە دەفتەری کردەوەکان لە باشەو خراپەدا )

لەدوای ڕاوەستان و لێپرسینەوە لەبەر دەستی قودرەتی خوای گەورە و بەدەسڵات ئینجا پرسیار لێ کردن لەهەموو کەسێك لە ڕۆژی قیامەت وە دەفتەر ئەعمال و کردەوەکانی (صُحُف الأعمال) کە لە دونیادا فریشتەکانی ڕاستە چەپە نووسیبوویان، وەر ئەگیرێتەوەو خوای گەورە فەرمانی پێ ئەکا ﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا ﴾ سوورەتی الإسراء: ١٤، واتە: ئەو کاتە پێی دەوترێت دەی نامەی کردەوەکانت بخوێنەوە تەماشای بکە ئەمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدەو (حیساب) بۆخۆت بکە .

## ( ئاگاداری )

ئەوجا ئەم خەڵکە لەو وەرگرتنەوەی دەفتەرەکانیان دوو جۆرن هەوەرك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ﴿٩﴾ ﴾ سوورەتی الانشقاق: ٧ — ٩، واتە: هەرکەسێك دەفتەری کردەوەکانی بەدەستی ڕاستە بدرێتەوە ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی کەمی لەگەڵ ئەکرێ و بەدڵخۆشی ئەچێتە بەهەشت، واتە بەڕووی خۆشەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو کەس و کاری چاك و خواناسی بۆناو ئیمانداران (سەرەڕای حۆری و غیلمان و ولدان) ﴿ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ﴿١١﴾ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ ﴾ سوورەتی الانشقاق: ١٠ — ١٢، واتە: بەڵام هەرکەسێك لەلای

پشتەوەی دەفتەرەکەی بدرێتەوە (یان بەدەستی چەپە وەری بگریّ) ئەوا هاواری قورِ بەسەری ئەکاو ئەچیّ بۆ دۆزەخ.

**( پاشکۆ )**

هەروەها زانایانی (عەقیدە) ئەفەرموون ئیمانداری بیّ تاوان بەدەستی ڕاستەی دەفتەرەکەی وەرئەگرێتەوە واتە: ئیمانداری تاوانباریش بە دەستی چەپەی وەری ئەگریّ بەلاّم (کافری زندیق) لەلای پشتەوەی وەری ئەگریّ (والله أعلم) واتە (خوداش زانایە)، ئیمامی بوخاری و موسلم لە خاتوو عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕنەوە ئەڵێت بیستم کە حەزرەت (ﷺ) خوای گەورەهەر کەسیّ (حیسابی) لەگەلّ بکات لەقیامەتدا ئیلّلاّ بە (هیلاك دەچیّ) واتە ڕزگاری نابیّ منیش عەرزم کرد ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆح و گیانم بیّ بەفیدات، ئەی خودا نەیفەرمووە (فأمَّا مَنْ أوتيَ كِتابَهُ بيَمينِهِ فَسوفَ يُحاسَبُ حِساباً يسيراً ؟)، واتە : هەر کەسێك بەدەستی ڕاستە دەفتەری کردوەکانی بدرێتەوە لێکۆڵینەوەیەکی کەمی لەگەلّ ئەکریّ ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەم لێکۆڵینەوە چوونکە تەنها پرسیار کردنە لە کردەوەکان بەلاّم هەر کەسێك لێکۆڵینەوەی تەواوی لەگەلّ بکریّ، وەچاوپۆشی لیّ نەکریّ ئەوا بەڕاستی بە هیلاك ئەچیّ و تووشی سزا ئەبیّ)، بڕوانە/ پەرتووکی(فتح الباری شرح صحیح البخاری) لاپەڕە ٤٩٠ بەرگی ١١.

هەزار ڕەحمەت لە مامۆستای خوالێخۆش بوو کە دەفەرموێت :

ئەم جار وەك طەیران بە نەصی ئەقوال لە ئەطراف دێت دەفتەری ئەعمال

**هەر کەسێ سەعیدەبەقەدەر و شەرەف     ئەدرێتە دەستی ڕاستی بێ ئەسەف**
**هەر کەس شەقی بێ ئەخرێتە مشتی     دەفتەر و نامەی لەلای چەپ یا لەدوای پشتی**

مامۆستا مەلا عبدالله ی هەرتەلیش ئەفەرموێت :

**کردارو گوفتار لەم دونیایەدا     گشتی نووسراوە چویتە لای خودا**
**خۆشی بۆ کەسێ کە بەدەستی ڕاست     وەرئەگرێ نووسوراو ئەچێتە جەنات**
**گەر بەدەستی چەپ وەربگرێ نوسراو     بۆ جەهەنمە شوێنی دیاریکراو**

خوایە گیان تاعەت و عیبادەتمان قەبوڵ بکەی ، وە هەروەها دەفتەری ئەعماڵمان بەدەستی ڕاست وەربگرین ، خودایە لە دەردو بەلاّ ڕزگارمان بکەیت لە بەلاّو موسـصیبەتی دونیـاو قیامـەت مـەحفوزمان بکـەیت ئـامین (نَبَهَني وَإياكُم مِن نَومة الغفلين وَحَشَرَني وَإياكُم تَحتَ لِواء سيد المُرسَلِين) .

# ئامۆژگاری چل و شەشەم

## باسی لێکۆڵینەوەی ڕۆژی قیامەت ( الحساب ) ئەکات

(الحَمْدُ لله ثُمَ الحَمدُ للهِ ما تَوفيقي ولا إعتصامية الاّ باللهِ عليه تَوكلتُ وَاليه أنيب الحَمدُ لله أحكَمُ الحاكمين وَ أعدَلُ العادلين إن الله لا يَظلمُ مثقالَ ذرةٍ وَإن تَكُ حَسَنَةً يُضاعِفُها وَيؤتِ من لَدُنه أجراً عظيماً) وَأشهَدُ أنَ لا إله إلاّ الله يُحاسِب علَى الفَتيلِ والقِطْمير وَالنَقير[1] وَهوَ العَليمُ الخَبير . وَنَشهَدُ أن سيّدنا مُحمّداً رسُول اللهِ البشيرُ النَذيرُ وَالصّلاة وَالسّلام عليه وَعَلى آله وَأصحابه الذينَ خافُوا فأمَنُوا وَأحسَنوا ففازوا ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ أما بَعدُ أيها المُسلِمونَ إتّقوا الله)، واتە: لەپاش هەندێ ئەی برایانی موسڵمانان تەقوای خوای گەورە بکەن چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (أوْصيكُمْ بِتَقوا اللهِ وَالسَمع وَالطّاعة) رواه أبوداود. واتە: وەسیەتتان ئەکەم بە تەقوای خوا گەورەو گوێڕایەڵی وپەیڕەوی خوای گەورە چوونکە خوای گەورەش لە قورئاندا فەرمانمان پێ ئەکات لەوئایەتە پیرۆزەدا ﴿ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ ﴾ سوورەتیالنساء: ١٣١، واتە: بەڕاستی وەسیەتی ئێمەبۆ خاوەن (کیتابەکانی) پێش ئێوەو بۆ ئێوەش ئەوەیە تەقوای خوا بکەن وە تکاو داوای پێغەمبەران لەئوممەتەکەیان ئەوەبووە بە (تەقوا) بن،

---

(١) المعنى : ما يكون في شق النواة (القشرة) الرقيقة التي عَلى النواة (النقرة) في ظهر النواة ، والمرادُ بالمحاسبة على هذه الثلاثة).

جا هەروەها یەکێ لەناخۆشیەکانی ڕۆژی قیامەت واتە دوایی ئەوەیە کەوا ڕاوەستانە لەبەردەمدادگای پەروەردگارا چوونکە بەڕاستی خوای گەورە حیسابمان لەگەڵ دەکات لەسەر میسقاڵە (زەڕەیەك) و هەر ووردیلەیەك لە چاکەو خراپە دا وە هەروەها (حیسابی) کۆتایی لەسەر کردەوەکان ئەکاو ئاشکراوپەنهانەکان هەروەکو خوای گەورەلە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾واتەهەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا هەیە هەمووی هی خوایە کەواتە تەنها (شەریعەت) و بەرنامەی ئەویش کاری پێ دەکرێ ﴿ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ ﴾ واتە: ئەگەر ئەوەی لەناو دڵ و دەروونتانا ئاشکرای بکەن ﴿ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٨٤واتە : یان بیشارنەوەو دەری نەخەن لەهەردوو حالەتەکەدا خوا لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدا دەکات هەندێ لە(موفەسیرەکان) ئەڵێن بەواتای ئەگەر ئەوەی لە دڵتان دایە لەسیفاتی نەفسی وەکو بێ بڕوایی حەسودی و ناپاکی و بەخیلی ئاشکرایان بکەن یان بیشارنەوە خوا بۆی هەیە حیسابتان لەگەڵ بکات.

چاکە بە چاکەو خراپ بە خراپە ، جا هەروەها ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) ئەفەرموێت (حَاسِبُوا أنفُسَكُم قَبْلَ أن تُحاسَبُوا) واتە موحاسەبەی نەفسی خۆتان بکەن پێش ئەوەی موحاسەبە بکرێن).

جا هەروەها خاوەن باوەڕان بەڕاستی خوای گەورە زوڵم و ستەم لە هیچ کەسێك ناکات بە ئەندازەی هەرە ووردیلەیەك وە بە تەرازووی دادپەروەری کردەوەکانیان هەڵئەسەنگێنرێ و ئەکێشرێن ، هەروەکو خوای

گەورە لە سورەتی (الأنبیاء) دا ئەفەرموێت ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾واتە: بێ گومان لە ڕۆژی قیامەت تەرازووی دادپەروەری دائەنێین و کردەوەکانیان پێ ئەکێشین .﴿ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ﴾ئەوسا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێ ناکرێ چ لە چاکەکاران و چ لە خراپەکاران ﴿ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ ﴾ واتە تەنانەت ئەگەر کردەوەکانیان بە ئەندازەی سەنگی دەنکە خەرتەلێکیش بێت کە لە بچوکیدا کراوە ئینجا بۆ نموونە ﴿ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ سوورەتی الأنبیاء: ٤٧، واتە: ئێمە ئەیهێنین و ئامادەی ئەکەین ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە بە ووردی ژمێریاری کردەوەکانیان بین، وە لە جێگایەکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾ سوورەتی الکهف: ٤٩ وە لە جێگایەکی تردا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ﴾ سوورەتی النساء: ٤٠.

## ( ئاگاداریيەکی گرنگ )

برایانی خاوەن باوەڕم ئەوەی ڕاستی بێت ئەمڕۆ هەندێ خەڵك وا گومان دەبەن کەوا خوای گەورە (غافل) و بێئاگایە لێیان و هەروەها توانای بەسەریانەوە ناشکێ (العیاذ بالله) بەڵام ئەم جۆرە کەسانە بە هەڵە چوونە، چوونکە (صەبرو) ئارامی خوای گەورەیان فەرامۆش کردووە (مۆڵەت دانەکەیان سوود لێ وەرنەگرتووە کە بۆی داناون تاکو تێیدا بگەڕێنەوە لای

بۆیە تۆڵەو (حیسابیان) لەسەر کردەوەکانیان فەرامۆش دەکات لە دونیا سزایان نادات پێش هاتنی قیامەت ئەوجا ئێمە گشت شتێکمان لە خوای گەورە دەوێ بەلاَم لەهەمان کاتدا کەمێك نەبێ لە هەق و مافەکانی جێ بەجێ ناکەین ئینجا ئەویش بە هەمان شێوە دوعاو پاڕانەوەمان لێ وەرناگرێت چوونکە پرسیاریان لەم زاتە کردووە وەکو ئەفەرموێ (سُئِلَ إبراهيم بن الأدهَم (رحمة الله عليه) ما بالَنا نَدعوا فَلا يُستَجاب لَنا وَإن الله تَعالى يَقول ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ ﴾سوورەتی غافر: ٦٠ ، واتە پرسیار لە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رەحمەتی خوای لێبێت) کرا بۆچی ئێمە نزاو دوعا دەکەین خوا لێمان وەرناگرێ ئەویش لە وەلاَمدا فەرمووی (قَد ماتَت قلُوبُكم بِعَشَرة أشياء وَفَعَلتُم المَعاصي بِعَشرِ صُوَرٍ فَكَيفَ يُستَجابُ لَكُم؟) واتە : بەڕاستی لەبەر ئەوەی بەدەشت و دڵتان مردووە وە سەرپێچیتان بە دە وێنە و ئەنجام داوە ئەوجا چۆن دوعاو نزاکانتان قەبوڵ دەبێ ؟

١- عَرَفتُم الله وَلَم تؤدوا حَقَهُ (مِن إمتِثال أوامره وَإجتِناب نواهيه).

٢- قَرَأتُم القُرآنَ وَلَم تَعمَلوا بِهِ .

٣- أدَعيتُم حُبَ الرَسولِ (صلى الله عليه وسلم) وَتَرَكتُمْ سُنتهُ.

٤- إدَعَيتُم دَخولَ الجَنَة وَلَم تَعمَلُوا لَها.

٥- إدَعيتُم النَجاة مِن النّار وَرَمَيتُم فيها أنفُسَكُم بِإتِباعِ الشَهَواتِ وَالمَلَذاتِ وَالاهواءِ). واتە (یەکەم) خواتان ناسیوە وە مافەکانیتان جێ بەجێ نەکردووە وەکو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی .

دووەم) واتە : قورئان دەخوێننەوەو کاری پێ ناکەن.

سێ هەم) دەڵێن پێغەمبەرمان خۆش دەوێ و پشتتان لە ڕێبازی کردووە .

چوارەم) دەڵێن دەچینە بەهەشت و بڕوادارین بەڵام کارتان بۆ بەهەشت نەکردووە .

پێنجەم) داوای ڕزگاربوون دەکەن لە ئاگر بەڵام خۆتان دەخەنە ناوی بەهۆی بەدوا کەوتنی هەواو ئارەزوو بازی و تام و چێژی دونیاوە .

٦- قُلتُم المَوتَ حَقٌ وَلَم تَستَعِدوا لَهُ

٧- إدَعيتُم عداوة الشيطانِ وَأطَعتمُوهُ.

٨- إشتَغلتُم بعيوب الناس وَتَرَكتُم عيُوبَكُم .

٩- دَفَنتُم الأمواتَ وَلَم تَعتَبُروا .

١٠- أكَلتُم نِعمَةَ الله وَلَم تَشكروُه عَليها.

وَإن المَخرَجَ وَالدواء لِكُل هذه الأمراض التَوبة النَصوح وكَثرةَ الإستغفار ، وَذكرِ الله كما قالَ رَسول الله (صلى الله عليه وسلم) عَلَيكُم بِلا إله إلاّ الله وكَثرة الإستغفار فَإنَ إبليس قالَ أهلَكتُ الناس بالذنوب وَأهلَكوني بِلا إله إلا الله وَالإستغفار فَلَما رَأيتُ ذَلِكَ أهلَكتُهم بالأهواء وَهُم يُحسَبونَ أنفُسَهُم مُهتَدون) رواه أبو يعليى[1] .

شەشەم) واتە : دەڵێن مردن ڕاستە بەڵام خۆتانی بۆ ئامادە ناکەن .

حەوتەم) دەڵێن دوژمنی شەیتانین بەڵام گوێڕایەڵی دەبن .

---

(1) بڕوانە : پەرتوکی (کانیاوی بڕواداران و ووتار بێژان بۆ ووتاری هەینی) لە وەرگێڕانی (مەلا عبدالرحمن طه) ، لاپەڕە ٥١٥، لەگەڵ دەستکاری خۆم .

هەشتەم) واتە : (عەیبی) خەڵکە دەڵێن و باس دەکەن بەلاّم (عـەیبی) خۆتان واز لێ هێناوەو ئەیشارنەوە .

نۆیەم) مردوو ئەنێژن بەلاّم پەندو (عیبرەتی) لێ وەرناگرن .

دەهەم) ڕزق و ڕۆزی خـوا دەخـۆن و سوپاسـگوزاری ناکـەن واتـە نـازو نیعەتەکانی بۆ جێ بەجێ ناکەن .

جا هەروەها ئەوەی ڕاستی بێت ڕزگاربوون و دەرچوون لەم نەخۆشیانە و چارەسەری چاك گەڕانەوەو تەوبەیـەکی بەڕاسـتی یـە بـۆلای خـواوە زۆر داوای لێبـوردن کردنـە و زۆر (زکـرو) یـادی خواکردنـە هـەروەك پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـــەتی (بـــەردەوام بڵـــێن (لا إلــه إلاّ الله) وە هـــەروەها زۆر (إستغفار) بکەن چوونکە (شەیتان) دەڵـێ خـەڵکم بـە (هـیلاك) بـردووە بـە تاوان و گوناهان ئەوانیش منیان بە (هیلاك) بردووە بە زۆر ووتنی (لا إله إلا الله) وە إسـتغفار کـردن جـا کـاتێ وام دیـتن بـە (هـیلاکم) دان بـە ئـارەزوو پەرسـتی کـەوا دەزانـن هیدایەتـدراون واتـە ڕێنومـایی کـراون، بـەلاّم بـە پێچەوانەوەو...).

(ئەوەی حیساب لەگەڵ بەندەکانی دەکا خوای گەورە هەر خۆیەتی)

جا هەروەها بێگومان ئەو (حیساب) و (موحاکەمەی) بەندەکانی خـوای گـەورە خـۆی پێـی هەڵدەسـتێ و بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ (مباشـر) جـا هەروەها لە عەدەی کوڕی حاتەمەوە (خوا لێـی ڕازی بێـت) گێڕدراوەتـەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ما مِنكُم مِن أحَدٍ إلا وَسَيُكَلِمهُ يومَ القيامةِ وَلَيسَ بيْنَ اللهِ وَبينَهُ تَرجمان ثُمَ يَنظر فَلا يَرى شيئاً قدامه ثُمَ يَنْظُر بيْنَ يديه فَتَستَقبِلهُ النّار فَمَن إستَطاعَ مِنكُم أن يَتقي النارَ وَلَو بِشَقِ تَمرةٍ) متفـق

علیه، واته : كەس لە ئێوە دانی یە كە خودا خۆی ئاخاوتن و قسەی لەگەڵدا نەكات لە ڕۆژی قیامەتدا بەبێ ئەوەی لە نێوانیاندا تەرجومان هەبێ ئینجا بەندەكە سەیری دواوەی خۆی دەكات هیچ نابینێ وە سەیری پێشەوەی خۆی دەكات دەبینێ تەنها ئاگرە بەرەو ڕووی دێ جا ئەوەی لە ئێوە توانی با خۆی لە ئاگر بپارێزێ ئەگەرچی بەلەتێ قەسپ یا خورماش بێ .

**( سەرنجێك )**

(وَقَد حدثَ الإمام عَلي (كَرَمَ الله وَجهه) بهذا الحَديث فَقال لَهُ أحَدُ الرِّجال يا أمير المؤمنين كيفَ يُحاسِبُ الله النّاسَ كُلَهُم في وَقتٍ واحِد ؟ فَقال: كَما يَرزُقَهُم في أن واحدٍ يَسألَهُم في انٍ واحدٍ)(1)، واتە بەڕاستی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) جارێك ئەم فەرموودەیەی خوێندەوە ئینجا كابرایەك پرسی و گووتی : ئەی (ئەمیری) ئیمانداران خودا چۆن لەیەك كاتدا (حیساب) لەگەڵ ئەم هەموو خەڵكە دەكات؟ فەرمووی : هەروەك چۆن لەیەك كاتدا ڕۆزی و ڕزقیان دەداتێ هەمان شت لەیەك كاتدا گشت بوونەوەرەكان ڕۆزی و ڕزقی بدا دەشتوانێ لەیەك كاتدا (حیسابیان) لەگەڵ بكاو.

**( هەر میللەتێ بە پێی بەرنامەكەی خۆی بەرپرسیارە )**

---

(1) بروانە پەرتوكی: (مصباح القلوب ومفرج الكروب)، دانراوی عبدالرحمن ملا طە عبدالعزیز/ بەرگی دووەم،/ لاپەرە ٦٩٠)

لەیەکەم ڕۆژدا دونیاو ژیانی دونیا دامەزرێنراوە خوای گەورە بۆ هەر میللەتێك پێغەمبەرێکی ناردووە تاوەکو بەرنامەو پەیڕەوەکانی خوایان پێ ڕابگەیەنێ ئەو پێغەمبەرەشیان تایبەت بووە یان بۆ گشت میللەتان نێردراوە یان تەنها بۆ سەردەمێك بووە یان بۆ گشت سەردەمەکان بووە تا ڕۆژی (قیامەت) جا ئەمەش لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەرئەکەوێ هەروەکو ئەفەرموێت:﴿ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴾ سوورەتی الرعد: ٧، واتە وبۆ هەر میللەتێ ڕێنموێنیکەرێ هەیە ، وە هەروەها ئەفەرموێ : ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَسُولٌ ﴾سوورەتی یونس: ٤٧، واتە بۆ هەموو میللەتێ نێردراوێ هەیە ، یانی بۆ هەموو میللەتێ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووە چوونکە بێگومان لەبەر ئەوەی لە ڕۆژی دوایی هەر میللەتێك بەپێی بەرنامەکەی خۆی پرسیاری لێ دەکرێتەوە وە لە ژێر ڕۆشنایی ناوەڕۆکەکانی ئەم بەرنامەیە حیسابی لەگەڵ دەکرێ بە ئامادەبوونی پێغەمبەرەکەیان و (شاهێدانی) ئەو هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا بەیانی کردووە: ﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ سوورەتی الجاثیة: ٢٨ ، واتە ئەو ڕۆژە دەبینیت هەموو خەڵکی بەچۆکدا هاتوون و لەسەر ئەژنۆو پەنجەکانیان ئامادەن لەبەر سزاو سەختی ئەم ڕۆژەی قیامەت ، هەر کەسێ چاوەڕێی بانگ کردنە بۆ لێپرسینەوە ئامادەیە دەست بەجێ ڕاپەڕێت و ڕابکات بۆ بەردەم دادگای پڕ لە دادی پەروەردگار چوونکە هەر قەوم و هۆزێك بانگ دەکرێت بۆلای ئەو (کتێبەی) کە بۆی ڕەوانە کراوە یاخود بانگ دەکرێت بۆ لای نامەی کردەوەکانی ئەوسا پێیان دەوترێت

ئەمرۆ ئیتر پاداشتی ئەو كارو كردەوانەی كە دەتكرد دەدرێنەوە، جا بێگومان ئەوە نامەی كردەوەكانتە كە تۆمارمان كردووە لەسەرتان خۆی گوایە قسە دەكات و حەق وێژە (دیارە كردوەكانمان تۆماركراوە لەسەر دەزگای زۆر پێشكەوتوو) چوونكە بەڕاستی ئەوەی ئێوە دەتانكرد لەبەرمان دەگرتەوە جا هەروەها خوای گەورە لە چەند ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ سوورەتیالنحل:٨٩ واتە: لەو ڕۆژەد لەهەر ئومەتێك شاهێدێك لە خۆیانەوە كە پێغەمبەرەكەیانە بەسەردا زیندوو دەكەینەوەو تۆش بە (شاهێد) ئەهێنینەوە بۆ سەر ئوممەتەكەت. وە ئێمە قورئانمان بەسەر تۆدا ناردۆتە خوارەوە كە ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێ و (هیدایەت) و ڕەحمەت و مزگێنی دەریشە بۆ هەموو موسڵمانان ، بەڵام لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێت: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾ سوورەتی النساء: ٤١، واتە: دەی چۆنە ئەگەر لەهەموومەتێك شاهێدێكمان هێناوە وەهەروەها تۆش دەكەینە شاهێد ئەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر هەموو ئەوانە). ڕیوایەت كراوە لە (عبدالله ی كوڕی مەسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) پێی ووتم هەندێ (قورئانم) بۆ بخوێنە منیش ووتم چۆن بۆتی بخوێنم؟ خۆ قورئان بۆتۆ هاتووە فەرمووی بەڵێ ڕاستە بۆمن هاتووە بەڵام پێم خۆشە لە (غەیری) خۆمەوە بیبیستم جا منیش سورەتی (نیساء) م بۆ خوێندەوە

هـەتا گەیـشتمە ئـەو ئایەتـەی ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴾ سوورەتی النساء: ٤١ ئینجا فـەرمووی بەسە پاشان دیتم هەردوو چاوی پیرۆزی پڕبوون لە فرمێسك)[1]

**( ئامۆژگارییەکی گرنگ لە لێپرسینەوەو لە دادگەری خوداوەیە )**

جا بێگومـان ئـەوەی ڕاسـت بێـت خـوای گـەورە تـەنیا خـۆی خـاوەنی (صیفەتە) تەواوەکانە ، وە لەو سیفەتە تەواوانەش دادگـەری و کـار لـەجێ یە دادگەرەو ستەم لەهیچ کامێك لە بەندەکانی ناکاو کـار بـەجێ یـە هـیچ شتێك لە شوێنی خۆی نـەبێ داینـانێ جـا لـە دادگـەری و کـار لـەجێ ییدا ئەوەیـە (کـە چاکەکەران لەگـەڵ خراپەکـەران) وەك یـەك دانـانێ چوونکە بێگومان (کافر) و ئیماندار یەکسان ناکـا واتـە وەکـو یـەك دانـانێ بـاش و خراپ بەیـەك دانـانێ چـوونکە یەکسان کردنـی ئەوانـە دوا پلـەی سـتەم و نابەجێترین کارە ئەوجا بەڕاسـتی خـوای گـەورە پێغەمبـەرەکانی نـاردووە (هەروەکو لە پێـشەوە ئامـاژەمـان بـۆکرد) وە تـەرازوو و (کیتـابی) لەگـەڵ ناردوون تـا خـەڵکی لەسـەری بـڕۆن ، ئـەوەبوو کۆمـەڵێ هاتنـە سـەر ئـەو ڕێگەیەو پەیڕەویان کرد بـەڵام کۆمـەڵێکی تـر لێیـان لاداو لـە بـیرو بـاوەڕو (عەقیـدەی) حـەق و عیبـادەتی ڕاسـتەو کـردەوەی چـاك هیـچیان نـەکرد. ئەوانەی هاتنە سەر ڕێگاکە بارێکی زۆریان کەوتە سەر ئەستۆ قوربانییەکی زۆریـان دا هـەروەها بـەرەنگاری ئارەزووەکـانی خۆیـان دەبوونـەوە دژی

---

(1) بروانە پەرتوکی: (فتح الباری شرح صحیح البخاری)، دانراوی شێخ ابن حجر العسقلانی، بەرگی ٨، لاپەڕە ٧١٢.

ناهەق دەوەستان و قەلآچۆی ناهەق و تاوانیان دەکرد بە درێژایی تەمەنیان تا دوایین ساتەکانی ژیانیان خەبات و تێکۆشانیان دەکرد زۆر ماندوو بوون و ترش و تاڵیان چێشت لەم ڕێگایەدا جا ئایە لە جێی خۆیەتی ئەم بەندە سەربەرزو خوا ویستانە لە ڕیزی ئەو کەللە پوچ و بێ هۆش و گۆش و ستەمکارانە دابنرێن کە گومراییان لەسەر ڕێنوێنی بەپێش خست و خراپە کاری و ئارزوو بازی و ڕابواردنی کاتی دونیایان هەڵبژارد لەسەر ژیانی بێ کۆتایی ڕۆژی دوایی وە هەروەها ڕێگەیەکی خراپیان گرتەبەر لە کوشتن و برین و دزی و درۆو قۆڵبڕینی خەڵکی لەپێناو هێنانەدی ئاوات و ئامانجە گلآوەکانی خۆیان، جا هەروەها بێگومان هەردوو کۆمەڵ لەو کۆمەلآنە ژیانی دونییان بەسەر برد ئەوەیان لەپێناوی خواو ئالآی ئیسلام و هەق وە تاکو زەمین پاك بکاتەوە لە خراپەو بەر بەرەلآیی ، ئەوەی تریشیان خەباتی لە پێناوی مەیلو ئارەزووە دونیایەکانی خۆی دابووە پاڵ کاروانی شەیتان و کردبویانە ڕابەری خۆیان جا ئایە لەکار لەجێ یە چارەنووسی ئەم دوو تیپە وەك یەك بێ ؟! هەڵبەتە بیری تەواو ئەمە قەبوڵ ناکا ، جا کە خوای گەورە دادگەرترین دادگەر بێ کار لەجێترین (حاکم) بێ چۆن ئەمە قەبوڵ دەکا ، یەکسانی (حوکم) لە نێوان دوو ئەو دوو کۆمەڵەدا (حوکمێکی) پڕ ستەمە ئینجا خوای تەبارەك و تەعالا ئامارەی بۆ ئەمە کردووە لە قورئانی پیرۆزدا هەروەك دەفەرموێت ﴿ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءٗ مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ

﴿ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ سـوورەتی الجاثیـة: ٢١ – ٢٢، واتە: خۆ (کافرەکان) واتە بێ باوەڕەکان کە تاوان و خراپـەیان کردووە وا دادەنێین وەکو ئەوانەیان لێ بکەین کە بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە ؟ ئایە ژیان و مردنی ئەوانە وەکو یەك بێ ؟!) حـوکم و بڕیارێکی نادرووست دەدەن، وە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق و ڕەوا خولقاندووەو بۆ ئـەوەی هـەموو کەسـێ بـە گـوێرەی کردەوەکـانی جـەزای خۆی وەرگرێ و کەسیش ستەم و زوڵمی لێ نەکرێ، یەکسان کردنـی چـاکە خوازان لەگەڵ خراپە کاران تەنها ئەو کەسانە بیریانِ بۆ دەچێ کە سـادەن و وا دەزانن ژیان تەنها ڕابواردن و یارییە[1]، جا هەروەها خوای گەورە لـەم سورەتە دا ئەفـەرموێت ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ سوورەتی ص: ٢٧ – ٢٨ واتـە: بێگومـان ئێمـە ئاسمـان و زەوی و ئـەو شـتانەی لـە نێوانیاندا هەیە بە خۆڕایی و بەبێ مەبەست نەخولقاندووە، ئەمە بۆچـوونی بێ بڕواکانە (هاوار و هیلاك) بۆ بێ بڕواکان لـەو ئـاگرەی دۆزەخ ئایـە ئـەو کەسانەی بڕوایان هێناوە (حیسبا بکەین) یان ئایە پارێزکارو چـاکە کـەران وەکو بەدکارو خراپەکاران (حیساب بکەین) ، بەلاّم بەداخەوە خـەڵکی ئـەم حەقیقەتو ڕاستیە نازانن و کەم جـاران وەبیریـان دێتـەوە ﴿ وَمَا يَسْتَوِى

(١) بڕوانە/ تەفسیری ئاسان/ بۆ تێگەیشتنی قورئان/ لە نووسینی مامۆستا بورهان/ محمدامین ، لاپەڕە ٥٠٠).

ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ سوورەتی غافر: ٥٨، واتە: بێگومان کوێرو چاو ساغ وەکو یەك نابن هەروەها ئیماندارانی چاکە کارو کافرانی خراپە کاریش وەکو یەك نین بەلاَم کەمێکتان یادەوەر ئەبن و بیر ئەکەنەوە.

## (کۆمەڵێك هەن حیسابیان لەگەڵ ناکریٚ)

جا هەروەها بێگومان لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە کە کۆمەڵێکی زۆر لە ئیمانداران هەن ژمارەیان (حەفتا هەزارە) حیسابیان لەگەڵ ناکریٚ و بەبیٚ (حیساب) دەچنە بەهەشت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (يَدخُلُ من أُمَتي الجَنَة سبعونَ ألفاً بِغَيرِ حِساب فَقالَ رَجُلٌ : يا رسول الله أدعُ الله أن يجعَلَني مِنهُم قالَ أللهُمَ إجْعَلهُ مِنهُم ثُمَ قامَ آخر فَقال يا رَسول الله أدع الله أن يَجعَلَني مِنهُم قالَ سَبَقَكَ بِها عُكاشَة) رواه البخاري و مسلم، واتە حەفتا هەزار کەس لە ئوممەتی من دەچنە بەهەشتیٚ بەبیٚ (حیساب) پیاویٚ بەناوی (عُکاشە) ووتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوامن لە خوا بۆ بکە لەوانم دابنیٚ فەرمووی خوایە لەوانی دابنیٚ یەکێکی تر هەڵسا گووتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوام لە خوا بۆ بکە منیش لەوان دابنیٚ فەرمووی عکاشە پێش تۆ کەوتووە، بەلاَم لە (حەدیسی ئەبی ئومامە) کە (ڕیوایەتی) کردووە ئەفەرموێت (عَن أبي أُمامة (رضي الله عنهُ) عَن النَبي (ﷺ) وَعَدَني رَبي أن يَدخُلَ الجنة مِن أُمَتي سبعِينَ ألفاً لا حِسابَ عَلَيهُم وَلا عَذاب مَعَ كُلِ ألفٍ سَبعونَ ألفاً وَثَلاثَ حَثياتٍ مِن حَثياتِه) رواه الترمذي بسند حسن، واتە: خوای گەورە بەڵێنی داومیٚ (حەفتا هەزار کەس) لە

ئوممەتم بەبێ لێكۆڵینەوەو سزادان بباتە بەهەشت هەر هەزارێكیش حەفتا هەزار كەسی تری لەگەڵەو هەروەها وەعدەی سێ وەجبەی تریشی پێداوم بە كۆڵمەكەی خۆی بەبێ (حیساب) بیان باتە بەهەشت، بڕوانە پەڕتوكی (فەتح الباری شرح صحیح البخاری) لاپەڕە ۵۰۰۲ ، ج۱۱.

**( پاشكۆ )**

هەندێ لەزانایان ئەڵێن ئەم لێكۆڵینەوەیە لەدوای وەرگرتنەوەی دەفتەری كردەوەكانە ، هەروەها ئیماندار و (كافر) و جنۆكەو هەموو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە تەنها ئەو كەسانە ناگرێتەوە كە جیاكراونەوەو لە (حەدیس) دا هاتووە كە بێ لێكۆڵینەوە دەچنە بەهەشت [1] .

هەزار ڕەحمەت لەو كەسە بێ كە فەرموویەتی :

جا ئەكرێ حیساب بۆ جین و ئینسان — هەر عەمەلێ بێ بەد بێ یا ئیحسان

بەعضێ لەنامەی عەمەلدا موثبەت — (بەعضی) ئەعضای خۆی ئەدا شەهادەت

بەعضێ گوناهان كەس نایان بینێ — خودا بە عیلمی خۆی دەینوێنێ

ئەوجار تەرازوو دێنن بۆ تەرجیح — ئەو تەرازووە بە قەولی صحیح

تای حەسەناتی وەك بەدری مونیر — تای سەیئاتی زوڵماتە وەك قیر

سووكی بەرەو خوار قورسی بەرەو ژوور — ئەڕوا بەعەكسی تەرازووی مەشهور

خوایە عەفومان بكەی ، خوایە بەڕەحمەتی خۆت لەگەڵمان بكەی نە بە

---

(1) بڕوانە پەرتوكی ڕوونكردنەوەی (العقیدە الطحاویة) لە نووسین و وەرگێڕانی مامۆستا (عبدالله عبدالعزیز) هەرتەلی لاپەڕە ۱۱۲.

عەمەل و کردەوە خۆمـان ، (خوایـە) گیـان لەگـەڵ ئـەو کەسـانە (حەشـرو حیسابمان) بکەی بەسەهل و سوکی خوایە تەرازووی خێرو خێراتمان گران بکـەیت خوایـە لـە بـەلآو موسـیبەتی دونیـاو قیامـەت بمانپـارێزی)، أللـهُمَ حاسِبنا حِساباً يَسيراً أقولُ قَولي هَذا وَأستغفِر الله لي وَلَكُم وَلِسائر المُسلمين نَـبَهَني الله وَإيـاكُم مِـن نَومـة الغـافلين وَحَـشرَني وَإيـاكُم تَحـتَ لِـواء سـيد المُرسَلين، اللّهُمَ إغْفِر لَنَا آمين).

# ئامۆژگاری چل و حەوتەم

## باسی تەرازووی ڕۆژی قیامەت (الميزان) ئەکات

(الحَمدُ لله عالِمُ الغَيبِ وَالشَهادة مُدَبِر الأمور عَلى وفقِ ما شاء في الأزل وَ أرادَهُ فهذا أشقاهُ وَهَذا أشْهَدَهُ وَهَذا أفقَرَهُ وَهَذا فَتَحَ لَهُ أبواب الزيادة لَهُ الحَمدُ في الأولى وَالآخِرة وَلَهُ الحَكُم وَإليهِ تُرجَعون وَ أشهَدُ أن لا إلـه إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ القائِلُ في القرآن العظيم ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٦ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ۝٧ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٨ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴾ سوورەتی القارعة: ٦ – ٩ وَالصلاةُ وَالسّلام عَلَى سَيِّدنا مُحمد (صلّى الله عليهِ وَعَلى آلهِ وَصَحبهِ أجمَعين وَمَن تَبِعَهُم بِإحسانٍ إلى يَوم الدّين أمّا بَعْد أوصيكُم عِباد اللهِ بِتقوا الله وَطاعَتهِ في جَميع أوقاتكُم)، واتە لەپاش هەندێ وەسیەت و ئامۆژگاریتان دەکەم ئەی بەندەکانی خودا بە تەقواو لە خودا ترسان و پەیڕەوی کردن لەهەموو کاتێك و ساتێکدا جا هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ﴾ سوورەتی الأعراف: ٨ واتە: کێشانەو لێکدانەوەی کارو کردەوەی گشت ئەو خەڵکانە لە ڕۆژی قیامەتدا بەڕاستی و بەدادگەرانە دێتەپێش و ستەم لە هیچ کەسێك ناکرێ ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ ئینجا هەر کەسێك تای تەرازووی کردەوەکانی گران و قورس بێت لای خوا، واتە کاروکردەوەکانی گران وقورس بێت لای خوا، واتە کاروکردەوەکانی دونیای چاك بێت ﴿

﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ واته دیاره هەر ئەوانە بەختیارو سەرکەوتوو و سەرفرازن ﴿ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ واته کەسێکیش که تای تەرازووی کارو کرداری سووك و بێ بەها بوو واته : خوا نەناس بوو ﴿ فَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم ﴾ واته: ئەوانەش ئەوانەن کە زیانیان بەخۆ گەیاندووە خۆیان فەوتاند ﴿ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ﴾سوورەتی الأعراف:٨– ٩، واته چوونکه بەرامبەر ئایەت و نیشانەکانی ئێمە ستەمیان کردو ڕوویان لێ وەرگەڕاند جا ئێستاش خۆمان ئەزانین چی یان پێ ئەکەین.

**( ئاگاداری )**

جا هەروەها ئەبێ بزانین هەر کاتێ ، دەفتەری کردەوەکان وەرگێرانەوە لێکۆڵینەوە تەواو بوو تەرازوو دائەنرێ تاوەکو ئەندازەی کردەوەکان دەرئەکەوێ خوای گەورە لەم ئایەتەشدا ئەفەرموێ ﴿ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَـٰمَةِ ﴾ سوورەتیالأنبیاء: ٤٧

واتە ئێمە تەرزاووی دادپەروەری دائەنێین لە ڕۆژی قیامەت ئینجا بزانەئەم تەرازووە وەکو تەرازووی دونیا دوولای هەیەو نووسراوی کردەوەکانی پێ ئەکێشرێ ، هەروەکو لە حەدیسدا ئەفەرموێ (فَتُـضَعُ السِجلاتُ في كَفَةٍ وَالبِطاقَـة في كَفَـةٍ فَطاشَـت السِجلات وَثَقُلَـت البطاقـة) رواه أحمد والترمذي بسندٍ حسن)، بە گوێرەی ئەم فەرموودەیە زانایان ئەڵێن ئەوەدو نۆ دەفتەرەکانی خراپە لەناو لایەکی تەرازوو دائەنرێ وپسولەکەی

(لاإله إلا الله) ش لەناو گران ئەبیٚ .

(جا هەروەها ئەمەش تەفسیری ئەم چەند ئایەتەی پێشووە کە ئەفەرموێت ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾ سوورەتی القارعة: ٦ – ٧، واتە: بێگومان ئەوەی تەرازووی خێری سەنگین بێت ئەوا لە بارودۆخێکی خۆش وئاسوودەدا ژیان دەباتە سەرو زۆر پێی ڕازیە ، ئەوەش تەرازووی خێرو چاکەی سووك بێت (گوناهی زۆر بێت) ئەوە دایکی ئەو دۆزەخە باوەشی بۆ کردۆتەوە).

**(تێبینی)**

(جابری کوڕی عبدالله) (خوا لێی ڕازیبێت) دەگێڕێتەوەو ئەفەرموێت (تەرازوو لە ڕۆژی قیامەت دائەنریٚ و چاکەو خراپەی پیٚ ئەکێشریٚ هەر کەسێك (بەقەدەر) هەر دەنکە ووردیلەیەك چاکەی گرانتر بێت ئەچێتە بەهەشت هەر کەسێکیش بەقەد دەنکە ووردیلەیەك خراپەی گرانتر بێت ئەچێتە دۆزەخ هەر کەسێکیش چاکەو خراپەی بە ئەندازەی یەکتر بن ئەوە لە أعراف[1] ئەمینێتەوە).

هەروەها حذیفەی یەمانی (خوا لێی ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە ئەفەرمویٚ حەزرەتی جبرائیل (سەلامی خوای لێبێت) بەڕێوەبەری تەرازووە

(1) ئەعراف: واتە شوێنێکە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ واتە ماوەیەك ئەمینێتەوە ئینجا ئەچێتە بەهەشت ، هەندیٚ لە زانایان ئەڵێن ئەم جێگایە بۆ هەندیٚ کەسانی تریشە وەکو (ئەولادی زینا) و هەندێکی تر ..هتد..) بڕوانە تەفسیری (الجامع الأحکام) ، لە نووسینی الإمام القرطبي) ، ج١ ، لاپەڕە ٢١١.

له ڕۆژی قیامەتدا، بەلاَم لە (ڕیوایەتی) ئەنەسی کوڕی مالیکدا ئەگێڕێتەوە ئەمەش دەقی (حەدیسەکەیە) ئەڵێ عَن أنَسٍ (رَضـي الله عَنْـهُ) قَـالَ قَـالَ رَسُـول الله (صـلى الله عليـه وسـلم) مَلَـكٌ موكـل بـالميزان فَيـؤْتي بـإبن آدَم فيوقف بينَ كَفَتي الميزان فإن ثَقُلَ مزانُهُ نادى مُنادٍ بِـصَوتٍ يُـسمع الخلائـقَ شَقي فُلانٌ شَقَاوَةً لا يُسعَد بَعدَها أبَداً) رواه البزار والبيهقي . واتـە: ئەنـەس (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت فریشتەیەك وەکیلە لەسەر تەرازوو ئینجا ئادەمیزاد ئەهێنن و ڕائەگیرێ و لەلای لنگـی تـەرازوو ئەگەر قورس و گران بو کردەوەکانی واتە خێرو چاکە نـەبوو کردەوەکـانی باش نەبوو ئەمـە ئەوفریـشتەیە بـانگ ئـەکاو بـەدەنگێکی وا هـەموو خـەڵك ئەیبیـستێ و ئـەڵێ فـلاَن تاوانبـارە بـەگوناهوتاوانێکی ئـەوتۆ کـە هـەرگیز سەربەرز نابێ و ڕزگاری نابێ لە دەستی دۆزەخ .

چوونکە بێگومان ئەوڕۆژە زۆر سەختەو ناخۆشـە، جـا لەبـەر ناخۆشـی ئەم کات و ساتە و مەرگەساتی ئەو وەستانە باوك کوڕی خۆی نایەتەوە بیر دایك کۆرپە خۆشەویستەکەی لەبیر دەکـات وە هـیچ کەسـێ کەسـی لـەبیر نییە هـەروەك خـاتوو عائیـشە ئەگێڕێتـەوە ئـەڵێ: فَعَـنْ عائـشةَ (رضـي الله عنها) قالَتْ ذَكَرتُ النّارَ فلَبَكيت فَقالَ رَسولُ الله (صـلى الله عليـه وسـلم) مـا يَبكيك؟ قُلت ذكرتُ النّار فبَكيت فَهَل تذكرون أهلـيكم يـا رَسـولَ الله؟) واتـە عائشە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەڵێت ئاگری دۆزەخم بیرکەوتەوە بۆیە گریـام جا ئایە ئێوە ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) مـاڵ و منالّتـان بیردێتـەوە لـەو ڕۆوژەدا ئەویش لە وەلاَمدا فەرمووی (أمّـا في ثَلاثـةٍ مَـواطنَ فَـلا يَـذكر أحـدٌ أحداً عِندَ الميزان حَتى يَعلَم وَعِندَ الصراط إذا وُضِعَ بين ظهري حَتى يجـوز)

رواه أبو داود والحاكم). واتە: فەرمووی بەڵێ بەلأم لە سێ شوێندا کەسی لەبیر نییە لەکاتێ لەلای تەرازووی تاکو ئەزانیت ئایە لای چاکەی قورستر دەبێ یان لای خراپەی ؟ وە لەکاتی کەوا نامەی کردەوەکانی دەدرێتەوە خاوەنیان تاکو دڵنیا دەبێ کە ئایە بەدەستی ڕاست وەری دەگرن وەیا چەپی وە یا لە پشتەوە؟ وە لەکاتی کە تێپەڕ دەبێت بەسەر پردی سیراتدا کەلەسەر جەهەنەم دانراوە تاکولێی دەرباز دەبێ).

(أيّها المسلون) لا يَثقل ميزان العبد إلا بالحَسَنات وَالأعمال الصالحة فَلا وَزنَ لِلأحساب وَلا لِلأنسَابِ) واتە ئەی موسڵمانان بەندە تەرازووی کردەوەکانی هەرگیز گران نابێ تەنیا بە چاکەو کردەوەی باش نەبێ هەرگیز هیچ کێش و سەنگێك نییە بۆ (نەسەب) وە هەرگیز بنەچەو نەسەب سوود نادەن بە مرۆڤ و وە ماڵ و سامانیش بەهەمان شێوە یەکێکی تر لە چاکە بەسەنگەکانی سەر تەرازوو (صەبرو) ئارام گرتنی پیاوە لەسەر منداڵە چاکەکەی کاتێ وەفات دەکا و دەمرێ ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بخٍ بخٍ خَمس ما أثقَلَهُن في الميزان، (سبحان الله والحمدلله ولا إله إلاّ الله والله أكبَر وَالوَلَدُ الصالح يَتَوفى للمرأِ المُسلِم فَيَحتَسِبهُ) رواه النسائي و إبن ماجة ، واتە فەرمووی (پێنج شت زۆر بەسەنگن لە تەرازووی قیامەتدا (زیکری سبحان الله والحمدلله ولا إله إلا الله والله أكبر) وە منداڵی چاك کە دەمرێ لەپیاوی موسڵمان ئەویش (سەبرو ئارام دەگرێ) بە هیوای پاداشتی پەروەردگاری .

**( ئاگاداریەکی گرنگ )**

جا هەروەها بێگومان پێویستە بزانین کە پرسیارو وەڵام کۆتایی هات وهەر کەسەش (کیتاب) و دەفتەری کردەوەکانی وەرگرت ئینجا بە (ئەمری) خوا ئەچێتە لای تەرازوو تاکو بزانن چاکەی گرانترە؟ یان خراپە؟ هەروەك خوای گەورە لەم بارەیەوە لە قورئاندا ئاماژەمان بۆ دەکاوئەفەرموێ ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ سوورەتیالأنبیاء: ٤٧ ، واتە: تەرازووی دادپەروەری بۆ ڕۆژی قیامەت دائەنێین کەوابوو هیچ کەسێك ستەمی لێ ناکرێ ئەگەر بە ئەندازەی دەنکە ووردیلەیەك چاکە یان خراپەی هەبێ دەیهێنێتە ناو تەرازوو ئێمە تنها بەروەستی سەرژمێرکردنی کردەوەکان ئەکەین .

**( پاشکۆ )**

خوا پاداشتی ئەو کەسە بداتەوە کە گوتویەتی :

**چاکەو خراپە گشتی نوسراوە — تەرازووی ڕاستی لەبۆ دانراوە**

**هەرکەسێ چاکەی گرانتر دەرکەوێ — جێگەی بەهەشتە ڕازیە لەوێ**

**بەڵام ئەو کەسەی چاکەی سوکترە — ئەو قوڕ بەسەرەو جێگەی ئاگرە[1].**

**أقولُ قَولي هَذا وَأستَغفرَ الله لي وَلَكُم وَلِسائرِ المُسلمين وَالحَمدُ لله رَبِ العالَمين نَبَهَني الله وَإياكُم مِن نَومَةِ الغافلين وَحَشَرَني وَإياكُم تَحتَ لِواءِ سَيد المُرسَلين).**

---

(1) بڕوانە عەقیدەی ئیسلامی لەسەر ڕارەوی أهل السنه والجماعه لە نووسینی مامۆستا (مەلا عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی) لاپەڕە ٥١.

## (باسی القصاص واته تۆڵه وەرگرتنی ڕۆژی قیامەت)

ئەی خاوەن باوەڕان پێویسته بزانین ئەو ماف و هەقانەی کەوا لەسەر مانه وەکو (خوێن ڕشتن و زیناکردن و یا شەرەف و ناموس بردن وە یان ماڵ و سامانی خەڵکت خواردبوو یا ئازاردانی بێ تاوانان بوو یا به ناڕەوا دەستت درێژ کردبوو بۆ عەرزو ناموسی خەڵکی و وێنەی ئەمانه ... گشتی له ڕۆژی قیامەت تۆڵەی وەرئەگیرێ کەوابوو بەزووترین کات له دونیا خاوەنی ئەم هەق و مافانه ڕازی بکەو گەردنی خۆتی پێ ئازاد بکه وەکوئەم فەرموودەیە کە ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) له پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە ئەفەرموێ : عَن أبي هُريرة (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قال : قالَ النَبيُ (صلى الله عليه وسلم) مَن كانَ عِندَهُ مَظلَمةً لأخيه فَليَتَحلّله منها فإنَهُ لَيسَ ثُم دينارٌ ولا درهَمٌ من قَبلِ أن يؤخَذَ لأخيه حَسَناته فإن لَم يَكُن لَهُ حَسَنات أخذَ مِن سيئات أخيه فَطَرَحت عليه) أي في النار[1]. متفق عليه، واته هەرکەسێك حەق و ماف و زوڵم و ستەمێکی برای خۆی لەلایه با له دونیا ئەو ماف و حەقه بداتەوە چوونکه بێگومان لەڕۆژی دواییدا دینارو درهەمو دراو نییه له تۆڵەی بدا کەوا بوو لەوێ چاکەکانی زۆردار له تۆڵه وەرئەگرێ ئینجا ئەگەر چاکەی نەبوو یان بەروەستی تۆڵەی نەکرد ئەوە خراپەی زوڵم و ستەم لێ کراوەکه ئەخرێتە سەر خراپەکانی ئەوجا بزانه لەجوملەی (فَطَرِحَت عَليه) أي فى النّار ، واته ئەمه وەها دەرئەکەوێ لەلای هەندێ لەزانایان که ئەم تۆڵه وەرگرتنەی مەیدانی مەحشەر جیایەلەگەڵ تۆڵه وەرگرتنی نێوان بەهەشت و دۆزەخ کە له (حەدیسدا) هاتووە وەك حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (يَخلُصُ المؤمِنُونَ مِنَ النّار فَيُحبِسُونَ على

---

(1) بڕوانەپەرتووکی تاوانه گەورەکان لەڕوانگەی ئیسلامەوە لەنووسین و ئامادەکردنی (عبدالرحمن مەلا طه عزین) لاپەڕە ١٢٣.

قَنطرةٍ من النّار بين الجنّة والنار فيَقتَصُ لبَعضِهم مِن بَعضٍ مظالمَ كانَت بَينَهُم في الدنيا حَتى إذا هُذبوا ونَقوا أُذنَ لَهُم في دخول الجَنة) الحديث بطوله ...هتد.رواه البخاري وغيره واته : كه ئيمانداران لەپردى جەهەنەم واتە دۆزەخ ڕزگاربوون لەسەر پردێکی تر لەنێوان بەهەشت و دۆزەخ ڕائەگیرێن ئەوجا هەروەها تۆڵەیان بۆ یەکتری وەرئەگیرێتەوە هی ئەو ستەمانەی لە دونیادا لەنێوانیاندابوو ئینجا کە خاوێن و پاك بوونەوە هیچ داوایەکیان لەسەر نەما ئەوجا (ئیزن) دەدرێن بچنە بەهەشت کەوابوو ئەم پردەش جیایە لەگەڵ پردی دۆزەخ (الصراط) و ئەم تۆڵەیەش لەگەڵ تۆڵەی (حەدیسەکەی تر) جیایە چوونکە ئەوان هیچ چاکەیان نامێنێ بەهۆی ستەمەکانیانەوە ئەچنە دۆزەخ، بەڵام ئەمانە لە دۆزەخ ڕزگاربوون وبۆ بەهەشت دەڕۆن کەواتە ئەوەی ڕاست بێت بەم تۆڵەیە گشت چاکەکانیان لەدەست ناچێ[1].

ئەوە بوو بە کورتی باسی (تۆڵە وەرگرتنی ڕۆژی قیامەت) و هەروەها باسی خەراپەی زوڵم و ستەم بوو ڕەجا دەکەم خۆتان لە زوڵم و زۆرداری بپارێزن بەڵکو خودا (ڕوحمتان) پێ بکا و خوایە (ڕوحمان) پێ بکەی، خوایە لە (زوڵمی) زاڵمان بمانپارێزی و (خوایە لە بەڵا و (موسیبەتی) دونیا و قیامەت بمانپارێزی (محفوظمان) بکەیێ ئامین.

(وَصَلّى اللهُ على النبِّي الأمي وَعَلى آلِه وصَحْبِه وسَلَم، أقولُ قَولي وأستَغْفرُ الله العَظيم ليَ ولَكمَ ولِسائر المُسْلمينْ ونَبَهَني الله وإياكُمْ مِنْ نَوْمةِ الغافلين وَحَشرني وإيّاكم تحتَ لِواء المُرسيلين اللّهُمَ اغفر لَنَا آمين).

(1) بڕوانە پەرتوکی (فتح الباری –شرح صحیح البخاری) دانراوی شیخ إبن حجر العسقلانی) بەرگی ١١ ، لاپەڕە ٤٨٦.

# ئامۆژگاری چل و هەشتەم

## باسی الصراط واتە پردی دۆزەخ ئەکات

الحمدُ لله ثُمَ الحمْد لله الحمْدُ لله الذّي أمْهَلَ عَلى مَن عَصاهُ وَإذا سألَهُ أعطاهُ صعب لواحظ الأيمن مَتى الدّنيا فَلا عين تراهُ الذّي أعَدَ الجَّنة لمن إتقاه ؟ وَأعَدَ النّارَ لِمَن عَصاهُ وَخَلَق للدّارين خَلقاً وصمّ في أصْلاب أبائهم فلا مُخير لمّا خلقهُ وَأمضاهُ من توكّل عليه كفاهُ وَمَنْ فَوض أمرَهُ إليه دَبَره وَهَداهُ أحمَدُ سُبحانهُ وَ تعالى في عُلاهُ وَأشهَدُ أن لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لا شريكَ لَهُ إله تنزه عَن كُلِ ما سِواه، وَالصلاة وَالسلام عَلى سيّدنا مُحمد (صلى الله عليه وسلم) وَعَلى آلهِ وَ أصحابه أجمَعين وَمَن تَبِعَهُم بإحسان إلى يوم الدين (أما بَعدُ أيها المسلون أوصيكُم عِبادَ الله بتقوا الله وَطاعَتِه في جميع أوقاتِكُم) واتە لەپاش هەندێ ئەی موسڵمانەکان وەسیەتتان لێ دەکەم ئەی بەندەکانی خودا بە پەیڕەوی خوداو ملکەچی ئەوبن و لەهەموو کات وساتێك دا چوونکە بێگومان سەرکەوتن و سەرفرازی لە گوێڕایەڵی ئەوان دایە ، ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێت لە قورئاندا : ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾واتە: ئەی خەڵکینە ئیلا دەبێ هەموو نزیکی ئاگری دۆزەخ ببنەوە وەبەسەر پردەکەی (صراط)دا تێپەڕن وە بە تەفسیرێکی تر دەبێ هەموو بەسەر دۆزەخ دا تێپەڕن ، هەندێ لە (موفەسیرەکانی) تر ئەڵێن کێشەو جیاوازیان هەیە (ئیبن و عەباس)ئەفەرموێ (بەمانای چوونە ناو دۆزەخەوەیە ، واتە هەردەبێ هەموو بچنە ناو دۆزەخەوە پاشان

هەرکەسوبۆ جێی شیاو بە خۆی دەنێردرێ ، بەلاَم هەندێ تر لە (موفەسیرەکان) دەڵێن بە مانای نزیك بوونەوە و تێپەڕ بوونە بەسەر ئەو پردەدا لەسەر پشتی دۆزەخدا ئامادەکراوە ئەمە (إختیاری أمام) تەبەریە جا زۆربەی (موفەسیرەکان) لەسەر ئەمەن، جا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ ،واتە ئەمەش بڕیارێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئەوە دراوەوبڕاوەتەوە شتێکی حەتمیە ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ واتە پاش تێپەڕبوونی هەمووان بەسەر ئاگری دۆزەخدا ئەوجا ئەوانەی وا پارێزگارو خواناس بوون لەئاگرەکە ڕزگاریان ئەکەین ﴿وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ سووورەتی مەریم:٧١- ٧٢ ، واتە : ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا دەستەو ئەژنۆ دێلینەوە (قاضي بیضاوي) لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێت : مەبەست لەو (ورودە) ئەوەیە کە ئەم خەڵکە لە دۆزەخدا هەموو بە چۆکدا دێن بەلاَم لە پاشان باوەڕداران ڕزگار دەبن و(کافرەکانیش) لەوێ دەمینێنەوە[1].

بەڵی پردی سیرات هەندێ زانایان ئەفەرموون لە شمشێر تیژترە لە موو

---

(!) ئیمام نەوەوی(ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەڵێ مەبەست بەچوونە ناو دۆزەخ تێپەڕ بوونە بەسەر پردی (صیراط) و دۆزەخدا کە پردێکە (زۆر باریکە بەڵکولە موو باریکترە لە ئەڵماس تیژترە) ئەم پردە لەسەر پشتی جەهەنەم واتە دۆزەخ دانراوەو ئینجا دۆزەخیەکان لێی ئەکەونە خوارەوە وەئیمان دارانیش ڕزگاریان ئەبێ بە ڕەحم و بەزەیی خوا) بڕوانە شەرحی صحیح مسلم لە نووسینی ئیمام نەوەوی بەرگی ٩ لاپەڕە ٣٩٢.

باریکتره هەروەکو لەپێشەوە باسمان کرد جا هەروەها بێگومان (ابو هریره) ڕیوایەت دەکا لە پێغەمبەر (ﷺ) کەوا ئەفەرموێت : (ثُمَ یضرب الصراطُ بینَ ظهراني جَهَنَم فأكون أولَ مَن یجوز من الرُسل بأمَتـه وَلا یـتَكَلَمُ أحَدٌ یومَئذٍ إلا الرُسل وَكَلامُ الرُسل یَوْمئذٍ (اللّهُمَ سَلمْ سَلمْ) رواه الشیخان، واتە: لە پاشان پردی صراط دادەنرێت لەسەر پشتی دۆزەخ وە من یەکەم کەسم لە پێغەمبەران کە دەپەڕمەوە لەسەری بە ئوممەتەکەم وە کەس لەو ڕۆژە قسە ناکات تەنها پێغەمبەران نەبێت وە قسەی پێغەمبەرانیش ئەوەیە (خوایە ڕزگارمان بکە.. خوایە ڕزگارمان بکە) جا هەروەها هاوەڵی بەڕێز أبوسعید الخدری (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ پێم گەیشتووە بیستوومە کە پردی سیرات باریکترە لەتاڵە موو وە تیژترە لە دەمی شمشێر وە هەروەها لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی (ثُمَ یُؤتی بالجِسرِ فَیَجْعَلُ بینَ ظَهري جَهَنم قُلنا یا رَسولَ الله وَما الجِسرُ، قالَ مُدحِضَةٌ مُزّلَة عَلیه خطاطیف وَ كَلالیبَ وَحَسكَةٌ مُفلطحة لَها شَوكةٌ عُقَیفاء تكون بِنَجدٍ یُقالُ لَهَا السَعدان) رواه الشیخان، واتە: پاشان پردی سیرات دەهێنرێت و لەسەر پشتی دۆزەخ دادەنرێت ووتمان ئەەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پردە چییەو چۆنە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پردی صیراط ڕێگەیەکە کۆمەڵە قولاب و ڕاکێشەرێك هەیەو دڕکی (عُقیفاء) ی پێوەیە کە بەلەشیانەوە دەنووسێت وڕایان دەکێشێت ئەو ڕکە ئاسنێکی دەم تیژی چەماوەیە کە شتی پیا هەڵدەواسرێت) وەکو ئەوقولابەی کە (قەصابەکان) گۆشتی ئاژەڵی پیا هەڵدەواسن ، پێی دەوترێت دڕکی (سەعدان) کە لە وولاتی (نەجد) هەیە ..) بەلام لە (ڕیوایەتی) مسلم دا دیسان ئەبو سەعیدی

الخدری (خوا لێی ڕازی بێت) ئەفەرموێ: عَن أبي سعيد الخضري (رضي الله عنه) في حديثه الطويل .. إلخ) قالَ النبي (صلى الله عليه وسلم) ثُـمَ يَـضربُ الجِسرُ عَلى جَهَنَم وَتحلُ الشَّفاعة فَيَقُولون أللهُمَ سَلِم سَلِم قيلَ يا رسول الله (صلى الله عليهِ وسلم) وَما الجِسرُ؟ قالَ دَحضُ مَزِّلة فيه خطاطيفُ وَ كَلاليبَ فَيَمرُ المؤمنُون كَطرف العين كَالبَرقِ وَ كالريحِ وَ كالطَيرِ وَ كأجاويدَ الخَيلِ والركابِ فناجٍ مُسلِمٌ وَمخدوسٌ وَ مَكدوسٌ في نارِ جَهَنَم) رواه البخاري ومسلم وَاللفظُ لَهُ)، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ئینجا پرد لەسەر دۆزەخ دائەنرێ و کاتی (شەفاعەت) دێ و موسڵمانان ئەڵێن (خوایە سەلامەت بکە سەلامەت بکە) گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم پردە چی یە؟ فەرمووی شتێکی لووسە (پێی لێ ئەخلیسکێ) و لەم لاو ئەولا قولابی پێوەیە خاوەن باوەڕان بەسەری دا تێدەپەڕن هەندێك وەك چاو چوقانێك هەندێك وەك برووسکەو هەندێك وەك باڵندەو هەندێك وەك ئەسپی چاك و ئەوجا ئی وا هەیە قولاب ئەیگرێ و برینداری ئەکەن و بەڕەڵا ئەبێ بەسەلامەتی دەپەڕێتەوە وە هی واش هەیە لەسەر پردەکە هەردەدێرێ بۆ خوارەوەو ئەکەوێتە ناو دۆزەخ.

## (چەند تێبینیەك)

یەکەم) پردی (صیراط) ئەو پردەیە کە ڕاخراوەو درێژکراوەتەوە بەسەر پشتی دۆزەخدا تیژترە لەدەمی شمشێر یا باریکترە لە تاڵە موێك و خلیسکەو پێ لەسەری هەڵدەخلیسکێ ، ڕێگەیەکی زۆر تاریك و ناخۆشە بەم لاو بەو لایەوە کۆمەڵێ قولاب و ڕاکێشەرێکی ئاگرین پێوەی

هەڵواسراوە موسڵمانانی شوێن کەوتووانی پێغەمبەران (درودی خوایان لەسەر بێ) بەسەریا تێدەپەڕن و ڕزگاریان دەبێ .

هەروەها دەگێڕنەوە گووتراوە درێژایی ئەو پردە سەختەو ناڕەحەتە (پانزە هەزار) ساڵە ڕێیە هەروەکو لە حەدیسدا بەیان کراوە) .

دووهەم) ڕۆیشتنی موسڵمان بەناو ئاگری دۆزەخدا بریتیە لە ڕۆیشتن بەسەر پردی (صراط) دا نەك چوونە ناوی بەلام ڕۆیشتنی بێ باوەڕو (کافرەکان) بریتیە لە چوونە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەمە بۆچوونی زانای پایەبەرز (عبدالرحمن کوڕی زەید کوڕی أسلم)ە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، هەروەها زانای پایەبەرز حافظ (حکیمی) (رەحمەتی خوای لێبێت) گێڕاویەتیەوە[1] جا هەروەها قۆناغی تێپەڕ بوون بەسەر پردی (صراط) یەکێکە لە ترسناکترین ئەو ناخۆشی و ناڕەحەتیانەی کە ڕووبەڕووی موسڵمان دەبێتەوە لە دوارۆژدا وەموسڵمان ترس و لەرزو دڵە ڕاوکێی ئارام نابێتەوە تا لەو پردە ڕزگاری نەبێت و بەجێی نەهێڵێت و نەکەوێتە پشتیەوە ، جا هەروەها بێگومان پێشبڕکێی ڕاستەقینە و یەکلاکەرەوە لەنێوان خەڵکیدا ئەوەیە کە لەسەر پردی (صراط) ڕوو دەدات نە لە دونیا ئینجا خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴾ سوورەتی یس: ٦٦ واتە خۆ

(1) بروانە: پەرتوکی (چۆن ڕزگارت دەبێت) لە ناخۆشی و ناڕەحەتیەکانی سەر پردی (صراط) لەنووسینی (د.محمد بن ابراهیم النعیم) لەوەرگێڕانی مەلا شاخەوان جەواد ئەحمەد ، لاپەڕە ٧، ئەویش لەپەرتوکی (معارج القبول) ی حافظ ی حەکیم ی وەرگرتووە) .

ئەگەر بمانەوێت نەبینن ئەوە ئاسەواری چاوەکانیشمانمان نەدەهێشت تا نەیبینن ئەوکاتە پێشبڕکێیان کرد بەرەو ڕێگاکە ڕێگای پردی (صراط) تا بیبڕن و بپەڕنەوە ، بەڵام چۆن دەتوانن بپەڕنەوە لە کاتێکدا ئێمە کوێرمان کردبن .

سێ هەم) جا هەروەها ئەو موسڵمانانەی کە بەسەریدا دەڕۆن یان بە سەلامەتی ڕزگاریان دەبێت یان بە ناڕەحەتی و ئازارێکی زۆرەوە ڕزگاریان ئەبێ، یان بێگومان دەکەونە ناو ئاگری دۆزەخەوە[1]، حەزرەتی سەلمانی فارسی (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (ويوضَع الصّراطَ مَثل حدّ الموسِ فَتقول المَلائكة مَن يجوز عَلى هذا ؟ فَيَقول مَن شِئتُ مِن خَلقي فيَقولون سُبحانَكَ ما عَبَدناكَ حقَ عِبادَتِكَ) رواه الحاكم وَصَححهُ الألباني برقم (٣٦٢٦).

واتە پاشان پردی (صراط) لەسەر دۆزەخ دادەنرێت ئەوەندە تیژە بەوێنەی دەمی موس فریشتەکان دەڵێن کێ هەیە بتوانێت بەسەریدا بڕوات و تێپەڕێت ؟ خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت ئەو بەندانەی کە خۆم ویستم لێ یە پاشان فریشتەکان دەڵێن پاکی و بێ گەردی بۆتۆ ئەی پەروەردگار بەڕاستی ئێمە تۆمان بەتەواوی نەپەرستووە و عیبادەتی تەواومانبۆ نەکردوویت .

چوارەم) ملازمة المسجد لأداء صَلوات الجُمُع والجَمَاعات/ واتە: بێگومان ئەوەی بەردەوام بێت لە هاموشۆی مزگەوت و نوێژە کۆمەڵەکان و هەینیەکان ئەوا لەسەر پردی (صراط) ئەپەڕێتەوە هەروەك ابو الدّرداء

---

(1) ئەوانەن (کافرەکان) و بێ باوەڕەکان کە ئەکەونە ناو جەرگی دۆزەخ.

(خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتـەوە دەڵـێ گـوێم لـە پێغەمبـەر (ﷺ) بـووە دەیفەرموو (المَسْجدُ بَيتُ كُلِ تَقيٍ وتَكفلَ الله لِمَنْ كَانَ المَسجدُ بَيْتَـهُ بـالرّوح والرّيحـان والرّحمـة والجـوازِ علـى الـصِراط إلى رِضـوان الله إلى الجنـة) رواه الطبراني، واتە : مزگەوت خانووی گشت لە خوا ترسـێکە وە خـوای گـەورە بەڵێنی پێ دەدات بەکەسێ کە مزگـەوت مـاڵ و مـەنزڵگای بێـت وە پێیـوە هۆگر بێ کە بەزەیی پێ بکاو لە پردی صراط دەرەبازی بکات بۆ بەهەشتی پان و بەرین)).

پێنجەم)وَمِن ذَلكَ تَيسير المعلّم ما عَسَرَ عَلى أخيـه)، واتـە: یـەکێکی تـر ئەوەیە ئاسانکاریەك بۆ برای موسڵمان کاتێ کە بار گرانـی دەکەوێتـە ملـی چوونکە هەر کەسێ ئەو نارەحەتیـە لەسـەر بـرای دینـی لاببـا ئـەوا خـوای گەورە لە پردی (صراط) دەربازی دەکات، دەگێڕنـەوە لـە خـاتوو عائیـشە (خوا لێـی ڕازی بێـت) کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (مَـن كـانَ وَصـلة لأخيه المسلم إلى ذي سلطان في مبلغ برّ أو تَيسيرَ عَـسيرٍ أن الله تعـالى علـى إجازة الصراط يومَ القيامة عِندَ دَحضِ الأقدام) رواه الطبراني و ابـن حبـان، واتە: هەر کەسێ ببێتە هۆی ئاسانکارییەك بۆ بـرای موسـڵمان لای خـاوەن دەسەلاتێ بۆ چاکە پێ گەیانێکی یا بار بۆسووك کردنێ ئەوا خوای گـەورە یارمەتی دەدات لە تێپەڕ بوونی بەسەر پردی (صراط) دا لەڕۆژی دوایی لـە کاتێ کە خەڵك پێیەکانیان دەخلیسکێ بۆ (جەهەنەم) واتە دۆزەخدا.

هەزار ڕەحمەت لەو کەسەی کە گووتویەتی :

| | |
|---|---|
| دوای ئەمە پردی دائەنرێ بەراس | باریك تر لە موو تیژتر لە ئەڵماس |
| جێگەی ئەو پردە لەسەر سەقەر | بەریا ئەکەن مەخلوقات گوزەر |
| بەعزێ دەخزین تا ئەکەونە خوار | لە جەهەنەما ئەبن گرفتار |

بەعزێ (مثلی) بەرق بەعزێ وەك بای ووشت      لێی عبور دەکەن دەچن بۆ بەهەشت

کەچوونە بەهەشت مەخلوقات یەکسەر      بە ئیسراحەت ئەچنە سەر کەوسەر)

لە کۆتاییدا داواکارم لـە خـوای گـەورە ، ڕزگارمـان بکـات بـە (ڕەحـم و بەزەیی خۆی) وە بەلوتف و کەرەمی خۆی لەهەموو ناخۆشیەك بەتایبەتی ناڕەحەتی و ناخۆشی دوارۆژ بەتایبەتی ڕزگارمان بکات و دەربازمان بکـات لە سەرپردی (سـیرات) ئـامین (نـبهني وایـاکم مـن نومـة الغـافلين وعَـشَرَني وايّاكُم تَحْتَ لِواء سيّد المرسلين اللّهُمَ اغفرْ لَنَا آمين).

# ئامۆژگاری چل و نۆهەم

## باسی حەوزی کەوسەر ( الکوثر ) ئەکات

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمْدُ للهِ ما تَوفيقي وَلا إعتصامي إلاّ بالله عَليهِ تَوكلت وَإليه أُنيبْ الحَمدُ لله الذّي أنزَلَ القُرآن هُدىً للنّاس وبَينات مِنَ الهُدى وَالفُرقان وَ أشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شريكَ لَهُ (الرّحمن عَلّمَ القرآن) وَاشهَدُ أن سيّدنا محمّداً عَبدَهُ وَ رسُولَهُ المؤيد بالمُعْجِزات والبُرهان والحوض الكُوثر وَالصلاة والسَلام عليه وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ الذّينَ جاهَدوا في الله حَقَ جِهادِهِ بالمالِ وَللّسان وَسَلم تسليماً كثيرا (أما بَعد أوصِيكُم بتقوا الله وَطاعَتهِ وَلزومِ أوامره) واته: لەدوای ئەمە (ئیمان داران وەسیەتتان لێ دەکەم بەتەقوای خوداو گوێڕایەڵی فەرموودەکانی خوداو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وە پەیڕەوی فەرمانەکانی خودای گەورە، چوونکە بێگومان سەرکەوتن و سەورفرازی لە گوێڕایەڵی ئەوان دایە جا هەروەها لە ووتاری ڕابردوو باسی ئەوەمان کرد کە (حساب) تەواو بوو تەرازوو دانراوە شەفاعەت کرا پاش ئەمە ئەوا پردی (صراط) دادەنرێت و ئاوی حەوزی کەوسەر و ئینجا لە دواییدا بۆ ئیماندار یەکسەر بۆ بەهەشت .

ئەوجا بێگومان کە دادگای مەحشەر کۆتایی هات موسڵمانان دەچنە سەر حەوزی پێغەمبەر (ﷺ) لەو حەوزەوە ئاو دەخۆنەوە چوونکە ئاوی ئەو حەوزە کەوسەرە لە ڕووباری (الکوثر) پڕ ئەکرێ و سەرچاوەی ڕووبارەکەش لە بەهەشتە).

## ( ئاگادارییەکی گرنگ )

جا بێگومان لە فەزڵ و گەورەیی سورەتی (الکوثر) دا ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕوویەکی خۆش و گەش و دەم بە زەردە خەنەوە سەری بەرزەوەکرد ، جا ئێمەش ووتمان هۆی ئەو زەردە خەنەیەت چ بوو ئەی پێغەمبەر ؟ فەرمووی هەر ئێستا ئەم سوورەتەم بۆ هات خوێندیەوە فەرمووی : ﴿ إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ﴾[1] سووورەتی الكوثر: ١ — ٣، پاشان فەرمووی دەزانن کەوسەر چی یە ؟ کەوسەر چۆم و تافگەو ڕووبارێکە لە بەهەشتداو بەرەکەتێکی یەکجار زۆری هەیە ، حەوزو گولاوێکە پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم کە لە قیامەتدا ئومەتەکەم بێنە سەری و بە ئەندازەی ئەستێرەکانی ئاسمان لێوان و پەرداخ و گلاسی تێدایە هەندێ کەس لێی بێ بەش دەبێ منیش دەڵێم ئەی پەروەردگاری منە خۆ ئەوانە لە ئوممەتی منن خوا ئەفەرموێ تۆ نازانی پاش تۆ ئەوانە چی یان کرد؟[2] .

---

(1) واتە: بەڕاستی ئێمە چاکەو خێرو خۆشیەکی زۆر گەورەمان بەتۆ بەخشی کە مایەی سەربەرزی دونیاوقیامەتیە یەکێ لەوانە ڕووبارێکی تایبەتە لە بەهەشتدا (فَصَلِّ لِرَبِّك)، جا نوێژ بکە بۆ پەروەردگارت (وَانْحر) واتە لە سوپاسی ئەو هەموو چاکەدا هەر بۆ ئەو (قوربانی) بکەو واتە وەك قورەیش مەبە کە بۆ بتەکانیان ئاژەڵ سەربڕن (إن شانئك هو الأبتر) واتە بەڕاستی هەردژو ناحەزەکانت بێ وەجاغ و دوابڕاون).

(2) بڕوانە (تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز) لە دانانی خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا عبدالكريمی مدرس)، بەرگی ٧ ، لاپەڕە ٣١٦.

(تێبینی)

جا هەروەها بێگومان زانایانی (ئەهلی عەقیدە) ئەفەرموون هەرکەسێ لە (شەریعەت) و ڕێگای پێغەمبەر (ﷺ) لایدابێ ئەمە ناگاتە سەر ئەو حەوزە و ئاوی لێ ناخواتەوە ئینجا بزانە بێگومان رای بەهێزترین زانایان ئەمەیە کە حەوزی کەوسەر لە گۆڕەپانی مەحشەرە).

بەلآم رای (دووەمین) ئەفەرموێ لەدوای تێپەڕ بوونی پردی (جەهەنەم)ە واتا دۆزەخە، ئینجا بەهەر جۆرێك بێ ئاوی ئەو حەوزە لە هەنگوین شیرینترە چوونکە (حەدیس) ئەفەرموێت هەر کەسێك لێی بخواتەوە جارێکی تر تینوی نابێتەوە ، بەلآم ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خوای لێبێت) لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) بۆمان دەگێڕێتەوە (کەوسەر) جۆگەیەکە لە بەهەشتدا قەراخی جۆگەکە لە هەردوو لاوە ئالتونەو ناو جۆگەکە لە دووڕو یاقووتە ئاوەکە لە هەنگوین شیرینترە لە (بەفر) سپیترە زەویەکەی لە میسك بۆن خۆشترە[1]، هەزار ڕەحمەت لەو کەسە بێ کە گووتویەتی :

پێش بچیە بەهەشت ئەی برای موسلمان لەلای پێغەمبەر(ﷺ) تۆ ئەبیە میوان))

لە حەوزی کەوسەر ئاو ئەخۆیەوە هێندە شیرینە تێنوو نابیەوە

یەکێك لە زانایان بە هۆنینەوە ئەفەرموێت :

کەوسەر حەوزێکە ئاوی ئەو لەشیر سپیتر بۆنی خۆشتر لە عەبیر

هەر کەس هەزار ساڵ لە جەهەنەم بێ موبتەلای ئیش و دەردو ئەلەم بێ

---

(1) وەك لە حەدیسەکەیدا هاتووە: (تُربَتُهُ أطيَب مِنَ المِسكِ وماؤهُ أحلى مِنَ العَسَلِ وأبيضُ مِنَ الثَلجِ) رواه الترمذي .

**که ئاوی خواردەوە لە حەوزی کەوسەر قەت تێنوی نابێ بەنەصی خەبەر**

(خوایە گیان) بۆ خاتری گەورەیی خۆت ڕەحممان پێ بکەی، خوایە لەبەر خاتری خۆشەویستەکەت کە حەزرەتی (محمد المصطفی)ی نازدارە (عەفومان بکەی)، خوایە ئاوی حەوزی کەوسەرمان بە (نسیب) بکەی ، خوایە لە نەخۆشی زاهیرو (باطن) مەحفوزمان بکەی، خودایە ئێمەو دایك وباوك و دۆست و برادەرو گشت موسڵمانان لە بەلاو موسیبەتی دونیاو قیامەت بپارێزی، ئامین).

(نَبَهَني الله وَ إياكُم مِن نَومة الغافلين وَحَشَرني وَإياكُم تَحْتَ راية سيّد المرسلين، رَبّنا ما خَلَقْتَ هَذا باطِلاً سُبحانَكَ فَقِنا عَذابَ النّار).

# ئامۆژگاری پەنجاهەمین

## باسی ( جەننەت ) واتا بەهەشت ئەکەین

الحمْدلله الذّي جَعَلَ الجَنّةَ دار نَعيم وَ نوال وَ بَوأها لِعباده الذّين أحْسنوا القَولَ وَالعَمَل بحمْدهِ سبْحَانَه وَتعالى وَنَشكرهُ عَلى التّوفيق وَالهداية وَنَستَعينَهُ وَنَستغفَرهُ مِن كُل كبيرةٍ وَ صغيرةٍ وَنسألهُ النجاةَ وَحُسن العاقبة وَنَشهَد أن لا إله إلاّ الله وحْدهُ لاشَريك لهُ عالمِ الغَيب والشهادة وَنَشهَدُ أنَ سيّدنا محمّداً عَبدَهُ وَرَسولَهُ وَخيْر البرية والصّلاة والسّلام عليه وعلى آله وأصحَابه الكّرام والتابعينَ لَهُم بإحسان إلى يوم الدّين، مَن يُطع الله ورسوله فَقَد فازَ وَأهتدى وَمَن يَعصي الله وَرَسُولهُ فقدْ غَوى وأعتدى (أمّا بَعد أيّها المُسلِمون الكِرام أوصيكُم بتقوا اللهِ وطاعتهِ وَلزومِ أوامرهِ) واتە لەپاش هەندێ ئەی موسڵمانە بەڕێزەکان وەسیەتتان لێ دەکەم بە تەقوای خوداو بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوداو چوونکە بەڕاستی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴾ سووورەتی النحل: ١٢٨، واتە: بەڕاستی خواش لەگەڵ ئەوانە دایە کە خۆ پارێزو بەتەقوان ئەوانەش چاکە کارو چاکە خوازن ئەوجا هەروەها خوای گەورە لەم چەند ئایەتانەدا ئەفەرموێت لە (وەصفی) بەهەشت و پارێزگاران و دانیشتوانی بەهەشتدا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴾ واتە: بێگومان پارێزگاران لە جێگایەکی هێمن وئاسایش دان ﴿ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾ واتە لەناو چەندان باخ و سەرچاوە دان ﴿ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ ﴾ واتە : ئاوریشم و

حەریری ناسك و ئەستور لەبەر دەكەن ﴿ مُّتَقَـٰبِلِينَ ﴾ واتە هەموو بەرامبەری یەكن لە كۆڕی دانیشتنەكانیاندا ﴿ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾ هەروەها وەسفمان كرد بۆت هاوچووتمان كردوون بە ژنانی سپی و چاو گەورەو جوان، ﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَـٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴾ واتە : داوا دەكەن لەو بەهەشتانەدا هەر جۆرە میوەیەك حەزی لێ بكەن بێ ترس لە مردن و لەهەر شتێكی تر ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ﴾

واتە مەرگی یەكەم كە لە دونیادا چەشتیان، ئیتر هیچ مردنێكی تر ناچێژن وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ (يؤتي بالمَوتَ في صورة كَبشٍ أملح فيتوقفُ بيْنَ الجنّةِ وَالنّارِ ثُمَ يذبحُ ثُمَ يُقال يا أهل الجنّة خلودٌ فَلا مَوت وَ يا أهلَ النّارِ خلودٌ فَلا مَوت) متفق عليه واتە مردن لە دیمەنی بەرانێكی شاخدار ئەهێنرێ و لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەگیرێ وسەردەبڕدرێ لە پاشان بەهەردوولا دەگوترێ ئیتر قەت نامرن وە هەتا هەتایە ئەوە ژیانتانە) جابر (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ لە پێغەمبەریان پرسی ئایە بەهەشتیەكان ئەخەون؟ فەرمووی (النومُ أخو المَوتِ وَأهلُ الجَنَةِ لا يَنَامُونَ) رواه الطبراني، واتە: خەو برای مردنە بەڵام بەهەشتی قەت ناخەون ﴿ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴾ واتە: لەسزای دۆزەخیش پاراستونی ﴿ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ﴾واتە : ئەمەش زیادە ڕێزێكە لەلایەن پەروەردگارتەوە ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ سوورەتی الدخان:٥١– ٥٧ ، واتە: ئەوەش سەركەوتنە گەورەكە و مەزنەكەیە .

## باسێك له ناوەكانی بەهەشتی ڕازاوە

١) (جنّة): واته بەهەشت ناوێکی گشتی یە بۆ ئـەو ماڵـەی کـە جۆرەهـا خۆشی وپـشوی تێدایـە ، هـەروەها لـە ڕاسـتیدا ووشـەکە لـە داپۆشـینەوە هاتووە لەبەر ئەوەش بە باخ و بێستان دەوترێت (جنّة).

٢) دار السلام: واته ماڵی ئاشتی کەلەم ئایەتەدا ئاماژەی بـۆ کـراوە وەك ئەفەرموێت : ﴿ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ ﴾ سوورەتی یونس: ٢٥

واته خواش بۆ ماڵی ئاشتی و سەلام واته بـۆ بەهەشـتی خـۆی بانگتـان دەکات .

٣) جنّة الخلد: واته بەهەشتی نـەبڕاوەو هـەتا هـەتا وەك خـوای گـەورە ئەفـــــەرموێت ﴿ قُلۡ أَذَٰلِكَ خَيۡرٌ أَمۡ جَنَّةُ ٱلۡخُلۡدِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۚ كَانَتۡ لَهُمۡ جَزَآءٗ وَمَصِيرٗا ﴾ سوورەتی الفرقان: ١٥. واته: ئەی مُحمد پێیـان بڵـێ ئاخۆ ئەو حاڵەی کافرانه چاکترە، یا ئەم بەهەشتە بەردەوامەو هەتا هەتایە کە بەڵێنی بە خواناسان و پارێزگـارانی سـنوورەکانی خـودا داوە ؟ کـە لـە دواڕۆژدا هەم پاداشتی کارەکانیانـە وە هـەم جێـی حەسانەوەشیانە، یـان وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴾ سـوورەتی الحجـر: ٤٨ واتـە: هـەرگیز لـە بەهەشـتدا دەرنـاخرێن و لێـی دەرناکرێن .

٤) دَارُ المقَامَة : واته ماڵی مانەوەو نیشتەجێ بـوون خـوای گـەورە لـە زمانی بەهەشتیەکانەوە بۆمـان دەگێڕێتـەوە کـە دەڵـێن ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ٣٤ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ

ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ ﴾ سـوورەتی فـاطر: ٣٤ — ٣٥ واتـه: بەهەشتیەکان دەڵێن سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی پـەژارەی تـاوان و خراپەو وەرنەگیرانی کـردەوەی لەسـەر لابـردین بەڕاسـتی پـەروەردگارمان لێبوردەیە بەرامبەر ئەو تاوانبارانەی تەوبەی ڕاستەقینە دەکەن و سـوپاس گـوزارە بـۆ ئـەو کەسـانەش کـە گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی خـوان ئـەو پەروەردگارەی کە ماڵی مانەوەی نیشتەجێ ی پێ ڕەوا بینن کە ناڕەحەتی و ماندوویەتی تێدا ناچێژن).

٥) جنّـةُ المَـأوى / واتـە بەهەشـتی ئارامگـاە یـا جێگـەو باخـەکانی حەوانەوە، هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴾ النجم: ١٥واتە لای (سدرە المنتهی) بەهەشتی ئارامگای لێیە بەهەشتێکە بێگومان کە جێگای حەوانەوەو سەقامگیر بوونە .

٦) جنّاتُ عدنٍ/ واتە باخەکانی جێگای عدن یانی حەوانەوە، ئینجا لـەم بارەیـەوە خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ﴾سوورەتی مریم: ٦١، واتە بەهەشتی حەوانەوەی خوای میهرەبان پەیمانی داوە کە بیان بەخشێت بەو بەندانەی خۆی کـە بـەنادیاری (غیـب) یش بەتەمای بوون و باوەڕیان پێ ی هەبوو).

٧) دارُ الحَیَوان/ واتە ماڵی ژیان وزیندەگی، جا هەروەها خـوای گـەورە ئەفـــەرموێت ﴿ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾ سوورەتی العنکبوت: ٦٤ ، واتە : مـاڵی پاشـەڕۆژ بریتیـە لـە مـاڵی ژیـان و زیندەگی وە ئەویش شایستەی هەوڵدانە بۆی .

٨) الفـردوس/ جنـات الفـردوس : واتـه باخـەکانی جێگـەی فـیردەوس چوونکه ئـەم ووشـەیە بـەواتای (بـاخ و بێستان) دێـت خـوای گـەورە لـەم بارەیـــــەوە ئەفـــــەرموێت:﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ سوورەتی المؤمنون: ١٠ – ١١

واتە: ئەوانەن کە میراتگرن ئەوانـەی (فـیردەوس) بـە مـیرات دەگـرن و بەهەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە[1].

٩) جنّـات النَعـیم/ جـا بەڕاسـتی ئـەم نـاوە نـاوێکی کۆیـە بـۆ هــەموو بەهەشتەکان کە بە واتـای (بەهەشـتی نـازو نیعمـەت) دێـت، ئینجـا خـوای گەورە لەم بارەیـەوە ئەفـەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴾ سـوورەتی لقمـان: ٨ ، واتـە : بەڕاسـتی ئـەوەی باوەڕیـان هێناوە کردوەی چاکیان کردووە بەهەشتانی پڕ نازو نیعمەتیان پێ دەبڕێت و بۆیان دانراوە .

١٠) المقام الأمين: واتە پێگەی هێمنی وئارامی یا جێگەی مانـەوەی بـێ تـرس جـا هــەروەها خـوای گـەورە ئەفـەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴾ سوورەتی/ الدخان: ٥١ واتە بەڕاسـتی ئەوانـەی پـارێزەرو لـە خـوا ترسن لە پلەیەکی هێمن وئاسایشدانەو لەهەموو ناخۆشیەك و ناڕەحەتیـەك بە دوورن).

---

(١) بڕوانە: بەهەشت لەژێر ڕۆشنایی قورئان و فەرموودە (صەحیحەکانی) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نووسینی (باوکی محمد) لاپەڕە ١٢.

١١) مَقعَدِ صِدقٍ/ واتـه جێگـەی ڕاسـتەقینەو شـوێنی ڕاسـتەقینە، یـا جێگای ڕاستی و ڕاست گۆیان، خوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّـٰتٖ وَنَهَرٖ ۝٥٤ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴾ القمر: ٥٤ — ٥٥، واتـه: بەڕاستی پارێزگاران و لە خوا ترسان لەباخات و کەناری جۆگەو ڕووبار دان لە جێگەی ڕاستەقینەی پەسەند دان لای پادشای دەسەلاتدار .

١٢) قَدمَ صِدقٍ/ پلەوپایـەی ڕاسـتەقینە: واتـه ئـەی پێغەمبـەر (ﷺ) مورژده بەوانەی باوەڕیان هێناوە کـەوا شـوێن و پایـەی ڕاستەقینەیان لای پـەروەردگار پـێ دەدرێـت ، بـەهۆی ئـەوەی لـە دونیـادا کـارو کـردەوەی چاکیان پێش خستووەو ، ئەنجام داوه

(دەرگاکانی بەهەشت)

(بەهەشـت) بـە فـەزڵی خـوای گـەورە خۆشـترین مەنزڵگایـە شـوێن وحەوانـەی ئیمانداراتـە چـونکه بێگومـان جێگـەی پاداشـتی بـەنرخی باوەڕدارانە ئینجا بەهەشـت چـەند دەرگایـەکی تایبـەتی هەیـە بـڕواداران و فریشته لێی دەچنە ژوورەوە خوای گەورەدەفەرموێت لە قورئانی پیرۆز ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ سوورەتی الزمر: ٧٣ واتە: هەتا کاتێـك دەگەنـە بـەر دەرگای بەهەشت ئینجا دەرگاکـانی دەکرێتـەوە دەرگاوانـەکانی بەهەشـت پێیـان دەڵـێن سـڵاوی خواتـان لێبێـت ئـیتر سـەرفراز بـوون و حەوانـەوە چوونکەلە دونیا پاك بوون بـچنە ناویـەوە بـە هەمیـشەیی وە هـەتا هەتایـە

تیایدا بن، جا خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت ﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴾ سووورەتی سوورەتی ص: ٥٠، واتە: باخەکانی بەهەشتی بەرین و دەروازەکانی بۆ ئەوان کراوەیە ، هەروەها لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت ﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴾ سوورەتی الرعد: ٢٣ – ٢٤واتە فریشتەکان لەهەموو دەرگایەکەوە دەچنە ژوورەوە بۆلایان و ئینجا دەڵێن سەلاَوتان لێبێت لەسەر ئارام گرتننتان باشترین پاشەڕۆەو مالەو).

## (ئاگادارییەکی گرنگ)

هەندێ لە زانایانی (تەفسیر) ئەفەرموون بەهەشت (٨) دەرگای هەیە ماوەی نێوان هەر دوو دەرگایەك بە ئەندازەی (حەفتا) ساڵە ڕێگەی سوار چاکە، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە لەم فەرموودەیەدا ئەفەرموێت (وإنَّ للجنّة ثَمانية أبْوابٍ ما منهنّ بابان إلى يسير الراكبُ بَيْنُهما سَبعينَ عاماً) رواه الطبراني/ واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە کە ماوەی نێوان هەردوو دەرگایەکیان بە ئەندازەی (حەفتا) ساڵ ڕێگەی سوار چاکێکە ئینجا هەروەها یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشت ناوی (ریان)ە کە تایبەتە بە ڕۆژوو بوەکانەوە جا بزانە (کە پێغەمبەر (ﷺ) فەورموویەتی: (في الجنّة ثَمانية أبْوابٍ بابٌ مِنْها الريّان لا يَدخُلهُ إلا الصّائمون فإذا دَخَلوا أُغْلِق فَلَمْ يَدخل غيرهُم) رواه البخاري/ واتە لە بەهەشتدا هەشت دەرگا هەیە دەرگایەکیان ڕەیانە کەسێ تێی ناچێت جگە لە ڕۆژوو گران نەبێت کە

چوونە بەهەشت دادەخرێت و کەسێکی تـر نایەتـە ژوورەوە لێـوەی) بـەڵام هـەروەها دەرگایـەکیش تایبەتـە بەوانـەی کـە نوێژدەکـەنو و نوێـژ کـەرن بەتەواوی، هەروەها دەرگایەکی تـریش بـۆ ئـەو کەسـانەیە کـە لـە پێنـاوی خودا تێدەکۆشـن، هـەروەها دەرگایـەکی تـر تایبەتـە بەوانـەی کـە خێـر و چـاکەی زۆر دەکــەن بەهـــەموو جۆرێکـــەوە، هـــەروەك حـــەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (مَن أنْفَقَ زوجينِ في سبيل الله من مالهِ دُعـيَ مِـنْ أبـواب الجَنّـة، وَللجَنّة ثمانية أبْواب فَمَن كانَ من أهل الصّلاة دُعيَ مِنْ بابِ الصّلاة وَمَنْ كانَ مِنْ أهْلِ الصّدَقة دُعيَ مِن باب الصدَقة ، وَمَن كانَ مِنْ أهلِ الجِهـاد دُعـيَ مِـنْ بابِ الجِهاد وَمَنْ كانَ مِنْ أهْل الصِيام دُعيَ مِـن بـاب الـصّيام) متفـق عليـه، واتە/ هەر کەس (دوو خێزانی) هەبێ و تێریان بکاو یان لە پێناوی خودا لـە ماڵی خۆی (سەرف) بکات ئەوجا بانگ دەکرێت لە دەرگاکانی بەهەشتەوە، وە بەهەشت هەشت دەرگای هەیە، هـەر کەسـێ نـەهێڵێ نوێـژی بـچێت وە لەکاتی خۆی بیانکات ئەوا لە دەرگای نوێژەوە لە بەهەشت بـانگ دەکرێـت وە هەر کەسێ ئەهلی خێر بێت لە دەرگاکانی بەهەشت بانگی دەکرێـت وە هەر کەس لە (ئـەهلی جیهـاد) بێـت ئـەوا لـە دەرگـای (جیهـادەوە) بـانگی دەکرێت وە هەر کەس لە ئەهلی (ڕۆژوو) بێت ئەوا لە دەرگـای (ڕۆژووەوە) بانگی دەکرێت وپاداشتی ئەدرێتەوە.

## (باسێك لە فراوانی بەهەشت)

جـا هـەروەها بێگومـان خـوای گـەورە ڕوونـی کردۆتـەوە کـە پانتـایی بەهەشت بەئەندازەی فراوانی ئاسمانەکان و زەویەکانە وەکو خوای گـەورە

له قورئاندا ئەفەرموێت ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾ سـوورەتی آل عمـران: ١٣٣، واتـە: بەبێ دواکەوتن پەلە بکەن بۆ دەستکەوتنی لێبوردنی خودایی و بەهەشتی ڕازاوە کە بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوی پـان و بەرینـەوە ئامـادەکراوە بۆ پارێزگـاران وئـەو خواناسـانەی کـە بـەپێی فەرمانـەکانی خـودا ژیانیـان دەبەنە سەر ، بەڵێ: لە سورەتی (حەدید ٢١) یشدا هاتووە ئەفەرموێت ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ واتـا ئـەی خەڵکینـە پێـشبڕکێ بکـەن بـۆ هۆیەکانی لێبـوردن لـە پەروەردگارتانـەوە بـە تەوبـەو کـردەوەی چـاك ﴿وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ سوورەتی الحدید: ٢١ وەبۆ گەیشتن بە بەهەشتێك کـە پانـایی و فراوانیەکـەی وەك پانتـاپی ئاسمـان و زەویـە، ئەگێڕنەوە جارێکیان نوێنەری (هیرەقل) بەنامەیەکەوە هاتە لای پێغەمبـەر (ﷺ) لـە نامەکەیـدا نووسـرابوو ئـەی (محمـد) تـۆ لـە نامەکەتـدا بانگـت کردووین بۆ بەهەشـتێك دەڵێـت (هـەر پانتاییەکـەی بـە ئەنـدازەی پانتـایی ئاسمان و زەویە جا ئەگەر ئەمە وابێ ئەی دۆزەخ لە کوێیە؟ پێغەمبـەریش لە وەڵامدانەوەی فەرمووی (فَأيْنَ اللّيلُ إذا جَاء النّهارُ؟) واتـە کـە ڕۆژ هـات شەو دەبێ لەکوێ بێ و چی لێ دێت؟ (ئیمـامی ئەحمـەد ئـەم حەدیسـەی هێناوە) وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە لـە بەهەشـتەوە سەد پلە هەیە، وەهـەر پلەیـەکی بـە ئەنـدازەی نێـوان (ئاسمـان و زەویـە) هەروەکو ئەنفەرموێت (إن في الجنّـة مائـة درجـة مـابَيْنَ الـدرَجَتين كمـا بَـين السّماء والأرْض) أخرجه البخاري، واتە: لەناو بەهەشـتدا سـەد پلـە هەیـە،

لەنێوانی هەردوو پلەیەکدا وەك نێوانی ئاسمان و زەوی وایە وە فراوانی بەهەشت لە گەورەیی دەرگاکانی و کۆشك و تەلارو درەختەکان و بەروبوومە کانیدا دەردەکەوێت ئەوجا هەروەها لە (ئەبو سەعیدی خدریەوە) (خوا لێی ڕازی بێت) گێراویەتیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إنَ مابينَ المصراعينِ في الجنّة مسيرةُ أربعينَ سنّة) رواه أحمد في مسندهِ، واتە: لەنێوانی ئەمن لاو ئەولای تاکە دەرگایەکی بەهەشتدا ماوەی ڕێ وشوێنی چل ساڵە، وە هەروەها ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کەوا فەرموویەتی (إن في الجنّة لشَجرةً يسيرُ الركبَ في ظلّها مائة عَام) اخرجه أحمد أيضاً ، واتە: لەناو بەهەشتدا دارو درەختێك هەیە ئەسپ سواری بە تیژی بۆ ماوەی سەد ساڵ لەژێر سێبەرەکەیدا دەڕوات و تەواو نابێت).

**( پاشکۆ )**

ئیمامی (تەبەری) لە تەفسیرەکەیدا ئەفەرموێت (کە خودا بەهەشتی درووست کرد پێی فەرموو (ڕابکشه) بەهەشت ووتی تا چەند؟ ووتی (١٠٠) هەزار ساڵ پاشان دووبارە ووتی لێك بکشێ ووتی تا چەند؟ ووتی (١٠٠)(هەزار ساڵ سێ بارە ووتی لێك بکشێوە ووتی هەتا چەند؟ ووتی بەقەدەر (ڕەحمەتی من) ، ئینجا بەقەدەر (ڕەحمەتی) خوا پان و بەرینە هەروەکو چۆن (ڕەحمەتی) خوا لێواری نییە ئاوەهاش بەهەشت کۆتایی نایە جا هەروەها بێگومان ئەم هەموو ڕەزو باغاتەی بەهەشت نەسەری هەیە و نەبن مەبەست پان و بەرین و درێژاییە، چوونکە ئەوصەفاو سەیران

و زینەت و خۆشییەی لە بەهەشت هەیە لـە هـیچ جێگایـەکی تـر نییـە ئـەم سێبەرو دارو درەختەی لەوێ هەیە لەهیچ جێگایەکی تر نیە و کە لـەژێریان بحەسێیتەوە هەتا جۆرە دارێکـی لێیـە ئەگـەر سوارچـاکێك بـە وڵاغەکـەی (١٠٠) سـاڵ لـە ژێـری بـڕوات نایبڕێـت ئـەویش کـە داری (طـوبني) یـە وەك (سـهل) ی کـوڕی سـەعد (خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (إنَ في الجنّة لشجرة يـسيرُ الراكِبُ في ظلّها مائةَ عامٍ لا يَقطعها) رواه أصحاب السنن، (خوایە بەهەشـتی پان و بەرینمان بە نسیب بکەی خوایە بەر شەفاعەتی پێغەمبەرمان (ﷺ) بخەی(نبهني الله وإياكُم مِن نومة الغفلين وحَـشَرني وإيّـاكُم تَحْـتَ لِـواءِ سـيّد المُرسَلين. آمين).

# ئامۆژگاری پەنجاو یەك
## دیسان باسی بەهەشت بەشێوەیەکی تر ئەکات

إنَ الحمْدَ لله نَحْمَدُ ونَستَعينه وَنَستغفرهُ وَنَعوذُ بالله من شُرُور أنفسنا وَمِن سيّئاتِ أعمّالنا مَن يَهديه الله فَلا مُضِلَ لهُ وَمَن يُضلل فَلا هـادِيَ لَـهُ وَأشـهَدُ أن لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ وَأشهَدُ أن مُحمداً عَبْدَهُ وَ رسُولَهُ (صلوات الله عليه) وعلى آلهِ وَأصحابِهِ وَذُريتَهِ ومَن تَبِعَـهُ بإحـسانٍ إلى يـوم الـدين ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ سوورەتی آل عمران: ١٠٢،

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ﴾ سـوورەتی النـساء: ١ ، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ سوورەتی الأحزاب: ٧٠ – ٧١ ، أما بَعدُ فإنَ أصـدَقُ الحديث كتابُ الله، واتە لەپاش هەندلایّ ئەوەی ڕاستی بێت ڕاسترین ووشـە قورئانە یا باشترین فەرموودە قورئـانی پـیرۆزە (وَخـير الهُـدي هـدُى مُحَمـد (صلى الله عليه وسلم) وَشَرُ الأمورِ مُحدَثاتُها)، واتە: باشـترین ڕێگـە ڕێگـای پێغەمبەرە (ﷺ) وە خراپترین کار پەیداکراوەکانن لە ئـایین (وَكُـل مُحْدثـةٍ بدْعةُ) واتا گشت کارێکی پەیداکەر بدعەیە (وكُل بِدعةٍ ضَلالةٌ) واتـە: گـشت

بیدعەیەکیش گومڕابوونە (وكُل ضلالةٍ في النار)[1] رواه مسلم واتە: هەموو گومڕابوونێکیش بۆ ناو ئاگری دۆزەخە[2] .

خوێنەرانی ئازیزم برایانی خاوەن باوەڕان لە بەهەشت ئەوەی بتەوێ هەیە لەهەموو جۆرە خواردنێك چوونکە بێگومان بەهەشت جێگایەکە کە بەخەیاڵی کەسدا نایەت جا بێگومان پڕە لە باغ و باغات و پڕە لە هەموو (فیقی) و مێوەجات و جا هەروەها هەموو جۆرە گۆشتی باڵندەیەکی تێدایە ، هەروەها هەموو جۆرە تەعامێکی تێدا هەیە هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴾ سوورەتی الواقعة: ٢٠: ٢١، واتە: بۆبەهەشتیەکان هەیە میوە بە ئارەزووی خۆیان هەڵبژێرن وە گۆشتی باڵندەیەك کە حەزی لێئەکەن، هەروەها لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ ﴾سوورەتی الزخرف: ٧١ واتە لەو بەهەشتەدا ئەوەی دڵەکان دەیانەوێت و چاوەکان لەزەتی لێوە دەبینن ، هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي

---

(1) ئەم ووتارەپێی دەوترێت (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر (ﷺ) ووتارەکانی بەمە دەست پێدەکرد و ئەنجامی دەدان).

(2) کەوابوو مەبەست لە (بدعە) ئەوەیە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەسحابەکاندا نەبوبێ ئەگەر دەتەوێ باش لە بیدعە بگەی ، بڕوانە پەرتووکی (سیرەت) و ژیاننامەی زاتی ڕەهبەر لە ڕەوشت و ئەخلاق و غەزەواتی پێغەمبەر (ﷺ) لە نووسینی (عبدالرحمن مەلا طه عبدالعزيز) – بەرگی یەکەم ، لاپەڕە /٨٥ .

﴿ ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴾ سوورەتی الحاقة: ٢٤واتە: بخۆن و بخۆنەوە بە نۆشتان بێت لە بەرامبەر ئەوەی کە لە ڕۆژگاری ڕابردودا ئەنجامتان داوە، دیسان خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْسًا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيْنًا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلْسَبِيلًا ﴾ سوورەتی/ الإنسان: ١٧ – ١٨واتە: لەوێدا کاسەیەك تێراودەکرێن کە زەنجەفیلی تێکەڵاو کراوە کانی یەك لەوێدا کە سەلسەبیلی پێ دەڵێن، حەزرەتیش (ﷺ) ئەفەرموێت (أوّلَ زُمْرةٍ تلجُ الجَنّةَ صُورَهُم علَى صُورةَ القَمَرِ لَيْلةَ البَدرِ لا يَبصقُونَ وَلا يَمْخطُونَ وَلا يَبْزقُونَ)رواه البخاري، واتە: (یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە بەهەشتەوە وێنەیان لە وێنەی مانگە لە شەوی چواردە ی بدر وە بەڵغەمیان نیەو تف ناکەن) وە هەروەها لە حەدیسێکی تردا ئەفەرموێت (لا يَتَغوطُونَ وَ لايَبتَلُونَ ولا ولا يمتَخطُونَ) رواه مسلم، واتە پیسایی ناکەن و میز ناکەن وە چڵم فڕێ نادەن وە تفیش فڕێ نادەن، ئینجا پرسیار کرا لە خۆشەویست (ﷺ) (فَمَا بَالُ الطَعام؟ قالَ جشأٌ كَجَشاءِ المِسْكِ) رواه مسلم : واتە خواردن دەخۆن و پاشماوەکەی چی لێدێ ؟ فەرمووی (ئەبێتە قریشکو ئارەق دەکەنەوە بۆنی میسکی لێدێت وە لە (ڕیوایەتێکی) تردائەفەرموێت (طَعامُهُم ذَلكَ جَشّاءٌ[1] وَرَشحٌ كريح المِسْكِ يَلْهَمُونَ التَسْبيحَ وَالتَكبير والتَحْيدَ كَما تُلَهمون النّفس) أخرجهُ مسلم، واتە دەخۆن تا تێر دەبن هەناسەو بۆنیان وەك بۆنی میسکە و (سبحان الله والحمدالله والله أكبر) بێ ئەرك دەڵێن وەك چۆن هەناسە دەدەن

---

(1) جَشاءٌ : هي الصوت الذّي يَخْرُجُ مِنْ فم الإنسانِ عِنْدَ إمتلاء معدته) واتە ئەم دەنگە لەدوای خواردن دەرئەچێ و ئێمە بە زوبانی کوردی پێی ئەڵێین (قریشك و) و (جوانا).

بێ ئەرك، وە لە (ڕیوایەتێكی) تردا ئەفەرموێت (حَاجَتُهُمْ عَرَقٌ يفيضَ مِنْ جلُودِهِمْ مثْلَ المسْكِ فإذا البطن قَدْ ضَمَرَ) أخرجه أحمد في مسنده)، واتە میزو پاشەڕۆیان دەبێت بە (قرێشك و عەرەقەو) دەتكێت لە پێستیان وەكو بۆنی میسك و ناو سكیان بەتاڵ ئەكاتەوە .

## (تێبینیەكی گرنگ)

خوا گەورە لە قورئاندا فەرمویەتی ﴿وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ سوورەتی محمد: ١٥، وە ڕووبارەكان لە شەراب كە پڕ چێژو خۆشییەبۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە لەبەهەشتدا ، وە لە جێگایەكی تردا خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ۝٢٥ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ﴾سوورەتی المطففين: ٢٥ – ٢٦، واتە: (شەرابی پاك و سەرمۆریان دەرخوارد دەدرێت كە نۆشی بكەن دوا قومەكەی میسكە) چوونكە بێگومان شەرابی بەهەشت پاك و خاوێنە ئەو بێ نەزاكەت و ناپوختەیی لە شەرابی دونیادا هەیە لەو دانیە هەرگیز نابێتە هۆی (نەخۆشی و بێهۆشی و سەرخۆشی) وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ۝٤٥ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ۝٤٦ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾ سوورەتی/ الصافات: ٤٥ – ٤٧ واتە بە پیاڵەی كە كارێزو ڕووباری زەوی یەوە هەڵدەگوزرێت، دەیگێڕن بەسەریاندا سپیەو مایەی چێژوو لەزەتە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە نە مێشكیان تێك دەدات و نە سەرخۆش دەبن پێ ی وە هەروەها بێگومان ئەو شەرابە پاكە نەسیبی ئەو باوەڕدارانە دەبێت كە لە دونیا شەرابیان

نەخواردۆتەوە جا ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (مَن سَرَهُ أنْ يَسقيهُ الله عَزَ وَجل منَ الخَمرِ في الآخرة فَليَتركهُ في الدّنيا) رواه الطبراني والبيهقي/ واتە: (هەر کەسێك پێی خۆشە خوای گەورە لە شەرابی ڕۆژی دوایی بێ بەشی نەکات بالە دونیادا وازی لێ بهێنێت) چوونکە هەر کەسێك مەی بخواتەوە لە دونیادا وەبچێتە بەهەشت بە پاداشتی چاکەکانی ئەوا لە بەهەشتدا نایخواتەوە، جا هەروەها عبدالله ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (مَن شَرِبَ الخَمْرَ في الدُنْيا ثُمَ ماتَ وَهوَ يَشربُها وَلَم يَتُبْ منها لَم يَشربها في الآخرة، وَ في رواية (حَرَمَها الله عَليهِ في الآخرة) وَإنَ أدخل الجنّة رواه مسلم، واتە هەر کەسێك (شەراب) واتە (مەی) بخواتەوە لە دونیا دا وە تۆبە نەکات و لەسەر ئەو کارە بمرێت ئەوا لە ڕۆژی کۆتاییدا نایخواتەوە هەرچەند بکرێتە ناوبەهەشتیش.

**( سەرنجێك )**

عبدالله ی کوڕی ئیمامی عباس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت (شەرابی دونیا واتە(عەرەقی) دونیا سێ سیفەتی هەیە/ یەکەم/ سەرخۆش کردن/ دووەم/ سەرئێشەو، سێ هەم/ ڕشانەوەو میز کردن ، بەڵام خوای گەورە ئەم سیفەتانەی لە شەرابی بەهەشتدا نەهێشتووە[1] .

(یەکەم خواردن لەبەهەشتدا چی یە ؟)

یەکەم خواردن کەبۆ بەهەشتیەکان ئامادەکراوە بریتیە لە (جگەری

---

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (حادي الأرواح إلى بلادِ الأفراح) لەدانانی (إبن القيم الجوزي) لاپەڕە ٢٣٠.

(حوت) واته نەهەنگ وەك پرسيار كرا لـە پێغەمبـەر (ﷺ) (مـا أولُ شـيءٍ يأكُلُهُ أهْلُ الجَنّة ؟ فَقالَ زيادةُ كَبَدِ الحُوتِ) رواه البخـاری ، ئـەوجا بـەدوا دا گای بەهەشتيان بـۆ سـەردەبڕێت پاشـان ئـاوی (سەلـسەبيليان) دەدرێتـێ وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی (لَيَنْحرَ لَهُـم ثـورٌ الجَنّـة الـذّي يأكُـل مِـنْ أطرافها) رواه مسلم .

## (بۆچی بەهەشتی دەخوات و دەخواتەوە ؟)

(جـا هــەروەها بێگومــان ئەگــەر بەهەشــتی بەهەميــشەيی و نــەمری لەبەهەشتدا دەبن دوورن لە ئـازارو ئەشـكەنجەو ناخۆشـی و تينويـەتی نـە بريسەتی تێدايە نە ميزو پيساتی تێدايە كەواتە بۆچی بەهەشتی دەخوات و دەخواتــەوە وە هــەروەها بـۆن لــەخۆی دەدات ؟) جــا بێگومــان ئيمــام (قـرطبي) لـە تەفـسيرەكەيدا وەلآمـی ئـەم پرسـيارەی داوەتـەوە ئـەوجا ئەفەرموێت نازو نيعمەت بەهەشت پۆشاكيان لەبەر ئـازار نيـەو خواردنيـان لەبـەر برسـيەتی نيــەو خواردنــەوەيان لەبــەر تينويــەتی نيەبەڵكوچــەند خۆشـييەكی بـەدوای يەكدايـە ئەواتـە بڕوانـە خـوای گـەورە لـە قورئـان چ ئەفـــــەرموێت ﴿ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴾ سوورەتی طه: ١١٨ – ١١٩ واتە لـە بەهەشـتدا تـۆ نـە برسـيت دەبێت و نە ڕووت و نە تينووت دەبێت)، جا (حيكمەتەكەی) ئەوەيـە مـرۆڤ لە دونيادا سەرقاڵ و شارەزای خۆشـی دونيـا بـووە خـوای گـەورە خۆشـی بەهەشـتی رشـوون كردۆتـەوە كـە هەنـدێكی لـەجۆری خۆشـی دونياوەيـە هەندێكی تری كەس نايزانێت جگە لە خوای گەورەو پەروەردگار).

## ( خۆشی بەهەشت نەبڕاوەیە )

جا بـەبێ گومـان لەبەهەشـت ئـەوەی نـەفس و ئـارەزوو بیـەوێت هەیـە جێگایەکە کە بەخەیاڵی کەس نایەت چوونکە پڕە لە (حور و قصور و باغ و باغـات و لیبـاس و سـوندوس و ئیـستبرق) هـەر میوەجـات و فەواکیهـەکی بتـەوێ تێیدایـە و لـە ڕووبارەکـانی کانیـاو وەك دەریـای ئـاو و دەریـای هـەنگوین و دەریـای شـیر و دەریـایی مـەیی و ئینجـا لـە پاشـان هـەموو دەریاکان لە بەهەشت بـە فـەرمانی خـوا دەرئـەبن و هـەروەکو (حـەکیمی کوڕی مەعاویە) لە باوکی (ڕیوایەتی) دەکات (خوایـان لێ ڕازی بێـت) ئـەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (إنَ في الجَنّـة بَحْـرُ المَـاءِ وَ بَحْـرُ العسل وبَحْـرُ اللّبنِ وَبَحْرُ الخَمْرِ ثُمّ تَشَقَقُ الأنهار بَعدُ) رواه الترمذي .

## ( بەهەشت لە کوێ دایە ؟ )

خوێنەرانی ئازیزم برایـانی موسـڵمان بـە زاهـیری بـە ئایـەت و حـەدیس بەهەشت لەسـەروی ئاسمـانی (حەوتەمەوەیـە) لـەژێر عەرشـدا لای (سـدْرَةُ المُنْتَهَى) چوونکە خوای گەورە لەم بارەیـەوە لـە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴾ سـوورەتی/ الـنجم: ١٤ – ١٥ واتە: بەهەشت لای (سیدرة المنتهى)یە کە لەوێدا بەهەشـتی (مـأوی) هەیـە کە جێگەی (حەوانەوەیـە) وە هـەروەها ئەفـەرموێت ﴿ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴾ سوورەتی/ الحاقة: ٢٢، واتە: بەهەشتی زۆر بەرزەی سەرووی ئاسمانەکان، وە هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شـەو ڕەوەکەیـدا بـەرز کرایـەوە بـۆ

ئاسمـانی حەوتـەم پاشـان بـۆ (سـیدره المنتهـی) پاشـان بـۆ بەهەشـت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ثُمَ عُرِجَ بِنَا إلى السّماءِ السابِعَةِ فأستفتحَ جبريـلُ ثُمَ ذَهَب بيَ إلى سدرةُ المنتهى) رواه مسلم، واتـە : پاشـان بەرێکـەوتین بـۆ (سديرة المنتهى) .

## (بیناکانی بەهەشت) [1]

خوای گەورە دیواری بەهەشتی لە زێڕو زیو درووست کردووە وەکو لـەم فەرمودەیەدا هاتووە لـە ئـەبی سـەعیدی خدریـەوە (خـوا لێـی رازی بێـت) دەگێڕێتەوە کـە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی (إنَّ حـائِط الجنّـة لَبَنَـةٌ مِـنْ ذَهَب وَلَبنة مِنْ فِضةٍ) أخرَجَهُ البزار/ واتە دیواری بەهەشت لە خشتی ئاڵتون و خـشتی زیـو دروسـت کـراوە) هـەروەها ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (قُلْنا يا رسُولَ الله حَدثنا عَن الجنّة ما بِناؤها؟ قـالَ لَبَنـةٌ مـن ذَهـبٍ وَلَبنـة مِـن فِـضة وملاطها المِسْك الأزفر وحصْباؤها اللّؤلؤ والياقوت وتُرابُها الزعفـران) أخرجـه أحمـد/ واتە: ووتمان ئەی پێغەمبەری خوا دەربارەی بەهەشت پێمان بڵـێ لـە چـی درووست کراوە؟ فەرمووی خشتێکی لە ئاڵتوون و خشتێکی لە زیوەو ئینجا چەوولّمەکەی هەمووی مرواریە و تێکەڵی نێوانەکەی میسکە وە خۆڵەکەشی زەعفەرانە، جا هەروەها بەهەشت هەشـت/ دەرگـای هەیـە وە نـاوی خـۆی

---

(1) هەزار ڕەحمەت لەو کەسە بێ کە ووتویەتی: (بەهەشت و سەقەر ئێستا مەوجودن لە قورئاندا زۆر زۆر مەعدوودن)

(مەوقیعی بەهەشت لە ژووور سەماوات سەقەرلە زەوی لەژێر تەبەقات)

بەخۆوەیە) جا هەروەکو لە ڕیوایەتەکەی عوتبەی سولەمیدا (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الجنّة لَها ثَمانيةُ أبواب وَالنارُ لَها سَبعةأبواب) أخرَجهُ أحمد ،واتە بەهەشت هەشت دەرگای هەیە دۆزەخیش حەوت دەرگای هەیە ، وەکو لە پێشەوە باسمان کرد .

**( یەکەم کەس کە دەچێتە ناو بەهەشت پێغەمبەر (ﷺ) )**

جا هەروەها بێگومان یەکەم کەس کە دەچێتە ناو بەهەشت وە پێش هەموو درووست کراوەکانی خوا پێغەمبەری خۆشەویستمانە (صلى الله عليه وسلم) چوونکە بێگومان یەکەم کەس کە لەدەرگای بەهەشت دەدات و بۆی دەکرێتەوە (محمد)ە (صلى الله عليه وسلم) وەکو ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت) (ڕیوایەت) دەکات کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (فيقولُ رَبُّك أمِرتُ أن لا أفتَح لأحدٍ قَبلَك) رواه مسلم أيضاً واتە فریشتەی دەرگەوانی بەهەشت بە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت، فەرمانم پێکراوە کە بۆ هیچ کەسی تر نەکەمەوە لە پێش تۆدا) .

**( باسێك لەچۆنیەتی حۆریەکانی بەهەشت )**

جا هەروەها بێگومان یەکێکی تر لەو بەخشش و بەهرانەی خوای گەورە دەیبەخشێت بە باوەڕداران لە بەهەشتدا وە مایەی دڵنیایی و کامەرانی یانە ئەویش حوریەکانە[1] جگە لە خێزانەکانی دونیا پەروەردگاری مەزن

---

(1) ووشەی حور کۆی ووشەی (حوراء) ە ، واتە کیژۆڵەیەکی گەنجی جوانی سپی چاوڕەش ، ئیمام حەسەن (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی : ووشەی (حوراء) واتە زۆر سپی و چاوڕەشی جوان ، بڕوانە (بشرى المحبين بأخبار الحور العين) لاپەڕە ٤٠.

حوری جوان و قەشەنگیان پیّ دەبەخشیّ وەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾ سوورەتی الدخان: ٥٤ واتە: ئا بەم شێوەیە حۆری قەشەنگ و جوانی چاوگەشمان لیّ مارەكردن .

جا بێگومان خوای گەورە وەسفی بەهەشت ئەكاو ئەفەرموێت ﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴾ سوورەتی ص: ٥٢ واتە حۆری هاوتەمەنی بەحەیاو شەرم لایانە كە تەنها (عاشقی) هاوسەرەكانیان و چاو بۆ كەسی تر هەڵنابڕن جا ئەم حۆریانە لە جێگای تایبەتی دان و پارشێزراون وەپێشتر هیچ كەس نا ئەدەمی و نە جنۆكە دەستیان لیّ نەداون وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴾ سوورەتی الرحمن: ٥٦ واتە: هیچ كەس دەستی لێنەداون نە مرۆڤ و نەپەری لە پێش خاوەنەكانیان ، جا ئەم حۆریانە لە جوانیدا هێندە سپی و پاك و تەمیزو چاو گەشن دەڵێی دووڕو مرواری ناو سەدەفن وەك خوا دەفەرموێت ﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴾ سوورەتی الواقعة: ٢٢ – ٢٣ .

**( چەند ئاگادارییەك )**

یەكەم) حۆری و ئافرەتانی بەهەشت وەك هی دونیا نین بەڵكوخاوێن و پاكن لە (حیض) زەیستانی و بەڵغەم وچڵم و میزو پیسایی وەك خوای گەورە دەفەرمێت: ﴿ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٥، واتە بۆ بەهەشتیەكان ئافرەتی پاكژو خاوێن هەیەو

به هەمیشەیی تێیدا دەبن .

دووەم) ئـەم حورییانـە وا درووسـت کـراون کـە چـاوەکانیان تـەنها بـە مێردەکانیــــان هەڵـــدەهێنن وەچــــاو نابرنــــە پیــــاوانی تـــــر ﴿ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ ﴾هاتووە لە سورەتی (الرحمن) ئایەتی ٥٥.

سـێ هـەم) ئـەم حوریانـە لەگـەڵ ئـەم هـەموو جوانییـە دڵ ڕفێنەیانـدا دەنگیان زۆر خۆشەو گۆرانی بۆ پیاوەکانیان دەڵێن، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (إنَ الحور العين لَتغنين في الجنّة يَقُلن نَحنُ الحُور الحِسان جئنـا لإزواج الكرام) رواه الترمذي، واتەحۆریە چاو گەشەکان لەبەهەشتدا گۆرانی دەڵـێن و دەڵـێن ئێمـە حـوری جـوانین شـاراوەین و هـاتووین بـۆ پیـاوە بەڕێزەکان).

چوارەم) ئـەم حوریانـە هێنـدە دڵیـان لای پیاوەکانیانەوەیـە خۆشـیان دەوێن کاتێك لە دونیاشدا ئافرەتان دڵی مێردەکانیـان ئـازار دەدەن ئـەوان لە بەهشتەوە قسەیان پێ دەڵێن بۆچی دڵی ئەو پیاوانە ئازار دەدەن؟ وەك پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێت (لا تـؤذي إمـرأة زوجهـا في الـدّنيا إلاّ قالـت زوجته مِن الحُور العينِ لا تؤذيه قاتلكِ الله فانما هُو عنْـدَكَ دخيـلٌ يوشـك أن يفارقكِ إليْنا) أخرجه الترمذي وإبن ماجـة/ واتـە هـەر ئافرەتێـك لـە دونيـاد ئازاری مێردەکەی بدات خێزانەکەی کە حۆری چاو گەشی بەهەشتە دەڵێت ئازاری مەدە خوا بت کوژێت ئەم پیاوە لای تـۆ (میوانـە) خەریکە بـەجێت بهێڵێت و بێت بۆلای ئێمە).

پێنجەم) جا بێگومان لەبەهەشتدا کەس لەم حۆرییانە بێ بـەش نابێـت بەڵکو خوای گەورە دوو خێزانی بۆ هەر پیاوێك داناوە بێجگە لـە (شـەهید)

کـە هەریەکـەیان (٧٢) حـۆری دەبێـت و پێـی دەدرێـت، وەکـو پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: (للشَهيد عندَ الله سَبعُ خصالٍ (يغفر لَهُ في أول دُفعة مـنْ دمه ، ويرى مَقْعدهُ في الجنَة، ويُجار من عذاب القبر، ويأمن مـن الفَـزَعِ الأكْبَـر ويُوضع عَلىَ راسهِ تَاجُ الوقارِ اليَقُوتة منْها خَيْـرٌ مـنْ الـدّنيا ومَافيهـا ويـزوِّج إثنتين وسَبْعينَ زَوْجةً منْ الحُور العينِ وَيَـشْفَعُ في سَبعينَ مـنْ أقربـاءه) رواه أصحاب السنن[1]، واتە: شەهید لای خوای گەورە حەوت پاداشتی هەیە لـە ڕژانـی یەکـەم دڵۆپـە خوێنیـدا خـوا لێـی خـۆش دەبێـت شـوێنی خـۆی لەبەهەشدا نیشان دەدرێـت، ڕزگـاری دەبێـت لـە سـزای نـاو گـۆڕ و دڵنیـاو ئەمین دەبێت لە ترسان و شڵە ژانـی گـەورەی ڕۆژی دوایـی تـاجی یـاقوتی لەسەر دەنرێت و کە باشترە لە دونیاو ئەوەی کە تێیدایە هەروەها (حەفتاو دوو) حوریشی پیێ دەدرێت هەروەها بۆ (حەفتا کـەس) و کـاری و خزمـانی شەفاعەت دەکات).

شەشەم) عن الوليد بـن عبيـده قـال: (قـالَ رَسـولُ الله (صـلّى الله عليـه وسلم) لِجْبريل يَا جبريل قِف بِي على الحور فأوقفهُ عَلـيهن فقـال مـن أنْـتُنَ؟ فَقُلن نَحْنُ حواري قَوم كِرام حلوا فَلم يظعنوا وشبوا فلـم يرهمـوا ونقـوا فلـم يَدْرنُوا)[2]، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بە جـوبرەئیلی فـەرموو دام بگـرە لـەلای حۆریەسپیە چاوگەشەکان ئەویش ڕای گرت و پاشان فەرمووی ئێوە کێن؟ حۆریەکان ووتیان ئێمە کەنیزەك و کیژۆڵەین بۆ قەومێکی بەڕێز نیـشتەجێ

---

(1) بڕوانە/ پەرتوکی مشکاه المصابیح، دانراوی (محمد بن عبدالله الخطیب التبریزی)، بەرگی ٣، لاپەڕە ٣٥٨.

(2) ذکره إبن کثیر في البدایة والنهایة ، بەرگی ٢ لاپەرە ٤٦٣.

بوین و کۆچ ناکەن لاوون و پیر نابن پاك بوونەتەوەو پیس نابن).

حەوتەم) ریوایەت کراوە کاتێ خوای گەورە حۆری (خەلق) دەکا جوان و چاو گەش بە تەواوی (کامل) درووست دەکرێت ئینجا خوا فەرمان بە فریشتەکان ئەکا رشمالێ بەسەریانداهەلێ ئەدەن ئەیانرازێننەوەبۆکاتی خۆی، جا هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الحور العين لايمتن عندَ النفخة في الصور لأنَهن خلقن للبقاء) رواه أحمد في مسنده، واتە: (حۆریە جوانە چاو ڕەشەکان لەکاتی فووکردن بە شاخی صوردا نامرن چوونکە درووست کراون بۆ مانەوە).

**( پاشکۆ )**

جا بێگومان حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (ولَوْ أن إمرأةً مِنْ أهلِ الجنّة أطْلعتْ إلى أهْل الأرْضِ لأضائت ما بَيْنَهما ولنفيها عَلى رأسها خَيرٌ من الدّنيا وما فيها) رواه البخاري، واتەئەگەر ئافرەتێکی بەهەشتی بێتەسەر دونیا هەموو دونیا ڕووناك دەکاتەوەو بۆن خۆشی دەکات بەڕاستی سەر پۆشەکەی سەری باشترە لەدونیاو ئەوەشی کە تائێیدایە .

(ئەهلی بەهەشت قەت پیر نابن...هتد)

چوونکە بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) (مَنْ يَدخل الجنّة يَنْعم لا ييأس ولا تُبلى ثِيابه ولا تفنى شَبَابه) رواه مسلم واتە: هەرکەس بچێتە بەهەشتەوە لەنازو نیعمەتدا دەبێت و بێ هیوا نابێت و پۆشاکی کۆن نابێت و نادڕێت و قەت پیریش نابێت، چوونکە بەڕاستی لە بەهەشت هیچ ناخۆشی نییە لە غەیری خۆشی و خواردن و خواردنەوە هەیە چی بتەوێ ڕابواردن بێ

ئەزیەتە چوونکە هەر کە داخیل بەهەشت بوون بانگەوازێك ئەكرێن لەلای فریشتەكانەوە وەك ئەبو هورەیرە (ڕەزا خوای لێبێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: (يُنَادي مُنَادي في أهْل الجنّة ان لكم أنْ تَصبْحوا فَلا تَسْتَعموا ابداً وإن لكم أن تحيوا فلا تَمُوتُوا أبداً وإنْ لَكُم أن تشبوا فَلا تَهرموا أبداً وان لَكُمْ ان تَنْعموا ولا تَيْئَسُوا أبداً) رواه مسلم أيضاً

## (باسێك لە سەیركردنی خوای گەورە)[1]،

پێویستە هەموموسڵمانێ ئیمان و باوەڕی ببێ کە لەقیامەتدا بە (حضوری) زاتی خودا ئەکەوێ وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ سوورەتی/ یونس: ٢٦واتە: بۆ ئەوانەی کاری چاکەیان کردووە پاداشتی چاك هەیە وەزیادەیەکیش ئەو زیادەیە (بینینی خوای پەروەردگارە) جا هەروەها ئەم ئایەتەش دەبێتەبەڵگە لەسەر بینینی خوا لە ڕۆژی قیامەتداوەك ئەفەرموێت ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴾ سوورەتی القیامة: ٢٢واتە لە ڕۆژی قیامەتدا دەم و چاو و ڕووخسار گەلێ واتەڕوومەتی باوەڕداران گەشاوەو پاراوو پڕشنگدارە خۆشی و شادیان لێ دەبینین ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾[2] سوورەتی/ القیامة: ٢٣، بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن) جەماوەری زانایان وەك لە چەندین فەرموودەی ڕەواو(صحیح) وەرگیراوە دەڵێ، مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە لە ڕۆژی

---

(1) گەورەترین خۆشی بەهەشتیەکان چاو پێکەوتنی خوای گەورەیە (جَلّ جَلالُهُ وَعم نَوالُهُ).

(2) سورەتی القیامە/ ئایەتی ٢٣.

قیامەتدا بەندە (صالّحەكان) تەماشای خوای خۆیان دەكەن و بەچاوی خۆیان دەیبینن وەكچۆن بە ئارەزووی خۆیان تەماشای مانگە شەوی چواردە دەكەن و بەچاوی خۆیان دەی بینن هەروەها لە فەرموودەی (متواتر) واتە دەماو دەم هاتووە كەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (إنكم سَتَرونَ رَبّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ القَمَر لَيْلَة البَدرِ) رواه البخاري، واتە دڵنیابن ئێوە لە قیامەتدا خوای گەورە دەبینن وەك چۆن مانگ دەبینن لە شەوی چواردەدا، جا هەروەها بێگومان چ لەوە خۆشترە كە بەندە جەماڵی خودا ببینێت، چاوی بە خودای خۆی بكەوێت، ئینجاكە بەهەشتیەكان (داخلی بەهەشت) بوون خودا پێیان دەفەرموێت (تُرِيدُونَهُ شَيْئاً أزيدُكم) واتە : دەتانەوێ شتێكی زیادتان پێ بدەم (يقولون الم تبيض وجوهنا)واتە : ئایە روومانت سپی نەكرد (الَمْ تَدْخُلنا الجنّة) واتە: ئایە ئێمەت (داخیلی) بەهەشتنەكرد، (تُنجنا من النّار) واتە: ئایە لە دۆزەخت ڕزگار نەكردین (قالَ فَيَكْشِفُ الحِجَاب فَما أعْطَوا شَيْئاً أحَبَ إليْهم مِنَ النَظَر إلى ربِهِم عزّ وَجل)رواه مسلم والترمذي واتە: پەردە لادەدرێت و هیچ شتێكیان خۆشتر نەدرایتێ لەوەی كە سەیری خوای خۆیان دەكەن .

**(تێبینیەكی گرنگ)**

ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لّی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (إن الله لا يَنَامُ حِجَابَهُ نُورٌ لَوْ كَشفهُ لأخْتَرقَتْ سبحات وجهه ما إنتهى اليه بَصَرهُ مِنْ خَلفه) أخرجه مسلم، واتە خوای گەورە نانوێت و نووستن بۆ ئەو نییە لەنێوان خوای گەورەو درووست كراوەكانی پەردەی (نوور) هەیە گەر لای ببات گەورەیی نوری ڕووخساری هەموو

ئەوانە دەسوتێنێت کە ئەو نورە دەیانگاتێ[1] .

وە هاوەڵە بەڕێزەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد ئایە بە بینینی خوای خۆیان زیانیان پیێ دەگات وەك ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی: کەسانێك بە پێغەمبەریان فەرموو (ﷺ) ئایە خوای خۆمان دەبینین لە ڕۆژی قیامەتدا ؟ پێغەمبەری خواش فەرمووی : (هَلْ تَضارونَ في رُؤْيَة القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ) واتە: ئایە کاتی کە مانگ بە ئاسمانەو دەبینن لەشەوی چواردەدا هیچ زیانێکتان پیێ دەگات بە بینینی ؟ ووتیان نەخێر ، پاشان فەرموی کاتێك کە ڕۆژ دەبینن لە ئاسمانا وەهەوری لەپێش نەبێت هیچ زیانێکتان تووش دەبێت ؟ ووتیان نەخێر ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ئێوەش ئاوا خوای خۆتان دەبینن ، بەهیچ جۆرێك زیانتان تووش نابێت [2] .

( پاشکۆ )

جا بێگومان بیروباوەڕی موسڵمان ئەوەیە کە بەهەشت و جەهەنەم ئێستا هەن و خودای تەعالاً درووستی کردوون و ئامادەی کردوون بۆ ئەو کەسانەی ئەبن بە مأوایان بە بەڵگەو دەلیلی گەلێ ئایەتی قورئانی پیرۆز وەکو ئایەتی ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا

---

(1) بەلأم لە ڕۆژیێ خەڵکی بەهەشت سەردانی خوای خۆیان ئەکەن قسەشی لەگەڵ دەکەن وە پرسیاریشی لیێ دەکەن، وەك لە حەدیسدا هاتووەو بەیان کراوە،خوا بە نسیبمان بکات .

(2) ئەم فەرموودەیە (بوخاری و موسلیم) ڕیوایەتیان کردووە ، بڕوانە (تاج الاصول) ج٥، لاپەرە ٤٠٦.

ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ ﴾ سـوورەتی/ آل عمـران: ١٣٣ وە ئایـەتی ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴾ سـوورەتی/ آل عمـران: ١٣١واتـە : خۆتـان بپارێزن لە عەزابی ئاگرێکی وەها کە ئامادەکراوە بۆ (کافرەکـان) وەئـەمما شوێنەکەیان ئەوا هەرچەندە دەلیلی (نەصی) نییە بۆدیـاری کردنـی بـەلاَم زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە جێگەی بەهەشت لـەژووری هـەر حەوت ئاسمانەکەوەیە لەژێر عەرشدایە لەبەر ظاهـیری ئایـەتی ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ١٣ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ١٤ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴾ سـوورەتی النجم: ١٣ ـ ١٥.

جا سەید عبدالرحیم مەولەویش لە عەقیدەکەیدا[1] ئەفەرموێ :

| | |
|---|---|
| نەصێکی صەریح هیچ نییە دیار | لەبۆ تەعینی جێی جەنەت و نار |
| حەق واتە دەس هیچ لێ نەدرێ | تەفویض بە حەزرەت عیلمی حەق کرێ |
| لکن الاکثر قصە وادەکات | جەنەت تحت العرش فوق السماوات |
| ومکان النار تحت الارضین | باز[2] بێنەوەسەر شوبهەی مونکرین |

خوایـە بـە عەزەمـەتی خـۆت بەهەشـتمان بـە (نـسیب) بکـەی، جـا لـە کەرەمی زاتی خودای تەعالاَ داوا ئەکەین کە زاتی خۆی نیشان بدات پێمان و بەچاو پێکەوتنی دلَشاد بین موشەرفین .

(نَبَهَني الله وإياكم مِنْ نَومةِ الغَافِلينْ وَحَشَرَني وإيَّاكُمْ تَحْتَ لِواءِ سَيِّد المُرسَلين/ اللَّهُمَ أغْفِر لَنَا آمين)

---

(1) بڕوانە/ عەقیدەی مرضية ، لاپەرشە ٦٣٣.

(2) باز / واتە (دیسان یان دووبارە)، بڕوانە هەمان سەرچاوە .

# ئامۆژگاری پەنجاو دوو

## باسی جهنم واتە دۆزەخ ئەکات

الحَمْدُ لله الذّي لا يظلم عِبَادَه مثْقَال ذَرَة وإن تك حسنة يُضَاعِفُها ويُؤت مِنّ لَدُنه الرضى والمبّرة جَعل النّارَ دَارَ خزيٍ وَعذاب وبوار وأعَدَ فيها كَافة أنواعِ العَذابِ لِلْكُفارِ والأشْرَار نَحْمُدهُ سُبْحانهُ وَ تَعالى عَلَى مَا رَكبَ فينا مِنْ عَقْل سديدة سمعٌ و بَصَر وَ نَستَعينهُ وَنَسْتغفرُهُ مِنْ جَمِيعِ الذنُوب والاوْزار ونَسْتَهْديه ونَطْلبُ منهُ أنْ يدخلنا الجنّة ويُجَنِّبَنا النّار ونَشهدُ أنْ لا إله إلاّ الله الواحِدُ القّهار ، القاضي بالحقّ بَيْن عِبَادِهِ يَومِ الحَشْرِ وَنَشهَدُ أن سيدنا مُحَمداً عَبْده ورسوله الذي جاءنا بالبَشائرِ والإنذار ، والصلاة والسلام عليه وعلى آله وَأصحابه الأبرار والتّابعين لَهُم بإحسانٍ في كلّ الأقطار، مَنْ يُطِيع اَلله وَرَسُوله فَقَدْ رَشَد وأهتدى وَمَن يعص الله وَرَسوله فَقد غوى وأعتدى (أمّا بَعْد أيّها المُسْلمون أوْصيكُم عيباد الله بتقوا الله وطاعته)، واتە: لەپاش هەندێ ئەی گەلی موسڵمانان ، وەسیەتتان لێ دەکەم بەتەقواو بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا هەروەها پەیڕەوکردنی خوای مەزن لەهەمو کاتێك وساتێکدا ، جا هەروەها ئەی خاوەن باوەڕان لەپاش ئەوەی (حیساب) دەکرێت هەر کەس بەبێ زوڵم و ستەم حەق و مافی خۆی وەردەگرێت ئینجا فەرمان دەکرێت بە خودا نەناسان وگوناهباران بەرەو دۆزەخ هەروەکو ئاژەڵ و حەیوان بەرەو (جهنم) واتە دۆزەخ تێیان دەخوڕن ، هەروەکو خودا لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ

كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ﴾سووره‌تی الزمر: ٧١ واته : ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕیان نه‌بوو ده‌سته ده‌سته بۆ دۆزه‌خ ڕاپێچ ده‌كرێن وه‌كچۆن له دونیادا بۆ زیندان ئه‌نێردرێن ، هه‌روه‌كو خوای گه‌وره له‌م چه‌ند ئایه‌ته‌ش باسیان ئه‌كاتو ئه‌فه‌رموێت ﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴾ واته: به‌ڕاستی دۆزه‌خیش ده‌مێكه چاوه‌ڕوانی بێ بڕوایان ده‌كا ﴿ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴾ واته: بۆ یاخی بووان جێگاو مه‌نزلگایه ﴿ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴾ واته: هه‌زاره‌ها سال بێ سنوورو نه‌پاوه تیاده‌بن واته هه‌رگیز ڕزگاریان نابێ لێی ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴾ واته هیچ فێنكیه‌ك و شه‌رابێكی خۆشی تیا ناچێژن بۆ سووك بوونی گه‌رماكه‌ی به‌ڵكو هه‌ر ئاوا له حاله‌ته زۆر ته‌نگو ناخۆشه‌دا ده‌مێننه‌وه ﴿ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴾ واته : جگه له ئاوێكی زۆر گه‌رم و كولیو كێم و چڵكی دۆزه‌خیان ﴿ جَزَآءً وِفَاقًا ﴾ ئه‌وویش پاداشتێكی پڕاو پڕه له‌به‌رامبه‌ر به كرده‌وه‌كانیان ، واته له‌و پاداشته‌دا سته‌میان لیچنه‌كراوه چوونكه هه‌ر ئه‌و تۆڵه‌یه هه‌ڵئه‌گرن) ﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴾ چوونكه به‌ڕستی ئه‌وان له دونیادا به‌ته‌مای لێپرسینه‌وه‌ی ئه‌و ڕۆژه نه‌بوون ﴿ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴾ واته : به‌ڵكوزۆر به‌توندیش ئایه‌ته‌كانی ئێمه‌یان به‌درۆ ده‌خسته‌وه وه به‌درۆیان ده‌زانین ﴿ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴾ واته ئێمه هه‌موو شتێكمان له‌سه‌ریان ئه‌ژماردوه به نووسین ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾ سووره‌تی النبأ:٢١- ٣٠، ئینجا پێیان ئه‌وترێ

دەبچێژن کە سزای سەخت و ئازار بەولاوە هیچتان بۆ زیاد ناکەین واتە: تائێوە بپارێنەوە بۆ ڕزگاربوون ئێمە سزاتان بۆ زیاتر ئەکەین.

## (تێبینیەکی گرنگ)

## جەهەنم چی یە؟[1]

جەهەنەم شوێنی (کافرو مونافیق) و دوو ڕووەکانە لەڕۆژی دوایی کە لە ژیانی دونیا (شوێنی تاقی کردنەوەی) ئەوانە کە پشتیان لە فەرمایشت و عیبادەت کردنی خوای گەورە کرد وەلەباتی بەندایەتی ئەو بەندایەتی (تاغوت یان) دەکرد و کەوتنە ناو داوی شەیتان و نەفس و ئارەزووی خۆیان هەروەها شوێنی ئەو کەسانە دەکەتن کە درۆیان بۆ پێغەمبەرەکانی خواو (وەحی) دەکرد هەروەها شوێنی ئەو کەسانە دەکەوتن کە درۆیان بەڕۆژی قیامەت و زیندوو کردنەوە دەکرد ....هتد)

## (ناوەکانی جەهەنەم لە قورئاندا)

١) جهنم / واتە دۆزەخ خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُواْ ﴾ الكهف:/ ١٠٦هەروەها خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزودا لە /٧٧/ واتە لە (حەفتاو حەفت) جێگا دا ناوی هێناوە هەر یەك بە شێوەیەك ئەم دۆزەخە جگە لە (جەهەنم) لە قورئانی پیرۆزدا بەچەند ناوێکی تریش ناوی هاتووە کە هەر یەکەیان لە خۆیەوە ترسناکی و مەترسی ئەمشوێنە

---

(1) جەهەنەم /بە جێگایەکی زۆر ناخۆش دەگوترێ ، هەروەکو خەڵکەکان ئەگەر جێگایەکی زۆر ناخۆش ببینن ئەڵێن ئەڵێی (جەهەنەمە) واتە دۆزەخە.

دەنوێنێ.

٢) هاویـە: /الهاویـە/ ... هاویـە: واتـە بـە شـوێنێکی زۆر نـزم (قـوول) دەگوترێ کە ئەوەی بکەوێتە ناوی جارێك تر دەرهـاتنی بـۆ نیـە، جـا ئایـا دەبـێ هاویەیـەك هـەبێ بگاتـە ئـەو هاویـەی جەهەنـەم نـەخێر ئـەدی ئـەو هاویەیە چی یە؟ خـوای گـەورە دەرهـەقی فەرموویـەتی ﴿ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌ ﴾ سوورەتی/ القارعة: ٨ – ١١).

واتا ئەوەی کێشی کردەوەکانی سووك بێ جێ نشینگەی هاویەیە ، تۆ چوزانیت هاویە چی یە ؟ ئاگرێکی هەڵگیرساوە بەڵێ ئـەو دایکـەی تاوانبـار پەنای بـۆ دەبـا و خـۆ داوێتـە باوەشـی (هاویەیـە) بـەڵام ئایـا لەوێـدا چـی دەبینی .

٣) سـەقەر: (سـقر) واتـە : نـاوێکی تـری جەهەنەمـە خـوای گـەورە فەرموویـــــــەتی﴿ وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ ﴾ سوورەتی/ المدثر: ٢٧ – ٢٩) واتە: تۆ چـوزانی سـەقەر چـی یـە ؟ ئەگـەر پێت نەڵێم ، واتە ئاگرێکە هیچ شتێك نایەڵێتەوە ئەی سوتێنێ لە گۆشـت و ئێسقان و دەمارو وازیش ناهێنێت و جێی ناهێڵێت) واتە پیستی سەرەوەی لاشە ڕەش دەکات واتە بەهەرچی بگات ئەیسووتێنێ و ڕەشی ئەکا یاخوود لە چەند جێگایەکی تر ئەفـەرموێت ﴿ إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴾ واتـە: بێگومـان تاوانکـاران لەسـەر گەردانییـەکی دوور لـە هـەق و لـە ئـاگرێکی هەڵگیرسـاودان ﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ﴾ واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە

لەسەر ڕوویان بەناو ئاگردا ئەکێشرێن ﴿ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴾ واتە: پێیان ئەوترێ دە بچێژن گەرماو سزای دۆزەخ لە پاداشتی کارەکانتاندا ، دە بزانم کەسێك هەیە قوتارتان بکات).

٤) حوطەمة (الحطمة) حوطەمة چی یە :

ئەو شوێنەیە کە هەموو شتێ تێك دەشکێنێ بخرێتە ناوی ، ئایا هیچ (حوطەمەیەك) لەو حوطەمەیەی سزای دوایی بەتێنتر هەیە ؟ هەڵبەتە نەخێر ، ئینجا خودای گەورە ئەفەرموێت ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴾ واتە تۆ چوزانیت ئەو تێکشکێنەرەیەچییە ئەگەر خوا بۆت باس نەکات ﴿ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴾ واتە: ئاگرێکی هەڵکراوی بلێسە داری خوایە، واتە: بە فەرمانی ئەوەوە فریشتەی ئەوی لەسەرە. ﴿ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴾ واتە : ئەو ئاگرێکی وایە ڕوو دەکاتە بنۆکەی دڵەکان و پەڕەی دڵەکان دەسوتێنێ کە سەرچاوەی کوفر بوون ﴿ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ﴾ واتە بەڕاستی ئەو ئاگرە دەوری داون و لەسەریان داخراوەو دای پۆشیون نەهەوای تێ دەچێ و نەهەوای لێ دەڕواتە دەر ﴿ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ﴾ سوورەتی/ الهمزة:٥- ٩) واتە: ئەوان بەستراونەوەو لە ناو چەند کۆڵەکەیەکی درێژکراودا ،واتە دڕبانی و کۆنترۆڵیان لێ بەستراوەو بەهیچ شێوەیەك ڕێگای دەرچوونیان نییە وەهەرگیز قوتار نابن).

٥) سەعیر (السعير) ئەمەش ناوێکی ترەو مانایەکی زەقی هەیە چوونکە ئەم ناوە بە ئاگرێ دەگوترێ کە کڵپەیەکی زۆر گەورەی هەبێ دەقاو دەق

وەك ئاگرەكـەی جەهەننـەم خـودای گـەورە فەرمویـەتی ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغْلَٰلًا وَسَعِيرًا ﴾ سوورەتی/الإنسان: ٤) واتە: ئێمە بەڕاستی ئامادەمـان كـردووە بـۆ بـێ بـاوەڕان زنجـیرو تـەوقی ئـاگری هەڵگیرساو زۆر بە (شیددەت) .

٦) لەظا (لظى) واتە لەظا ناوێكی تریەتی كە مانای ئاگرێكی بە كڵپـە و بڵێسەدەدا بەڵام با بـزانین چـۆن ئاگرێكـە ؟ خـوای گـەورە لـەم بارەیـەوە ئەفەرموێت ﴿كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴾ واتـە: نـەخێر قوربـانی وەرنـاگیرێ بەڕاسـتی ئەو ئاگرە ئاگرێكی بڵێسە داری وایە ﴿نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴾ واتە: داماڵێنەرە بـۆ پێستی سەر واتە پێستی هەڵدەقرچێنیێ و هەڵی دەكەنیێ و دەیبـا) ﴿تَدْعُواْ مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰٓ ﴾ سـوورەتی المعـارج: ١٥ — ١٨، واتـە: ئـەو ئاگرە ئەو كەسە بانگ ئەكات لە دونیادا پشتی لە هەق و ڕاستی كردبێ وە ڕووی لە فەرمانی خـوا وەچـەرخاندبێ مـاڵ و دارایـی كۆكردبێتـەوە وە لـە هەژارانی شاردبێتەوە وە بەشی نەدابن).

٧) جەحیم (الجحیم): ناوێكە پێویستی بە پێناسەكردن نییە چوونكە بە ئاگرێ دەگوترێ كە گڕو گڵپەیەكی زۆر بەتینی هەبێ، هـەروەها بەشـوێنێك دەگوترێ بێ ڕادە گەرم بێ خوای گـەورە فەرموویـەتی : ﴿وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴾ سوورەتی/ الانفطار: ١٤) واتە: بێگومان تاوانباران و بەد كارانیش لە ئاگری دۆزەخ دان).

## ( دەرگاكانی جەهەنەم )[1]

جا بزانە بێ گومان ئەو ئاگرە لە بۆشایی نەوەستاوە بەڵكو وەكو كوورە شوێنی چوونە ژوورەوەی هەیە ، تاكو گەرمیەكە لەناویدا كۆببێتەوە وە هیچی لێ پەرش و بڵاونەبێ جا خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِكُلِّ بَابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ ﴾ سوورەتی/ الحجر: ٤٣ – ٤٤ ) واتە : بە ڕاستی دۆزەخ شوێنی بەڵێنی ئەوانە گشتیان ئەو دۆزەخە حەوت دەرگای هەیە بۆ هەر دەرگایەك دەستە خەڵكێكی تایبەتی دەچنە ناوی یەوە چوونكە هەر دەرگایەك تاوانبارێكی بۆ تەرخان كراوە، ڕاستە جەهەنەم شوێنی چارەنوسی گشت (كافرەكانە)، وە ئەهلی دۆزەخ ئەوەی (كافر) بێ هەتا هەتایە لەناو دۆزەخ ئەمینێتەوە بەڵام ئەوەی موسڵمان بێ دوای عەزاب دێتەوە بەهەشت، جا هەروەها بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (إنَ أهوَنُ أهْلِ النّارِ عَذاباً يَوْمَ القِيامَةَ لَرَجلٍ تَوضَعَ فِي أَخْمَس قَدَميه جَمْرَتانِ يَغْلي مِنْهُما دَماغـهُ) رواهُ الشيخان، واتە: ئەهوەنترو سوكترین ئەهلی دۆزەخ پیاوێكە دووپشك و ئاگر ئەخرێتە ژێر پاژنەی پێی كاتێ كە دەماغی لە گەرمی ئەوانە ئەكوڵێ .

(1) بڕوانە/ پەڕتوكی (مصباح القلوب ومفرج الكروب) لە نووسینی (عبدالرحمن مەلا طه عبدالعزيز) بەرگی ٢ ، لاپەڕە ٧٥٩.

## (باسێك له فرەوانی و قوڵایی جەهەنەم) [1]

جا هەروەها بزانە بێگومان دۆزەخ لە فراوانی و قەبارەیدا بێ (حیساب) گەورەیە ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێت لەم بارەیەوە ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ﴾سوورەتی/ ق: ٣٠ ) واتە: ئەو ڕۆژە وەبیرخۆت بێنە کەوا بە دۆزەخ ئەڵێین ئایە پڕبووی؟ لەو هەمو خەڵکەی پۆل پۆل بۆتی ئەنێرین؟ ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ﴾ سوورەتی/ ق: ٣٠) ئەویش ئەڵێ ئاخۆ زیاتریش هەیە؟ جا هەروەها بێگومان لە فەرموودەیەکی قودسی دا هاتووە کە پێشەوا (بوخاری و مسلم) هێناویانە (لا تَزالُ جَهَنَم يُلقى فيها وتَقولُ هَل من مَزيد؟ حَتى يَضَعَ رَبُ العزة فيها قَدَمهُ فَتَقُول قَط قط وَعزتك وكَرَمك (أي كَفَى كَفى) فينْزَوي بَعضُها إلى بعض)، بەڵی بڕوانان بە سیفەتی قەدەم وەك لە فەرموودەکاندا هاتووە هەیە وە دەستکاریشی ناکەین ، بەڵام (شێوەو چۆنیەتیەکەی) دەگێڕینەوە لای خوا، جا ئیمام ئیبن کەثیر کە دەگاتە تەفسیری ئایەتی ﴿يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ﴾ دەڵێ لەبەر ئەوەی کە خوا بەڵێنی پێداوە دۆزەخ بەمرۆڤ و جنۆکە پڕ بکە ڕۆژی قیامەت پێی دەڵێت ئاخۆ پڕ بویت؟ پاشان ئەوەی تێچوو تورِ هەڵدرایە نێویەوە هێشتا هەر دەڵێ ئاخۆ زیاتر هەیە؟ جا لەو کاتەدا هەر پڕ نابێ و داوای هی تری لێ دەکات ئەوجا خوا پێی پیرۆزی خۆی ئەخاتە ناویەوە واتە پێی (قودرەتی) ئەوسا لە هەیبەتی ئەودا دەچێتەوە یەك و دەڵێ (قط قط)

---

(1) جەهەنەم بە هیچ پڕنابێ مەگەر خوای گەورە پڕی بکات لە (کافر) و (زەندیق) و(شەیاتینەکان و تاوانباران).

واتە خوایە /بەسمە بەسمە / پڕبووم و جێی کەسم نەماوە .

زانایان ئەفەرموون ئەم قسەیەی دۆزەخە ڕاستە و هەقیقەتی هەیە، خوا دەیهێنێتە گفت و گۆ و قسەکردن ئینجا بۆیە خوا پێی پیرۆزی خۆی تێ ئەخاو چوونکە لەوپەڕی قوڵی و فراوانیدایە ، ئیتر بەم شێوەیە لەم لاو ئەولاوە دێتەوە یەك و بچووك دەبێتەوە[1].

ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ جارێك لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووین (ﷺ) ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دەنگی تەپەیەکی گەورەی بەرگوێ کەوت ئەوجا فەرمووی (أتدْرُونَ مَا هَذا) واتە دەزانن ئەوە چی یە؟ دەڵێ گوتمان خوداو پێغەمبەری خوا دەزانن و زاناترن فەرمووی (هذا حَجَرٌ رُميَ به فِي النّار مُنذُ سَبْعِين خَرِيفاً فَهُوَ يَهْوي فِي النّار الأن حَتىَ إنتهى إلى قَعرِهَا) رواه مسلم واتە: ئەمە بەردێ بوو حەفتا پایزە خراوەتە ناو ئاگرەوە بەناو ئاگرەکەدا هەر ئەچێتە خوارێ ئێستاکە گەیشتۆتە بنی) هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (يُؤتى بِجَهَنّم يَومَئذ لَهَا سَبْعُون أَلْفَ زمَامٍ معَ كلّ زَمَامِ سَبْعُون أَلْف مَلَكٍ يجرّونَهَا) رواه مسلم، واتە: لەو ڕۆژەدا جەهەنەم ئەهێندرێ حەفتا هەزار جڵەوی هەیە هەر یەکێ لەم جڵەوانە حەفتا هەزار فریشتەی لەسەرە ڕای ئەکێشن .

(1) ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلم و پێشەوا ئەحمەد یش هەمان ڕاو بۆچوونیان هەیە هەر یەکەشیان فەرموودەیەکی هێناوە ئاشکرایشە کە (قەدەم) واتە (ریجل) هەردووك یەك شتە جا کەوابوو (قەدەم) سیفەتێکی زاتی خوایە بەڵام دیارە ئەو قەدەمە وەك (قەدەمی) درووست کراوەکانی نییە) بڕوانە /تەفسیری / ڕامان/ لە ماناو مەبەستی قورئان، لە نووسینی مامۆستا (ئەحمەد کاکە مەحمود) ، لاپەڕە/ ٧٩٢.

## ( پاسەوانەکانی جەهەنەم )

جا بێگومان خودای گەورە/١٩/ نۆزدە فریشتەی تایبەتی بۆ دۆزەخ داناوە کە هەرگیز لە فەرمان خوا دەرناچن وە دیارە فەرمانیان ئازار دانی تاوانبارەکان و سەرپەرشتی کردنی دۆزەخە، چوونکە بێگومان ئەو /١٩/ نۆزدە فریشتەیە کارگێڕی دۆزەخەن پێیان ئەوترێ (زەبانیە) هەروەها گەورەکەیان پێی ئەوترێ (مالێك) خوای گەورە لەم بارەیەوە ئەفەرموێت ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴾ سوورەتی/ المدثر: ٣٠) واتە: نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن، بۆ سەرپەرشتی و چاودێری و بەڕێوەبردن دۆزەخ ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ﴾ سوورەتی المدثر: ٣١ ) وەهەروەها فریشتەکانمان گێڕاوە بە خەزنەیی دۆزەخ هەر لە فریشتە دامان ناوە کەوابوو کەس ناتوانێ ململانێیان لەگەڵدا بکە وەکو (ئەبو جەل و وەلیدی کوڕی موغیرەو) وێنەی ئەمانەو ...هتد.

## ( پرسیارێکی گرنگ )

خوێنەرانی ئازیزم/ لێرەدا پرسیارێکی گرنگ/ هەیە ئایە ئەو ئاگرەی جەهەنەم تەنها ئەوەندەی ئاگری دونیا گەرمە یان گەرمترە؟ لە وەڵامدا دەڵێین لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێبێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەوا فەرموویەتی (نارُکمْ جزءَ مِنْ سَبْعِين جُزءاً مِنَ نَار جهَنم قِيلَ يا رَسُوُل الله إن كَانَت لَكافِيةً قَالَ فُضَلْت علَيهن بِتسعة وستين جزءاً كُلُهُنَ مِثلُ حرّها) رواه الشيخان. واتە: ئەو ئاگرەی ئێوە بەشێکە لە (حەفتا) بەشی ئاگری دۆزەخ گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو

ئاگرەش بوایە بەس بوو فەرمووی دەنا شەست و نۆ بەشی تری خراوەتە سەر کە هەر بەشێکی وەکو ئەوانەیە لەگەرمیدا چوونکە ئاگری غەزەبی خودایە ئاگری دونیا دەزانن کە چەند گەرمەو هەموو شتێك دەسوتێنێت ئەی ئاگری دۆزەخ/ ٦٩) جار لەو ئاگری دونیایە بە (شیدەت) ترە، چوونکە بەڕاستی ئاگرێکە ئەوەندە گەرم کراوە لە سنوور چوەتە دەرەوە.

هەروەکو دیسان ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کەوا فەرموویەتی (أوْقَد عَلى النّار ألفَ سَنَةٍ حتّى أحْمَرَت ثُمَ أوْقَد عَليْها ألفَ سَنة حتّى أبْيَضَتْ ثُمَ أوقد ألف سنة حتى أسْوَدَت فَهِي سَوْداءٌ مُظْلمة[1] واتە هەزار ساڵ ئاگری دۆزەخ خۆش کرا تا سوور بوو ئینجا هەزار ساڵی تر خۆش کرا تا سپی بوو ئەوجا هەزار ساڵی تر خۆش کرا تا ڕەش ڕەش بوو ئێستاکە لەم دەمەدا ڕەش و تاریکە .

جا هەروەها خاوەن باوەڕان بەیانی ئاگر ی دۆزەخ ناکرێت بە تەواوی چوونکە بێگومان ئەوەندە ناخۆشە ئەوەندە ڕەش و تاریکە ئەوەندە بەهێزو گەرمە ئەوەندە قوڵە نە سەری هەیە نەبن مەگەر خودا بزانێ جا ئیمانداران دەبا خۆمان بپارێزین و دووربگرین لەو ئاگرە بە شیدەتە و لەو سزاو عەزابە و لەو ماڵ وێرانیە دونیایەکی کەم خۆشیەکی کەم نەگۆڕینەوە بە دوارۆژێکی هەتا هەتایی و بەردەام و نەبڕاوە، چوونکە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا ﴾ واتە ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و ژن و ماڵ و کەس و کارتان بپارێزن لە

---

(١) بڕوانە پەرتوکی (التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول) دانراوی (شيخ منصور على ناصف) لەوەرگێڕانی مامۆستا نوری فارس/ بەرگی/ ١ /لاپەرە ٧٨١).

ئاگرێك ﴿ وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ﴾ واتە سوتەمەنیەكەی جەستەو لاشەی مرۆڤی (كافرو) بەردی گۆگردە یان ئەو بەردانەی خەڵكی دەیپەرستن و (عیبادەتی) دەكەن، مەبەست لەوەیە كە زۆر بلێسەدارو بەگڕو گەرمە وەك ئاگری ئەم دونیایە نییە كە تەنها بە دارو بە چیلكە هەڵئەگیرسێ، بەڵكو ئەوبە بەرد زیاتر گڕ ئەگرێ و بلێسە ئەسێنێ، بۆیە (ئیمامی ئەحمەد) (رەحمەتی خوای لێبێت) ئەم حەدیسەی لێرە هێناوە و ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر كە منالآن گەیشتنە حەوت سالآن (نوێژیان پێ بكەن خۆ ئەگەر گەیشتنە دە سالآن و نوێژیان نەكرد دەبێ لەسەر ئەمە لێیان بدەن) جا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ ﴾ واتە: كۆمەڵە فریشتەیەكی زبرو توندو تیژ بەسەریەوەن هەرچەندە داوای بەزەییان لێ بكرێ كەڵكی نیە ﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ ﴾ واتا نا فەرمانی خوا ناكەن لە هەر شتێك فەرمانیان پێ بكە ﴿ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ سوورەتی/ التحريم: ٦) واتە: (هەر فەرمانێكیان پێ بسپێردرێ بەخێرایی ئەنجامی دەدەن).

**( پاشكۆ )**

جا بزانە هەر كەس بە (كافری) بمرێ بەیەكجاری لە دۆزەخدا ئەمێنێتەوە و رزگاری نابێ چوونكە خوای گەورە فەرموویەتی لە قورئاندا ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴾ سوورەتی/ البينة: ٦) واتە : بێگومان (كافرەكان)

له جوو و له دیان له گاور له هاوبەش دانەرەکان بۆ خوا گشتیان له دۆزەخ دان هەتا هەتایە تێیدا ئەمیننەوە/ ئەوانەی خراپترین خەڵکن بەلام موسڵمانان و تاوانبارەکان/ هەرکەسەو بە گوێرەی گوناهەکانی ئەسووتێ کە سزای تەواو بوو ڕزگاری ئەبێ و ئەچێتە بەهەشت (عَن أنسٍ (رضي الله عنه) قال النبي (صلّى الله عليهِ وسلم): (يَخْرُج مِنَ النّار مَنْ قَالَ لا إله إلاّ الله وَفِي قلْبِهِ وَزن ذَرةٍ مِنْ إيمان) رواه الشيخان واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت هەرکەسێك (شەهادەی) هێنابێ و بەقەد زەرەیەك باوەڕی لە دڵیدابێ لە ئاگری دۆزەخ دەرئەچێ و ڕزگاری ئەبێ) هەروەها زۆر کەسیش بەهۆی (شەفاعەت) ڕزگاری ئەبێ .

ڕەحمەت لەو کەسەی کە گووتویەتی :

قووڵی جەهەنەم حەفتا ساڵ ڕێیە — گشتی ئاگرە حەوت شوێنی لێیە
لەبۆ هەر شوێنێ هەندێك تاوانبار — ئامادەی کردووە خودای کردگار
هەرکەس بە گوێرەی گوناه ئەسووتێ — کە سزای وەرگرت ڕزگاری ئەبێ
بەلام ئەو کەسەی بە (کافر) بمرێ — ئەو یەکجاریەو ڕزگاری نابێ[1]

خوایە گیان بە ڕەحم و بەزەیی خۆت عەفوومان بکەی/ لە بەلا و موصیبەتی دنیا و قیامەتمان بپارێزی وە لە سزا و عەزابی دۆزەخ بە دوورمان بگری ئامین، (نَبهَني الله وإيّاكُمْ مِنْ نومةِ الغَافِلينْ وَحَشَرَني وإيّاكُمْ تَحْتَ لِواء سَيّد المُرْسَلين اللّهُمّ اغفر لَنَا آمين)

(رَبّنا آتينا في الدُنيا حَسَنَةً وَفي الآخرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النار–آمين).

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (عەقیدەی ئیسلامی) لەسەر ڕاڕەوی (أهل السنه والجماعه) لە نووسینی مامۆستا (مەلا عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی) لاپەڕە ٥٣.

# ئامۆژگاری پەنجاو سێ
## باسی دۆزەخ ئەکات بەشێوەیەکی تر

الحمدُ لله ثُم الحَمْدُ للهِ مَا تَوْفيقي ولا إعتِصَامية الاّ باللهِ عَلَيْه تَوَكّلْتُ وإليه أُنيب الحمدُ لله الذّي بِيَده مَلَكُوت كُلّ شيءٍ وإليه تَرْجَعُون الحمدُ للهِ قَسَم الرِّزق وَعدّد الأعمار ساوى بالموت بَيْنَ العَبيد والأحْرَار مَنْ شاءَ أدْخَلَهُ الجنّة ومَنْ شاءَ أدْخَلَهُ النّار فَنَسألهُ مِنْ فَضْلِه المتاب قَبل وُقوع العَذاب، وأشهَدُ أن سَيّدَنا وَنَبيّنا مُحَمّداً عبدهُ ورسُولهُ النبّي الأواب والصلاة والسلام على سيدنا مُحَمّدٍ وَعَلَى آلهِ وأصحابهِ الذينَ هُمْ فيما عند الله رَاغِبُون) أمّا بَعْد أوْصِيكُم عِبَادَ اللهِ أولاً بِتَقوا اللهِ وطاعتهِ ولزُومِ أوَامِره) واته لە پاش هەندێ موسڵمانەكان يەكەم شت وەسيەتتان لێ دەكەم بە تەقوای خودای گەورەو بەجێ بەجێ كردنی فەرمانەكانی خودای گەورە و مەزن كە هەر لەو بترسێن گوێداری ئەو بكەن .

### ( باسێك لە سووتەمەنی ئاگری جەهەنەم )

گوێگری ئازيزم ئاگر هەميشە لە سووتاندنی شتێك پەيدا ئەبێ واتە ئەگەر بتەوێ ئاگرێكت دەست بكەوێ دەبێ شتێك بسوتێنی ئەو ماددەيەش كە بۆ دەست كەوتنی ئاگر دەيسوتێنی پێی دەگوترێ سووتەمەنی (وقود) بۆ نموونە ئاگری ئێمە كە بە دارو نەوت و بەنزين خۆشی دەكەين بەڵام (ئاگری دۆزەخ) سووتەمەنی خۆی هەيە ئەويش بريتيە لە بەردو جەستەی (كافرەكان)، هەروەكو خوای گەورە لە قورئاندا

ئەفـــەرموێت: ﴿ فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴾ ســـوورەتی/ البقـــرة: ٢٤) واتـــە: خۆتـــان بپـــارێزن لـــەو ئـــاگرەی کـــە سووتەمەنیەکەی ئینسانی بەدکارو بەردە/ کەئامادە کراوە بۆ (کافران) واتە بێ باوەڕەکان هەروەها خوا لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ ســـوورەتی/ النـــساء: ٥٦) واتە: بێگومان ئەو کەسانەی بێ باوەڕ بوون بەو (کتێبانەی) کە ناردوومانە بۆ پێغەمبەرەکانمان بەپێی بڕیارو فەرمانەکانی خودا ڕەفتار ناکەن ئەوانە لـە ڕۆژی دوایـیـدا لـەناو ئـاگری دۆزەخـدا دەیـانبرژێنین هـەرکاتێکیش کـە پێیستی لەشیان بەتەواوی بسوتێت خێرا پێستەکەیان دەگۆڕین و نـوێی دەکەینەوە بۆیان تا زۆرتر ئازار بچێژن ، بەڕاستی خودا خاوەنی توانایەکی بەدەسەلاتە و ڕەهایە وە هەرچیەکی بوێت دەیکات وە لەهـەموو کاروبـارە کانیدا خاوەن مەبەستەو بێ حیکمەت نیە ئیش و کاری .

**( ئاگاداری )**

حیکمەت لە گۆڕینی پێستدا ئەوەیە کە دەمار (أعصاب)ەکـانی هەسـت هەمووی بەپێستەوەیە بۆیە کە پێستەکە تەواوسووتا ئیتر لاشـەکە هەسـت بە ئازارێکی وا ناکات ئەم (حەقیقەتە) پێشتر نەزانرا بوو تازە زانستی نوێ دەری خستووە بێگومان ئەگەر قورئـانی پـیرۆز لەلایـەنی خـوداوە نەبوایـە ئەوە ئەمجۆرە (حەقیقەتە) زانستیانەی تیا نەدەبوو چوونکە پێغەمبەرمان (ﷺ) خۆی ئەم جۆرە باسانەی نەدەزانی .

## ( چۆنیەتی بردنیان بۆ دۆزەخ )

پـاش دەرچـوونی (حـوکم) لەلایـەن خـوای گـەورەوە (کافرەکـان) بـە خشاندن لەسەر ڕوو بەرەو دۆزەخ ڕادەکێشرێن و ئینجا خـوای گـەورە لـەم بارەیـەوە فەرموویـەتی﴿ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَـٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴾ سوورەتی/ الفرقان: ٣٤) واتە ئەو (کافرانـە) لەسەر ڕوو بەرەو دۆزەخ ڕائەکێشرێن ئەوانە جێگای خراپترو گومڕاترن، جا هەروەکو لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هـاتوەو ئـەڵێ پیـاوێ گـوتی ئەی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لـە ڕۆژی قیامەتـدا (کـافر) چـۆن لەسـەر ڕوو (حەشری) دەکرێ؟ پێغەمبەریش لە وەڵامدا فەرمووی (أَلَيْسَ ٱلَّذي أَمْشاهُ عَلى رِجْلَيْهِ فِي الدّنيا قَـادِراً عَلَـى أَنْ يَمْشيهُ عَلـى وَجْهِـهِ يَـومَ القِيامَـةِ) رواه الشيخان، واتە: ئایـە ئـەو زاتـەی لـە دونیـا لەسـەر دوو قاچـەکەی دیڕوانـد توانای نیە لەسەر ڕوو بیڕوێنی لە ڕۆژی قیامەت ؟!)

## ( سووکردنەوەی کافرەکان لە کاتی حەشرو حیسابدا )

ئینجا لەدوای (حەشرو حیساب) زۆر بە ووردی لەو ڕۆژەیە کـە هەرچـی ئینسان لـە دونیـا کردبیـەتی دێتـەوە پـێش چـاوی وە بەچـاوی دادەنـەوە تەنانـەت (حـەقی) حـەیوانی کـۆڵ بەسـەر شـاخدارەوە نـاهێڵن، ئینجـا (حەیوانات) کە (حەشریان) کرا بە (ئەمری) خوا دەبنەوە بە خـاك و خـۆڵ ئەوجا لەو کاتەدا یە کە (کافرەکان) ئاوات دەخـوازن و دەڵـێن خۆزگـە کـە ئێمەش وەکو ئەو (حەیواناتانە) دەبوینەوە بـە گڵـو ڕزگارمـان دەبـوو وەك

قورئـان ئامـاژەی بـۆ ئـەکاو ئەفـەرموێ ﴿ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ﴾ سوورەتی/ النبأ: ٤٠ ) واتە: ئەو دەمەکافرو بێ بڕواش دەڵێت ئای خۆزگە هەر خـاکو خـۆڵ بوومایـە نـەك ئـادەمی تـا ئـاوا زینـدوو نەکرامایەتـەوەو (حیسساب) نەکرامایـە ئـەم وەزعـەم نەدیتبایـە ، هەروەهـا لـە (حەدیـسدا) هاتووە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (...ولا يدخل النّار أحَدٌ إلاّ أري مَقعدهُ مِن الجنّة لَوْ أحسَن لِيَكونَ عَلَيه حَسرةً) رواه البخاري، واتە: وە هـەر کەسێ بچێ بۆ ناو ئاگر ئەو جێگەیـەی پـێ نیـشان دەدرێ کـە لەبەهەشـت بۆی دانرابوو ئەگەر لە ژیانی دونیا چاکە بکردبایە دەیدرایێ ئەمـەش تـاکو بۆی ببێتە (حەسرەت) و داخ لە دڵی هەتا هەتایێ) .

## ( خواردنی کافرەکان لەناو جەهەنەمدا )

خواردنی ئەهلی (جەهەنەم) بریتیە لە (کێم و زوخاوی خوێن) ئەو کێم و زوخاوو خوێنە لە جەستەی تاوانبارەکان دەچۆڕێتەوە چـوونکە ئاشـکرایە کاتـێ پێستی لەشی مرۆڤ ئافرەتان تاوانبارەکان دەبرژێ ئینجا کێم و ئـاوو خوێن و پیسی لێ دێتە دەرەوە کە برسیان دەبێ دەیان درێتـێ و دەیخـۆن ، جا هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا ئەفـەرموێت ﴿ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ [1] ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴾ سوورەتی/ الحاقـة: ٣٥ – ٣٧) جا ئەمڕۆش لێرە واتە ڕۆژی قیامەت هیچ دۆستێکی بۆنییـە تـا

---

(1) غِسْلِينٍ : واتە بەوە ئەڵێن ، ئەو کێم و زوخاوو خوێنەی لەبەر (کافرەکان) دەڕوات وئینجا دەرخواردیان ئەدەن.

تکای بۆ بکات تۆزێ ئەو بارەی لێ سووك بکات و خواردن و خواردنەوەشی هەر کێم و زوخاوی داچۆڕاوی لاشەی دۆزەخیەکانە، واتە : گوناهباران نەبێ کەسی دیکە لێی ناخوات واتە هەرئەوانە دەیخۆن کە باوەڕیان بە خوا نەبووە).

٢) دڕکی ضەریع(1): واتە دڕ ئەم جۆرە دڕکە هەرچەندە (کافرەکان) لێ دەخوا بەڵام نە برسیەتی پێ دەشکێ وە نەهیچ سوودو قازانجێکی پێ دەگا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناچار ئەبێ هەر بیخوات وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴾ سوورەتی/ الغاشیة: ٦ – ٧) واتە: هیچ خواردنێکیان نییە مەگەر (ضریع) نەبێ کە ئەویش نەقەڵەویان ئەکات نە برسیەتیان ئەشکێنێ، هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾ سوورەتی/ المزمل: ١٢ – ١٣) وا ئێمە کۆت و زنجیرو ئاگرێکی بەتینمان لەبەر دەستە (لە ڕۆژی قیامەت بۆ کافرەکان) هەروەها خواردنێکی ئەوتۆ کە قورگیان دەگرێ(2) لەگەڵ ئازارێکی زۆر بە ئێش .

٣) زەققوم: /جا بێگومان/ زەققوم/ تاڵترین و ناخۆشترین/ خواردنیانە/ بریتیە لە دارێك لەناو جەرگەی جەهەنەم شین بووە (کافرەکان) لە برسان

---

(1) ضە ریع / واتە حوشترالۆك، دیارە ئەم ڕووەکە بە کوردی دڕکی حوشتر خوارد ی ناوە ).

(2) طعاماً ذا غصّة: واتە موفەسرین ئەڵێن، دڕکێکە بە قورگ وەدەنوسێ نە دەچێتە خوارەوە نە دەچێتە دەرەوە .

و ناچـاری دەیخـۆن و وورگـی خۆیـانی پـێ پـڕ دەکـەن خـوای گـەورە فەرموویـەتی لـەم بـارەوە ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴾ سوورەتی/ الدخان: ٤٣ – ٤٤) واتـە بێگومـان داری زەقنـەبوت کـەدارێکی بەرو بوم تاڵەو[1] خۆراکی تاوانکارەواتا مرۆڤی (کافر) چوونکە مەبەست لە (أثـيم) مرۆڤـی (کـافرە) وەکـو لـە ئایەتـەکانی پـاش و پێـشی خۆیـەوە دەرئەکەوێ ﴿ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴾ سوورەتی/ الـدخان: ٤٥) واتـە هەروەك مسی تواوە لە سکی گوناهباراندا جۆش ئـەخوا و ئـەکوڵێ (کغلـی الحمیم) سورەتی الدخان ئایەتی (٤٣-٤٤-٤٥-٤٦) واتە هەر چۆنێ ئـاوێ کوڵ بە کوڵ دێتە جۆش هەر کـات دۆزەخییـەکان برسـیان بـوو بـەری ئـەو درەختەیان ئەدرێتێ لە سکیاندا وەك ئاوی گەرم ئەکوڵێ).

هـەروەها لـە باسـی (زەقـوم) خـوای گـەورە لـەم چـەند ئایەتـەش ئەفەرموێت ﴿ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِيٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ ﴾سـوورەتی/ الـصافات: ٦٢ – ٦٨ ) واتـە: ئایـە ئـەم هـەموو نـازو نیعمەتـەی کـە لەپێـشەوە بـاس کـران باشترە یاخود درەختی (زەقووم؟) ئێمە ئەو درەختەمان گێڕاوە بە مایـەی

---

(1) ئەم درەختە/ بەرەکەی زۆر تاڵە ئەڵێن لە (تەهامە) کە شارێکە لە (حجاز) لەوێ ئەڕوێ و شین ئەبێ ..).

سزاو عەزاب بۆ کافران ئەمە درەختێکە لە بنی دۆزەخەوە دەرئەچێت بەرەکەی ئەڵێی سەرکی شەیتانەکانە جا کافرەکان لێی دەخۆن و وورگی خۆیان لێ پڕدەکەن پاشان ئاوێکی داخ بووی تێکەڵاو بە خڵتەیان ئەخۆنەوە ئینجا دوای ئەوە گەڕانەوەیان بۆناو دۆزەخی سوتێنەرە ئەوجا پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا ئەفەرموێت (لَوْ أنّ قَطرةً منْ الزَّقُوم قُطِرَتْ فِي الدّنيا لأفْسدَتْ عَلى أهلِ الدّنيا مَعيشَتُهُمْ فَكَيْفَ بِمَنْ لَيْسَ لَهُ طَعَامٌ غَيْرهُ) رواه ابن ماجه) واتە: ئەگەر یەك دڵۆپ لەو زەقومە بڕژێتە سەر زەمین ژیان و گوزەرانی خەڵکی سەر زەمین تێك دەدا/ جا دەبێ حاڵی ئەو کەسە/ چۆن بێ کە خواردنێکی تری نییە/ جگە لەوە ئەم شتە تاڵ و ناخۆشانە دەخۆن تینویان دەبێ ئینجا ئاویان بۆ دەهێنرێ بەلاّم نەك ئاوێکی ئاسایی بەڵکو ئاوێکی تاڵ و ژەهراوی وەکو خیزاو).

## ( ئاوی خواردنەوەیان ئایەتیە )

ئاوی خواردنەوەی (ئەهلی جەهەنەم) ئاوێکی هەرچەندە بڵێی گەرمە یەکەم جار ئەوەیە کە ئاو لەدەمیان نزیك دەکەنەوە تەنها هەڵمەکەی هەرچی پێستی سەرو چاویانە هەمووی دەبرژێنێ وە دەیکاتە مەشووی و خەرووز ئەمەش لەم ئایەتەی خوارەوە دەرئەکەوێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾ سوورەتی/ الكهف: ٢٩) واتە: ئەی پێغەمبەر پێیان

بلّیٚ هەق و ڕەوا لەلای پەروەردگارتانە، جا ئەوەی ویستی با ئیمان بهێنێ وە ئەوەی ویستی با (کوفر) بکات ئێمە ئاگرێکمان بۆ ستەمکاران (کافرن) ئامادە کردووە کە شوورەکەی دەوریی گرتوون وە ئەگەر داوای ئاو بکەن ئاوێکیان بۆ دەبردرێ وەکو ڕۆنی قرچاو یان کانزای تواوە وایەو سەرو ڕوو دەبرژێنێت بەڕاستی خواردنەوەیەکی بەدو خراپە وەئاگرەکەش جێنشینێکی ناهەموارە جاری دووەمیش ئەوەیە کە دەیخۆنەوە هەموو هەناوو کۆ ئەندامی هەرسیان دەتوێنێتەوەو پارچەپارچەی دەکات خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ وَسُقُوا مَآءً حَمِيمًا ﴾ سوورەتی/ مُحَمَدْ: ١٥) واتە: ئاوێکیان دەرخوارد دەدرێت کە لە پلەی هەرە بەرزی گەرمی دایە کەئەیخۆنەوە ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە ئەکات .

**( سەرنجێك )**

بەڵی ئەوەیە ئاوی خواردنەوەیان دوای زەقومی تاڵ بەلاّم لەگەلّ ئەو گەرمییەشدا (کافرەکان) زۆر بەتامەزرۆن بۆ خواردنەوەی ئینجا خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَـٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَـٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَـٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَـٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ [1] ﴿٥٧﴾ ﴾ سوورەتی الواقعة: ٥١ – ٥٧

پاشان ئێوە ئەی گومڕایانی بێ بڕوا بێ گومان لە درەختی (زەقوم)

---

(1) سورەتی الواقعە : ئایەتی (٥١ ،٥٢ ،٥٣ ،٥٤ ،٥٥ ،٥٦ ،٥٧) .

ئـەخۆن لـە برسـانا وورگـی لێ پـڕ ئەکـەن ئینجـا ئـاوی کـولاّوی بەسـەر دا ئەخۆنەوە، ئەیخۆنەوە بە وێنەی خواردنەوەی ووشتری تینوو کـە هەچـەند ئـاو بخواتـەو بـڕی پـێ ناشـکێ ئەمـە مێواندارى ئەوانـە لـە ڕۆژی (جـەزا دانەوە).

**(جل و بەرگی ئەو کافرانە)**

خوای گـەورە لـە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ ﴾سوورەتی/ الحج: ١٩) واتە: ئەوانە کـە (کوفریـان) کـردووە جلێکیان بۆ لە ئاگر بڕاوە ،وە هـەروەها خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا لـەبارەی ئـەو جـل و بەرگـەوە فەرموویـەتی ﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ ﴾ سوورەتی إبراهیم: ٤٩ – ٥٠ واتە (کافرەکان) دەبینی لەناو تـەوق و زنجـیردا گـرێ دراون و کراسـەکانیان لـە قەترانـە وە ئـاگر ڕوویـان دادەپۆشێ، جا لە ئیبنو عەبباسەوە (خوایان لێ ڕازی بێـت) کـە لـەبارەی (قەتران)ە گووتویەتی بریتیە لە مسی تـواوە) هـەروەها خـوای گـەورە لـە قورئانـــدا ئەفـــەرموێت ﴿ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ﴾ ســوورەتی/ الأعــراف: ٤١) واتــە: (لـە دۆزەخـدا ڕایەخیان لە ئاگر بۆ هەیە وەلە سەروشیانەوە بۆشـەر ئاگرینیـان بـۆ هەیـە وە بەم شێوەیە ئێمە جەزا ستەمکارانی (کافر) دەدەینەوە).

**( باسێك لە دادو فریادی هاوار هاواری دۆزەخیان )**

وە هــەروەها خــوای گــەورە ئەفــەرموێت﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾ ســــوورەتی/ غــافر: ٤٩ – ٥٠ ) واتــە: دۆزەخیەکان لەناو ئاگرەکەدا بە دەرگاوانەکان و بەرپرسانی دۆزەخ دەڵێن داوا لە خودا بکەن بەڵکو ڕۆژێ سزامان لەسەر لاببا لە وەڵامدا پێیان دەڵێن ئــەوە نــەبوو پێغەمبــەرەکانتان هــاتن بــۆ ناوتــان و بەڵگــە ڕۆشــن و (مــوعجیزەی) گــەورە گــەورەیان نیـشان دان وە ئێـوە لەبـەر لاســاری و سەرکێشی خۆتان باوەڕتان پــێ نــەرکردن و ڕۆژی ڕەشــی وەك ئــەوڕۆژەی خۆتانتــان بــەدرۆ دەزانــی؟ دەڵــێن بــەڵێ بــەخودا ڕاســت وابــوو ، جــا دەرگاوانــەکان پێیــان دەڵــێن دە هــەر هــاوار بکــەن و بپاڕێنــەوە داد نــاداو پاڕانەوەی بێ بڕوایانیش هیچ کەلکێك نابەخشێ چوونکە دوعـای (کـافران) بێ سوودو گومڕاییە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (ئـەوجا بەیـەکتر دەڵـێن با لە مالێك بپاڕێینــەوە جا لەســەر ئــەم شـێوەیە ئـەم پرسـیارو وەڵامـەی نێوانی ئەوان و مـاڵیکی سـەرۆکی کـار بەدەسـتانی دۆزەخـدا وەك قورئـان بۆمان دەگێڕێتــەوە و ئەفــەرموێت: ﴿ وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴾ سوورەتی/ الزخرف: ٧٧) واتە: بانگ دەکەن ئەی (مالـك) داوا لە خودای خۆت بکە با لەناومان ببا هەتا هەتایە یا (حـوکم) بکـات لـەناو ناومـان ببـات یـا لـەکۆڵمان کاتــەوە هــەتا هەتایــە لــەم سزایە ڕزگـار بـین

مالیکیش لە پاش هەزارساڵ ئەم وەڵامەیان دەداتەوە ئەمە جێگەتانە و لێرە نابزوون هەتا هەتایە چوونکە دۆزەخ جێگای ئێجگاریتانە ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت لەناو خۆیاندا دەڵێن ئینجا لە خودای خۆتان بپاڕێنەوە خودا لەهەموو کەسێ باشترە ئەو لە هەموو کەسێ (بەڕەحمترە)، بەڵکو لێمان خۆش ببێ ئەوجا وەك قورئان دەفەرموێ ئینجا ئەوان دەڵێن: ﴿ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ ﴾ سوورەتی/ المؤمنون: ١٠٦ – ١٠٨ ) واتە: پەروەردگاری ئێمە چارە ڕەش خۆمان زۆری بۆ هێنابووین و لاەی لێ بڕیبوینەوە خۆشمان هۆزێکی سەر لێشێواو بووین وا ئێستا هەستمان بە هەڵەی خۆمان کردووە وە پێ لە تاوانەکانی خۆمان دەنێین ئەم جارە بە (ڕەحمەتی) خۆت لەم ئاگرە دەرمان بکەو بمان بەرەوە بۆ جیهان جا ئەگەر ئێمە سەر لە نوێ وەك جاری پێشوو لە تاوان و گوناه دەستمان پێکردەوە ئیتر عوزرو بیانوومان نامێنێ و دەبین بە تاوانبارو ستەمکاری ئێجگاری و مافی قسەو پاڕانەوەو تکامان نامێنێ ، جا خوای گەورە لەپاش ماوەیەکی زۆر وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ (چخەتان لێبێ) هەتا هەتایە لەناو ئەم ئاگرەدا ئاوا بە داماوی و سەر شۆڕی دەژین ئیتر نەخەڵەتین نقەتان لێوە بێ یا (فزە بکەن) فەرمووی ئیتر ئەو کاتە لە هەموو خێرێ نائومێد دەبن و دەست لەخۆیان دەشۆن و دەست دەکەن بە ئاخ و داخ و هاوار هاوار).

**( دوو تێبینی زۆر گرنگ )**

**(( یەکەم خوای گەورە نابینن ))**

چوونکە گەورەترین ئازارو ناخۆشی (ئەهلی) جەهەنـەم ئەوەیـە کـە لـە بینینی خوای گەورە بێ بەش دەبن چوونکە خـوای گـەورە هـەرگیز خـۆی بەوان نیـشان نـادا ، خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴾ سـوورەتی/ المطففـین: ١٥) واتـە: نـە بێگومـان لـەو ڕۆژەدا دوورخـراوەن لـە بینینـی پـەروەردگاریان، ئەمەشـبە پێـچەوانەی (ئـەهلی) بەهەشتە کە ئەوان خوای گـەورە دەبیـنن هـەروەك خـۆی فەرموویـەتی ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ سـوورەتی/ القیامـة: ٢٢ – ٢٣) لـە پێشدا ئەمەتەفسیر کراوە .

**( دووەم : شوێنی مونافیقەکان لەناو تاقمی کافراندا )**

شوێنی (مونافیقەکان) تایبەت ترین شوێنە خوای گەورە لەم بارەیـەوە ئەفـــــــەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾ سـوورەتی/ النـساء: ١٤٥) واتـە: بێگومـان (مونافیقـە) دوو ڕووەکان لە ژێرەوەترین چینی نـاو ئـاگرن، وە هـیچ سەرخەرێکیشیان بـۆ نادۆزرێتەوە واتە چ برادەرو دۆستێکیان نییە ڕزگاریان بکات .

(پاشکۆ) جا هەروەها بێگومـان ئـەو (کـافرو) بـێ باوەڕانـە گـەورەترین سزاو (عەزاب) و (حەسرەت) و نەدامەت تووشیان ئـەبێ چـوونکە لـەوڕۆژە ئـەزانن چـیان کـردووەو لـە دونیـادا چ زوڵـم و زۆرداریـان ئـەنجام داوە ،

هەروەها دەزانن چەند تاوانبارن وگوناه بارن بەلاًم ئایە پەشیمان بوونـەوە لەو ڕۆژەدا کەڵك دەدا و سوودی هەیە ؟!! لە وەلاًمدا ئەڵێن نەخێر ئـەوجا لەپاشان خەڵکی دۆزەخ هەموویان کۆ دەکەنـەوەو وە شـەیتان دەهێـنن و سەکۆیەکی ئاگرینی بۆ دائەنێن ئینجا پـێ دەڵـێن وەرە ووتاریـان بـۆ بـدە وەکو تۆ چۆن ئەوانت هەڵخەڵەتاندووە بەلاًم خەڵکەکە پـێ ی دەڵـێن ئـەی (مەلعون) بەڕاستی تـۆ ئێمـەت گـومڕا کـرد لەسـەر ڕێگـای ڕاسـتت لادایـن ئەویش دەڵێت: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ﴾ســوورەتی/ إبــراهیم: ٢٢) واتە/ کاتێ هەمووشت تەواو دەبێت بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە دۆزەخیەکان دەخرێنە دۆزەخەوە ، شەیتان بە فرەمانی خـوا دێتـە قـسەو گفتوگۆ بە کۆمەڵ و جەماعەتی خۆی دەڵێت، بەڕاستی خوا بـەڵێنی ڕاسـت و درووستی پـێ ڕاگەیانـدوون منـیش بـەڵێنی درۆو نادروسـتم پێـداونو جـا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست و درووست وێڵتان بکەم و هەڵتان بفریـوێنم و لەسـەر ڕێتـان بـبم و هـەڵتان خەڵـەتێنم وەنـەبێت مـن هـیچ دەسـەلاًتێکم بەسـەر ئێـوەوە هـەبووبێت جگـە لـەوەی بـە (وەسوەسـە) و خەتەرەو خەیاڵ بانگم کردن بۆ خوا نەناسی و تاوان و خراپەکاری و زوڵم و زۆرداری، ئێوەش بەدەنگ منەوە هاتن و بە قـسەتان نـەکردم ئـیتر لۆمـەو سەرزەنشتم مەکەن بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکـەن، ئینجـا بـەم شێوەیە وەلاًمیان دراوەتەوە ئینجا هەموو خەڵکی دۆزەخ و جەهەنـەم تـف

و (لەعنـەتی) لێ دەکـەن وە خـوای گـەورەش لـە تۆڵـەی هەنـدێ تـاجێکی ئاگرینی لەسەر ئەنێ و پەتك و زنجیری ئەکەن لەناو دۆزەخ هـەتا هـەتایێ، (خوایـە گیـان) بـە لوتـف و میهرەبـانی خـۆت هـەمووومان لـە دۆزەخ دوور بکـــەرەوە وە(هیدایـــەت) و ڕێنوێنیمـــان بکـــەو[1] لەبـــەر خـــاتری خۆشەویستەکەت کە حەزرەتی (محمد المصطفى)ی نازدارە (ئامین)، (ربّنا آتينا في الدّنيا حَسَنَةً وفي الآخرةِ حَسَنَةً وَقِنَـا عَـذَابَ النّـار، أقـول قَـوْلي هـذا واسْتَغْفِر الله لِيّ وَلَكُـم ولِـسَائر المُـسْلمِين والحَمْدُ لله رَبِّ العـالمين نـبهني الله وإيّاكُمْ مِنْ نَوْمَةِ الغَافلِينْ وَحَشَرَني وايّكم تَحْتَ لِواءِ سَيّدْالمُرْسَلِين).

---

(1) چوونکە بێگومان زۆربەی دوعاو پاڕانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوە ئەیفەرموو خوایە ڕزگارم کەی لە ئاگری دۆزەخ / وەکو وەکو ( موسلیمی کوڕی حارسی تەمیمی خوا لێی ڕازی بێت ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ حەزرەت (ﷺ) بەیانیان و ئێواران ئەم دوعایەی ئەکردو ( اللهُمَّ أجِرني مِنَ النارِ سَبعَ مَراتٍ فإنّكَ إذا قُلتَ ذلكَ ثُمَّ مُتَّ مِن ليلَتِكَ كتب لكَ جوارمنها وإذا صليت الصُبحَ فَقُلتَ ذلكَ فإنّكَ إن مت مِن يَومك كُتِبَ لَكَ جِوارٌ منها) رواه أبو داود وإبن جبان ). واتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کاتەی لە نوێژی مەغریب و بەیانی ئەبویەوە ئەی فەرموو خوایە پەنام بدە لە ئاگری دۆزەخ حەوت جار ئەمەی دووبارە ئەکردەوە /ئەوا ئەگەر ئەمەت ووت و لەو شەوو ڕۆژەدا مردیت پەناگات بۆ دەنوسرێت لە ئاگر )وە هەروەها عامری کوڕی ئوسامەش ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای سوننەتی نوێژی بەیانی ئەم (دوعایە)ی ئەکردو ئەیفەرموو (اللهُمَّ رَب جبريل وإسرائيل و ميكائيل و محمد النّبي (ﷺ) أعوذ بِكَ مِنَ النار) رواه ابن السُني وأخرجه الحاكم في المستدرك ، واتە / ئەپاڕێتەوە لە پەروەردگاری (جبریل و ئیسرائیل و میکائیل و موحەمەد(ﷺ) تا لە ئاگری دۆزەخ پەنای بدا).

# ئامۆژگاری پەنجاو چوار
## باسی باوەڕ بە قەزاو قەدەر ئەکات

الحَمْدُ لله ثُمَ الحَمْدُ لله ..الخ الحَمْدُ لله الذّي يَعْلَمُ حَالَ عَبْدِه في سِره وَجَهره نَحْمَدُهُ وَنَشْكُرُهُ وَنَشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ لَهُ المُلْكُ والحَمْدُ حَتّى تَرْضى وأشْهَدُ أنَّ سَيِّدَنا مُحَمداً عَبْدُهُ وَرَسُولهُ حَيْثُ قالَ (الإيمانُ أنْ تُؤمِنَ باللهِ وملائكَتِه وَكُتُبِه وَرُسُله واليَومَ الآخرِ خَيْرِه وشَرِّه مِنَ الله تعالى) رواه الشيخان/ والصّلاةُ والسّلام عَلَيهِ وعَلى آلهِ وأصْحابِهِ ومن تَبَعُهُم بإحْسان إلى يَوم الدين/ وبَعْد أوْصيكُمْ عِبادَ الله بالإيمان والإحْسان فإنَ الله مَعَ الذّين إتَقوا والذّين هُمْ مُحْسِنونْ/ أخي المُسْلم لَقَدْ ذكرت لكَ في الخطب المَاضيةَ بحث الإيمان باللهِ ومَلائكَتِه وكُتُبِه وَرُسُلِهِ واليّومِ الآخر بِطُولِهِ وتفْصيله) واتە: لەپاش هەندێ ئەی بەندەكانی خودا وەسیەتتان دەكەم بە ئیمان و باوەڕو چاكە كردن چوونكە بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ چاكەكەرانە بەتايبەتی ئەوانەی تەقوانە .

ئینجا موسڵمانینە لە ووتارەكانی ڕابردودا باس ی پێنج بەندو پايەكانی ئیسلامم بۆ كردن بەتايبەتی (ئەصڵی) ئیمان و باوەڕ بە (كوتوبی) ئاسمانی و ئیمان بە پێغەمبەران و ئیمان بە ڕۆژی قيامەت و دواڕۆژم بۆ كردن بە دوورو درێژی (وأذكر لك في هذه الخطبة الركن السّادس مِنْ أرْكان الإيمان وهُوَ الإيمان بالقَدر خيرِه وشرِه) واتە: ئەوا لەم خوتبەشدا باسی بەندو ڕوكنی (شەشەمتان) بۆ دەكەم كە بريتيە لە (ئيمان و باوەڕ بە قەزاو قەدەر بە خێرو شەڕيەوە) (فَيَجب أنْ تؤمن بأنَ كُل موجودٍ سواهُ تَعالى إنّما هُوَ بِخَلقهِ وإيجاده وقضاءه وقدرِه) واتە ئيمان بە قەزاو قەدەر بريتيە

لەوەی کەئینسان (تەسدیق) و باوەڕی هەبێ بەوەی کە هەموو شتێك بە خەڵق وئیجادەو ئیرادەی خوای گەورەیە[1] هەروەها هەموو کارو فەرمانێك بە قەزاو قەدەری ئەوەوە درووست بوووە هەرچی بیکا ئەیکا چوونکە هەموو عالەم موڵکی خۆیەتی دەتوانی بە ئارەزوی خۆی تەسەروفی تێدا بکە، جا هەروەها پێش هەموو شتێك پێویستە مرۆڤ بڕوای وابێت کە خوا (جل جلالە) خاوەنی ئەم هەموو عالەم و بوونەوەرەیە بە ئارەزووی خواهیش خۆی دەست کاری دەکات ، وە هەر ئاڵو گۆڕیەك بکات ئەوا بەپێی ئەو یاسایەیە داینــاوە بــۆی ﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴾ سوورەتی/ الرعد: ٨ ) واتە شیاوی باسە هەمووشتێکیش بەلای خواوە ئەندازەیەکی دیاری کراوی هەیە ، خوا ئەو خوایەیە ماڵ و سامان دەدات بەهەندێ وە لە هەندێکی دەسێنێتەوە ، کۆمەڵێ سەردەخات وە کۆمەڵێ دەڕوخێنێ چوونکە بەڕاستی خاوەنی هەموو شتێکە وە دەسەلآتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە هەروەکو لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ سوورەتی/ آل عمران: ٢٦) واتە : خودایە تۆ خاوەن ئەم (کائیناتەی) لە نەبوونەوە هێناوتەتە بوون کەس نییە لە وێنەی تۆ بێت وە لە دەسەلآت و مولکداریدا هاوبەش بێ

(١) هەر لەبەر گرنگی قەزاو قەدەر زۆر لە زانایان بە ڕوکنێکیان داناوە، بڕوانە تیشکی مینبەر لە نووسینی مامۆستا (محمدی شلماش)/. بەرگی/ ١/ لاپەڕە ٢٩ و بڕوانە پەرتووکی (تحفة الخطیب) لە دانانی خوالێخۆش بوو مامۆستا (عبدالله مولود پلپیتانی)لاپەڕە /٤٧٩.

لەگەڵتدا ، ئەو کەسەی بتەوێت سەروەت و سامانی پێ دەبەخشی یان سەرۆکایەتی و دەسەڵاتی پێ دەدەیت بەپێی ئەو یاساو نیزامەی کە خۆت داتمەزراندووە بۆ هەر کەسێکیش بتەوێت ماڵ و سامان یاخوود دەسەڵات و سەرۆکایەتیەکەی لێ دەسێنیتەوە هەر کەسێك خۆت بتەوێت بەڕێزو باڵا دەستی دەکەیت یاخود کەساس و زەبوون و ڕیسوای دەکەیت خودایە هەموو خێرو چاکەیەك هەر بەدەستی تۆیە، بەڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارو بەتوانایت .

جا هەروەها خوای گەورە لەبارەی قەزاو قەدەرەوە[1] ئەفەرموێت ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾ سوورەتی/ القمر: ٤٩) واتە ئێمە هەموو شتێکمان دروست کردووە بە ئەندازەیەکی زانراو، وەهەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ سوورەتی/ الصافات: ٩٦) واتە: خۆتان و کردەوەتان دروست کراوی خوایە، یان ئەفەرموێت ﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴾سوورەتی الزمر: ٦٢ واتە: بەڕاستی خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە ، هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێت (ولا يُؤمِنُ أحَدُكم حَتّى يُؤمِنَ بالقَضاءِ والقَدَرِ خيْرِه وشَرِّه) رواه أحمد، واتە باوەڕتان دانامەزرێت تا باوەڕ نەهێنن بە قەدەر چ چاکی و چ خراپی، دیسان هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (كلّ شَيء بالقَضاءِ والقَدَرِ حتّى العَجز والكيسُ) رواه الشيخان، واتە: هەموو شتێك بە بە بڕیارو ئەندازە دانانی خوایە تا تەمبەڵی و گێلی و چوستی و چالاکیش .

---

(1) جا بێ گومان بڕیاردانی خوا بە ویستی خۆی بوون یان نەبوونی شتێك بە ئەندازەیەکی دیاریکراو لە کات و شوێنێکی دیاریکراو ...هتد.).

**( سوودو قازانجی باوەڕ بە قەدەر چی یە ؟ )**

بـەڵێ وەك لای هـەموو كـەس ئاشـكرایە هـۆی چـوونە بەهەشـت و ڕەزامەنـدی خـوا چـاك و هـەوڵ و كۆشـشی مەردانەیـە چـوونكە پێویـستە باوەڕمان هەبێ هەرچی هـەبوەو هەرچـی دەبـێ لـە هـەبوونی و هـەژاری و ساغی و نەخۆشی و ژیان و مردن و زانستی و نەزانی و گەورەیی و هتد...) گشتی بەویست و بڕیاردان و زانستی خودایە .

هەروەها ئەندازەو كات و شوێنی بۆ داناوەو هیچ كەسیش نـاتوانێ ئـەم بڕیارو ئەندازەیە بگۆڕێ ئەبەدەن هەروەكو (جابری كوڕی عبدالله) (خوایان لێ ڕازی بێـت) ئەگێڕێتـەوەو دەڵێـت: (قِيـلَ يَـا رَسُـولَ الله (صـلى الله عليـه وسلم) فيم العمل اليَوم؟ أفيم جَفّتْ به الأقْـلامُ وجَـرَتْ بـهِ المَقَـاديرُ أمْ فيمَـا نَسْتَقْبلُ؟ قالَ لا بلْ فيما جَفَتْ الأقْلامُ وجَرَتْ بهِ المَقَاديرُ قَالَ ففيما العمـل؟ قَالَ كُلّ عَامِلٍ مُيَـسرٌ لِعَمَلـهِ) رواه مـسلم، واتـە: پرسـیار لـە پێغەمبـەر كـرا (ﷺ) ئایـە ئـەو كردەوانـەی ئێـستا ئەیكـەین لەمـەوپێش نووسـراوە و ئەندازەی بۆ دانراوە یان كە كردمان ئینجا ئەنوسرێ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی بەڵكو لەمـەوپێش نووسـراوە وەهـەروەها نووسـراوەكەش ووشـك بۆتـەوە ئەنـدازەش دانـراوە گوتیـان كـەوابێ كردەوەمـان بۆچـی یـە ؟ فەرمووی هەموو كەسێك بۆ كردەوەی خۆی ڕێگەی بـۆ ئاسـان ئـەكرێ جـا چاكە بێ یان خراپە .

**( ئاگادارییەك )**

خوای گەورە لـە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِّكَيْلَا تَأْسَوْا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا۟ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ سوورەتی/ الحدید:٢٢– ٢٣) واتـە : هـیچ کـارو ڕووداوێك نیە جا خـۆش بێـت یـا نـاخۆش بێـت کـە لەزەویـدا یـا لـەخۆتان ڕوودەدات پێش ئەوەی بێتە دی لە (عیلمی) خودا دیاری نەکرابێت ، هـەموو کارو ڕوداوێك هەر لە ئەزەلەوە لەلایەنی خـوداوە بڕیـاری لەسـەر دراوە کـە کەی و چۆن و بـەچ شـێوەیەك ڕوودەدات؟ بێگومـان بڕیـاردان لەسـەر ئـەو شتانە لەلایەن خوداوە کارێکی زۆر سووك و ئاسانە ، ئەمەش بزانن تاوەکو خەمبار نەبن بەوەی کـە هـەوڵ دەدەن بـۆ هەنـدێك شـت کەچـی دەسـتان ناکەوێـت و لە کیستان دەچێت ئەوەی کـە خـودا بڕیـاری لەسـەر نـەدابێت نابێـت، هــەروەها تــا زۆر دلخــۆش نــەبن بــەوەی کــە پێــی بەخـشیون دڵخۆشیەکی وا کە کەرەمی خوداتان لەبیر بباتەوەو دەسـت بکەنـە خراپـە کاری و ستەم، خوا هیچ کەسێکی خـۆ بـەزل زان و خـۆ هەڵکێـشی خـۆش ناوێت/ جا هەروەها پێویستە بـۆ هـەموو موسـڵمانێك ئـا بـەم شـێوەیە لـە مانای (قەزاو قەدەر) تێ بگات نەك خۆی هەڵسێ بە ئیشی نامەردانە وەکو (زیناو لواطە بێ ئەخلاقی .. دزی/ و جەردەیی و/ پیاو کوژی / ئینجـا بڵـێ جا من چی بکەم خوا وای نووسـیوە لـەناو چـاوم ، واتـە : وەك خـوا ڕازی بووبێت بەو کردەوەی کە ئەو کردویەتی ، کەچی قورئان پڕە لە هەڕەشە و

گوورەشە سەبارەت بە دزی و پیاو کوشتن و هتد...) ئینجا ئـا بـەم جـۆرە دەبێت بەپێی ڕای ئەوان دزی نەکەی هەر دەبێ بیشی کەی ، دەگێڕنـەوە جارێك دزێکیان گرت و هێنایان بۆلای (خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خـەتاب) (خـوا لێـی ڕازی بێـت) ئینجـا خەلیفـە/ فـەرمووی بۆچـی دزی دەکـەی؟ ووتـی بڕیـاری خوایـە/، هـەر دەبـێ دزی بکـەم/، ئینجـا خەلیفـە فەرمووی (سـی) جەڵـدەی/ لێ بـدەن دەستیـشی ببڕن وتیـان ئـەی تـەنها دەست بڕینەکـەی بـەس نیـە؟ واتـا سـی جەڵدەکـەش زیادەیـە فـەرمووی دەست بڕینەکە لـەباتی دزیەکەیـە سـی جەڵدەکـەش لـەباتی ئـەو درۆیەیـە بەدەم خواوە دەی کات کە دەڵێت بڕیاری خوایە هەر دەبێ دزی بکەم واتە ئەو کەسـانەی فـەرمانی ناشـرین دەکـەن و دەڵـێن چارەنووسـی وابـووە و بڕیاری خوایە ئەوا هەڵە دەکـەن و بەهەڵـە داچـوونە ئـەوجا بزانەحـەزرەت (ﷺ) هەڕەشەی کردووە لـەو جـۆرە کەسـانە کـە خۆیـان شـت دەکـەن و دەڵێن خوا پێی کردین (العیاذ باللە) ئینجا ئەفەرموێت (يَكُونُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ يَعْمَلُونَ المَعَاصِي ثُمَّ يَقُولُونَ اللهُ قَدَّرها عَلَيْنا / الرَّادُ عَلَيْهِمْ يومئذٍ كالشَّاهِرِ سَيْفَهُ فِي سَبِيلِ الله).واتە: پەیا ئەبن لـە دواییـدا هەنـدێ کـەس یـا گەلێك خراپەو گوناه ئەنجام دەدەن وە ئەڵێن خوا بڕیاری بۆ داین وە ئەمە چارەنووسمانە ئینجـا پێغەمبـەر (ﷺ) ئەفـەرموێت (ڕەت) دانـەوەی ئـەم جۆرە کەسانە هەروەکو شمشێرت هەڵکێشاوە لە ڕێگەی خودا دا .

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا بێگومان قەزاوقەدەر نابێ بکرێن بە بیانوی تەمەڵی و پاڵدانەوە و دەستە وەستان و/ وەستان لە یاسای ژیان و /خۆراك پەیدا کردندا وە نابێ ببن بە قاڵدرمە واتە پەیژە وەپیایانا هەڵبچێ و هەڵبەزێت بۆ تاوان و گوناهو بڵێت قەدەر وابوو دەبێت وابێت بەڵکو دەبێ قەدەر قەدەری پێ لاببەیت بڕیار وایە برسیت دەبێ بڕیاریش وایە دەبێ خواردن بخۆی تا نەمریت تینووت دەبێ ئاو بخۆرەوە ، نەخۆش دەکەویت داوو دەرمان بەکاربێنە ، هەژار دەبیت هەوڵ بدەو بزانە هۆی چی یە ؟ چارەسەری بۆ بدۆزەرەوە هتد...).

ئەگێڕنەوە کاتێ نەخۆشی (طاعون) بڵاوبۆوە لە وڵاتی شامدا خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) ئەوێی بەجێ هێشت (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح (خوا لێی ڕازی بێت) ووتی گەورەی ئیمانداران ئێمە لەبەر (قەزاو قەدەری) خوا ڕابکەین ئینجا خەلیفە فەرمووی (بەڵێ لە قەدەری خوا ڕادەکەین بۆ لای قەدەری خوا، واتە: نەخۆشی (طاعون) قەدەری خوایە دەبێ هەر هەبێت وە بڕیاریش وایە کە ڕابکەین لەشتی ئاوا خۆ بپارێزین [1].

---

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (مصباح القلوب ومفرج الكروب)، لەنووسینی (عبدالرحمن مەلا طه عبدالعزيز) بەرگی دووەم ، لاپەڕە ٧٩١.

**( ئايە ئادەميزاد سەربەخۆيە ( مخير ) ە يان ناچارە ( مسير )ە....؟ )**

جا بێگومان ئەو (مەسەلەيە) قسەو باسی لەسەر زۆرە ، زۆر لە مێژەوە تاكو ئێستا لەسەر زاری زاناو نەزان دايە ،ئەوجا هەموو خەڵكەكە لە ئەنجاميشدا بوون بە دوو دەستە لەم مەسەلەيەدا و هەندێكيان دەڵێن ئادەمی (مسيرە) واتە بێ نيازوناچارە لە ئيشو كارو كرداريا ، دەستەی دووەميش دەڵێن ئادەمی (مخيرە) واتە خاوەن ڕايەو سەربەخۆيە بۆ دياری كردنی پاشەڕۆژی خۆی، ئەم دوو ڕايە هەيە لەم (مەسەلە) و باسەدا بەلاّم (حەقيقەت) و ڕاستيەكەی ئەوەيە وا دەينوسين بەم شێوەيە، جا بێگومان ئيسلام بەلايەوە وايە كە ئادەميزاد كاتێ دروست كراوە بەهەموو توانەيەوە دروستكراوە واتە بۆی ئەو هێزە لە ئيشی چاكە بەكاربێنێ، وە بۆی هەيە لە خراپەكاريدا بەكاری بهێنێ كەواتە بۆهەردوو بارەكە دەست دەدات وەچۆن هەڵدەسوڕێنی ئارەزووی خۆيەتی بێجگە لەمەش خوای گەورە (جل جلالە) ئادەميزادی چەكدار كردووە بە ئەقڵ وژيری تا هەق و ناهەق لەيەك جيا كاتەوە بۆ ئەوەی چاك و خراپە جوودا بكاتەوە، ئەم هێزەی داوەتیٚ تا حەق بچەسپێنێ و ناهەق ڕاونێ هەروەها چاكە بكات و خراپە نەكات ڕاستی بڵێ و خۆی بپارێزێ لە درۆو دەلەسەو هەروەها جگە لەمەش لەپاڵ ئەمەش بەرنامەی بۆ ناردن بە پێغەمبەراندا كەوابوو ئادەميزادلەپاڵ ئەم ئەقڵ و ژيريەدا سەربەستە لە ئيرادەو خواهيشا، وە لە هەڵبژاردنی كردار وەك خوای گەورە لە قورئانی پيرۆز دا ئەم ڕاستيە ڕوون دەكاتەوە ﴿ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ سووررەتی/ الإنسان: ٣) واتە ئادەميزادمان ئاگادار كردووە لەڕێگەی چاك و خراپ جيا

ئینجا دوای ئەوە ئەگەر ڕێگە حەق و ڕاستی بگرێ ئەوا بەختیار دەبێت خۆ ئەگەر بە ڕێگای لارو چەوت ڕۆیشت ئەوا بەدبەخت و گومڕایە : ﴿ وَهَدَيْنَهُ ٱلنَّجْدَيْنِ ﴾ سوورەتی/البلد: ١٠) ئاماژە هەر بەم مەبەستە دەكات .

## ( چەند ئاگادارییەكی گرنگ )

خوای گەورە لەم ئایەتە ئەفەرموێت ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾ سوورەتی/ محمد: ١٧ )بەڵێ ئەو كەسە ڕێی ڕاست بگرێ جیهادوتێكۆشانی ببێ لەبەر خاتری خوا خواش ڕووی سۆزو كەرەمی تێدەكات وە بەرەوبەهەشت دەیبات، هەر كەسێكیش لە ڕێی ڕاست لابدات و دوای كوێرە ڕێگاكان بكەوێ و بەرەو خراپە مل بنێت خواش یارمەتی نادات و گومرای دەكات، هەروەكو قورئان ئەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴾سوورەتی/ الصف: ٥) وە بەڕاستی خواش ڕێنوێنی خەڵكی لە سنوور دەرچوو نافەرمان ناكات چوونكە ئامادەیی تیانییە بۆ ڕێنوێنی، جا بێگومان ئاگاداربە لە قورئانی پیرۆزدا زۆر جار ئەدرێ بە گكوێی ئادەمیزاد كە ئەگەر خوا ئارەزوو بكات خەڵكی هەموو دەخاتە سەر ڕێگای (هیدایەت) وبەختیاری، وە ئەگەر مەیل بكات هەموو ئادەمی دەكاتە برای یەك و گۆی زەوی كێشەی تێدا نامێنێ لەسەر یەك بەرنامە كۆدەبنەوە ئینجا فەرموو تۆو ئەو كۆمەڵە ئایەتانەو هەندێك لە تەفسیرو ڕاڤەكانیان:

١) هەروەها لە سورەتی (السجدە) دا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا

كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾سووره‌تی/ السجدة: ١٣) واته ئه‌گه‌ر بمانه‌وێ ئاده‌می به‌تێکرا به‌ره‌و به‌ختیاری وهیدایه‌ت ببه‌ین هێزی هه‌ڵبـژاردن و ئیختیـارو ده‌سـه‌لاتی که‌سب و کرده‌وه‌ی لێ ده‌سێنین ئیتر ئه‌و کاته ئاده‌می زۆر لێکراوو ناچـاره له‌سه‌ر کرده‌وه، واته: سه‌ربه‌ستی و ئیختیار نامێنێ، وه ئه‌گه‌ر ئاوا بکـه‌ین دیاره هه‌موو که‌سێك به‌ختـه‌وه‌ر ده‌بێت و له‌سـه‌ر ڕێگـه‌ی ڕاست هـه‌نگاو هه‌ڵده‌گرێ نه‌ك بـه‌زۆر ئینجـا لـه ئه‌نجامـدا بڕیرمانـدا به‌سه‌ر زاڵمـان و مـل هوڕاندا له ئاده‌می و په‌ری بۆ ناو دۆزه‌خ به‌هۆی کرده‌وه‌ی خۆیانه‌وه.

٢) جا هه‌روه‌ها له سوره‌تی (یونسیشدا) ئایه‌تی/ ٩٩) دا خـوای گـه‌وره ئه‌فـه‌رموێت ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ ﴾ سـووره‌تی/ یـونس: ٩٩) واتـه: بـه‌و مانایه‌ی ئه‌گه‌ر په‌روه‌ردگاری تۆ ئه‌ی (محمد) بی ویستبایه هێزو ده‌سـه‌لات لـه ئـاده‌می و پـه‌ری بـسێنێ وه ڕایـان بیێنـێ له‌سـه‌ر خواناسـی ئه‌گـه‌ر ئاره‌زووی بوایه لێی ده‌سه‌ندنه‌وه ئه‌وکاته هه‌موو باوه‌ڕی ده‌هێنا ، چوونکه ویستی خوا وابوو ، کێ ده‌توانێ پێچه‌وانه‌ی بجولێته‌وه ؟!.. بـه‌لام خـوای گه‌وره ویستی وانه‌بوو به‌ڵکو ئیختیاری دانـێ بـۆ دیـاریکردنی چاره‌نووسـی خۆیان .

٣) دیسان خوای گه‌وره له ئایه‌تێکی تـرا ئه‌فـه‌رموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةًۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴾ سووره‌تی/ هود: ١١٨) واتـه: ئه‌گه‌ر په‌روه‌ردگارت بیویستبایه خـه‌ڵکی بکاتـه یـه‌ك ده‌یکردنـه یـه‌ك بـه‌م

شێوەیە دای دەماڵین لە هێزی کردو کۆشش و ئیختیار بەڵام ویستی وایەو ئیختیاری پێ دان و سەربەستی کردن، ئینجا ئەوانیش بوون بە چەند گەلێکی جیاواز چوونکە (ئیختیاری) هەر مرۆڤێك جۆرێکە کەواتە بێگومان ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ﴾ بەدرێژایی ڕۆژگار ئادەمییەکان کێشەو جیاوازییان دەبێ[1].

**(باسێك لە بڕیارەکانی خوا چوونکە بێگومان هەمووی هەر خێرو چاکن)**

بەڵێ خوای گەورە داناو بینایە دیارە دەبێ ئیشەکانیشی پڕ بن لە (حیکمەت) و لە فەڕو بەرەکەت چوونکە بێگومان ئیش وکاری خوا هەمووی زۆر جوان و ڕێك و پێکن ، چوونکە بزانە هەموو ئیش وکارێکی لەجێگای خۆیەتی هەربڕیارێکی بدا هەموویان خێرو چاکن بۆ (مەسلەحەتی) ئادەمیزادە بەڵام هەندێ کات ئەم بڕیارە لای هەندێك کەس بە خراپ و ناپەسەند دادەنرێت.

خۆ ئەگەر بە چاوی ووردو ویژادنەوە تەماشای بکرێ دەر ئەکەوێ کە ئەو بڕیارە لەخۆیا چاکە تەنها لە چاوی کورت بینی ئەم دا خراپ و ناهەموارە وە یاخود لە گەڵ ئارەزووی ئەودا ناگونجێت، خراپە تەنها لە ئادەمییەوە دەوەشێتەوە، ئەویش لە کاتێکا سەرپێچی لە فەرمانەکانی خواو بڕیارەکانی بکات، کاتێ خوا ئادەمی سەربەست کرد بۆ دیاری کردنی چارەنووسی خۆی ئینجا خستیە ژێر تاقیکردنەوەوە بۆ هەڵبژاردنی ژیانی خۆی و نەبڕاوەی بەهۆی خۆپەرسیەوە ئاشکرایە چەندەها شتی ڕەنگاو

---

(1) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، لەگەڵ دەستکاری .

ڕەنگ لە خۆشی و ناخۆشی دێتە بەر ڕێگەی تا سوپاسگوزاری خۆی ئاڕاستەی بارەگای خوا بکات لەو شتانەدا پێی خۆشن وە تا ئارام بگرێ لەوانەیاندا پێی ناخۆشن، ئەو خۆشی و ڕابواردنە خەڵکی پێی دەڵێن چاکە.

وە ئەگەر گیرو گرفت و کێشەیەك دێتە بەردەم مرۆڤ لێکی دەدەنەوە بە خراپە.

بەڵام لەو شتانەدا دەستی ئێوەی تێدانیە ئەوە لە ڕاستیدا دەستی نهێنی پڕ لە (حیکمەتی) خوای تێدایە، وە لە ناوەوە پڕە لە خێرو چاکە با ئێستاش وا نیشان نەدات ئەم ئادەمیە بە خراپ و ناهەمواری دابنێت هەروەك نەخۆشێکی سادە نارەزایی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بەچارەسەرو ئەو عەمەلیاتانەی پزیشك بۆی دەکات لە کاتێکدا کە هەست دەکات بەئێشو ئازار یا منالێ وەڕسی خۆی دەردەبڕێ. لەپەندو ئامۆژگاری پەوەردگار دەیکات یاوەك (قوتابیەك) کە ئاشنابێت بەزانیاری نارەزایی خۆ دەردەبڕێ سەبارەت بەو پرۆگرامەی بڕیاری خوێندنی بۆ دەدرێت، وە هەروەها ئەو تاقیکردنەوەی کە مامۆستا دڵسۆزەکەی دەیکات ئەو قوتابیە بە خیانەتی دادەنێت جا هەروەها زانای بەناوبانگ (إبن قدامە) ی مەقدیسی لە پەرتوکی (مختصری منهاج القاصدین) دا[1] لە زاری بەڕێز (سەعیدی کوڕی موسەیەب) دا کە یەکێکە لە (تابعین)ە گەورەکان. ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێت (جارێکیان لوقمانی حەکیم (سەلامی خوای لێبێت) ئامۆژگاری کوڕەکەی خۆی دەکردو پێی ووت: (یابُنيَّ لا یَنْزَلَنَ بِكَ

---

(١) بڕوانە پەرتوکی (مختصر منهاج القاصدين) دانراوی (الشيخ أحمد بن عبالرحمن بن قدامه المقدسي) لاپەڕە/ ٤٤٨، چاپی یەکەم ، عەمان ، ئوردن.

أمْرٌ رضَيْتَهُ أو كَرِهْتَهُ إلاّ جَعَلتَ في الضَمِيرِ انّ ذلِكَ خَيرٌ لَكَ) واتـه ڕۆڵەکـەم هەرچی هاتە ڕێگەت لەلایەن خوای گەورە هەر کارو فەرمانێك بێـت ، پێـت خۆش بێت و ناخۆش نەبێت بێ سلّەمینی بە (عـەقڵ) و ژیـری خـۆت کـەوا خێری پێوەیە و بۆت باشە یا کوڕەکەم هەرچی هاتە ڕێگەت بزانە کە تاقی کردنەوەیە کە مامۆستا دڵسۆزەکەی دەیکات (بـە کزیکـاریی و خیانـەتی) بۆت لەوی تۆ خۆت بەچاکی دادەنێیت، کوڕەکەی ووتی ناتوانم وابم تا خۆم هەڵی نەسەنگێنم ئینجا لوقمانی حەکیم ووتی: (يابُنيَّ فإنّ الله قَدْ بَعَثَ نَبياً هَلَمَ حتى نأتيهُ فَعنْدَهُ بَيَان مَا قُلْتُ لَكَ) واتـه: کـوڕم خـوا پێغەمبـەرێکی ناردووە با بڕۆین بۆلای تا بۆمان ڕۆشن بکاتەوە کە ئـەمن ئـەوەی دەیڵـێم بۆتۆ ڕاست و تەواوە.

(قَالَ إذهَبْ بِنَا فَخَرَجَ عَلى حِمارٍ وابْنهُ عَلَى حِمارٍ وتَـزَودا مـا يُـصَلِحهُما) ئەفەرموێت هەردووکیان ڕێك کەوتن و هەریەکەیان سواری گوێدرێژێك بوون تێشوویان و خواردنیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت بۆ ڕێگاو چەند شەوو ڕۆژێـك ڕۆیشتن زۆر ماندوو بـوون ئینجا چـوونە ئەشـکەوتێك حەسـانەوە، دیـسان ڕێگەیان دایە بەر گەرما زۆری بـۆ هێنـان و ئـاوو تێـشویان پـێ نـەما گـوێ درێژەکەشیان لەپێ کەوت ئینجا ناچار دابەزین و بەپێ ڕێگەیان گرتـە بـەر (فَبَيْنَما كَذَلك إذْ نَظَرَ لُقْمان أمَامَـهُ فـإذا هُـوَ بِـسَوادٍ ودُخَـان فَقَـالَ في نَفْسه الـسواد شَـجرٌ والـدّخان عُمْـرانٌ ونَـاسٌ) جـا هـەروها لـەم لوقامـانی حـەکیم دووکەڵ و ڕۆشنایيەکی لە دەرەوە بەرچاو کـەوت و ئینجـا لـە دڵـی خۆیـدا فەرمووی ڕەشاتیەکە دارو درەختە دووکەڵەکەش ئاوەدانی و خەڵك و مـەڕو ماڵاتە ، (فَبَيْنَمَا هُما كَـذَلك يَـشْهَدان إذْ وَطـيء إبـنُ لُقْمـان عَلَـى عَظْـمٍ عَلَـى

الطَريق فَدَخَلَ فِي بَطْنِ قَدَمِهِ حَتّى ظَهَرَ مِنْ أعَلاهـا فَخَرّ مَغْشِياً عَلَيـه)واتـه کتوپڕ ئێسقانێك چوو بە قاچی کوڕەکەداو لەسەر پشتی پێیەوە دەرهات و بێ هۆش کەوت، (وإسْتَخْرجَ العَظْمُ بأسْنَانِهِ وَشَقَ عَمَامةً كَانَتْ عَلَيْـهِ فَعَصَبَ رِجْلَهُ) واتە ئینجا لوقمانی حەکیم کە تەماتشای کرد پەلاماری برد بۆ کوڕەکەی و بە ددان ئێسقانەکەی دەرهێناو ئینجا بە مەندیلەکەی سەری کردە دوو لەت و لەتێکی لە برینەکەی بەستاو ئینجا ئەندازەیەك بۆی بێ تاقەت بوو، وە هەروەها باوکە زۆر بۆی پەرۆش بوو ئینجا لە داخان چەند فرمێسکێك لە چاوی کەوتنە خوارەوە کەوتنە سەر گۆنای کوڕەکە ئەوجا کوڕەکە هاتەوە سەر هۆشی خۆی و بەخۆی هاتەوە، ئینجا ڕووی کردە باوکی و ووتی: (فقال يا أبَتِ أنْتَ تبْكِي وأنْتَ تَقُول هَذا خَيْرُ لِيّ فَكَيْفَ ذلكَ وأنت تبكي ؟) وقَدْ نَفَذَ الطَعامُ والشّرابُ وبَقيتُ أنّا وأنْتَ فِي هـذا المَكان)، بابە تۆ دەڵێی ئەمە باشترە بۆت کەچی خۆشت دەگریت ئاخر پێم ناڵێی ئەم ڕووداوە باشیەکەی کامەیە؟ پێم ئاوای بەسەرهات و ئاوو خۆراکیشمان پێ نەماوە و هەمومان خواردو گوێ دریژەکەشمان لەناو چوون (وأمّا قَوُلُكَ فَكَيْفَ يَكُون هذا خَيرٌ لي " فَعَل مَا صَرفَ عَنْكَ أعْظَمَ ممّا ابتليت بِهِ ولَعَلّ ما ابتليت بهِ أيْسَر ممّا صَرفَ عَنْكَ)، واتە لوقمانی حەکیم لە وەڵامدا ووتی ڕۆڵە وا دەزانم ئەوەی لێت لادراوە بە هۆی ئەم ڕووداوەوە زۆر گەورەترە لەم کارەساتە (ئەم موسیبەتەی بەسەرمان هات ئەوا بەر شتێکی زۆر گەورە کەوتووە) ئەوجا ئەوان لەو ووتووێژە دابوون (لوقمانی حەکیم (سەلامی خوای لێبێت) کە تەماشای بەردەمی خۆی کرد نە دووکەڵ دیاربوو نە تەرمایی ئینجا کەوتە گومانەوە بڵێی هیچم بەرچاو نەکەوتبێت

نەخێر بێگومان دووکەڵ و ڕۆشناییم بەرچاو کەوت، بەڵام وا دەردەکوێت خودای بەدەسەلآت کارێکی کردووە ئینجا لەو ووتووێژە دابوون (إذْ نَظَرَ فإذا هو بشخص قد أقْبَل علَى فُرْسٍ أبلق عَلَيْه ثِياب بَيْض يَمْسَح الهَواءَ مَسْحاً) واتە: ئیتر/ کت و پڕ/ئەسپ سوارێك پەیدابوو لە هەوا تیژ تر بوو بەرگێکی سپی لەبەربوو هەوری شەق ئەکرد بە دەستەکانی ئینجا بەدەنگێکی زۆر بە سام لە حەزرەتی لوقمانی خوڕی بەسەریاو ووتی (فَقَالَ أنْتَ لُقْمان؟ قَالَ نَعْم قَالَ مَا قَالَ لَكَ إبْنك السَفيه) واتە تۆ لوقمانی؟ ووتی بەڵی ووتی ئەو کوڕە بێ ئەقڵ و ناتێگەیشتووە ئەوە چی ئە لێ وە چی ووتوە؟ (قَالَ أنا جبريلُ لا يَرَاني إلاّ مَلك مقَرّب أو نَبّي مُرسَلٌ لَوْلا ذلك لَرَأيتني) واتە ووتی: من (جوبەرەئیلم) مەگەر فریشتەیەك لە بارەگای خوادا نزیك بێت من ببینێت یا پێغەمبەرێکی (مورسل) بم بینێت بۆیە نام بینیت ، ئاگات لێ بوو کوڕەکەت چی ووت؟ وا دەزانی ئەو هەرچی (حیکمەتەکەی) نەزانی ئیتر لە خۆیەوە پەیدابووە بێ هوودە با وا نەزانێ ئینجا فەرمووی (وقَدْ أمَرَني رَبّي تَعالي بِخَسْفِ هذه المَدينة ومَا فيها ومَنْ يَليها فأخْبِروُني إنَّكُما تُريدان هذه المَدينة فَدَعَوتُ رَبِّي أنْ يَحبِسُكُمَا عَني بما شاءَ فحَبَسَكُمَا عَني بِمَا إبْتلى بهِ إبنك ولولا ذلك لَخُسِف بكما مع من خسف بهِ) واتە بەڕاستی خوای گەورە فەرمانی پێکردم بە خەسف واتە سەرنگوم کردنی ئەو شارەی کە ئێوە بۆی دەڕۆن ئینجا منیش داوام کرد لە خوای گەورە ئەندازەیەك ئێوە ڕاگیر بکات، تا من هەڵدەستم بە کارەکەی خۆم، نەوەك ئێوەش لەگەڵ ئەوانا تیا بچن، ئەوەبو خودا بەم شێوەیە مەتەڵی کردن ئەگەر دوانەکەوتنایە ئێوەش تیا دەچوون (ثُم مَسَحَ جِبْريل (عليه

السلام) بِيَده علَى قَدَمِ الغُلام فأسْتَوى قائماً ومسحَ يَدَهُ علَى الذّي كَانَ فِيه طَعَاماً ومَسَحَ علَى الذّي كَانَ فِيهِ مَاءٌ فامتلأ ثم حَمَلَهُمَا وحِمَارَيْهُمَا فَرَحَل بِهُمَا كَمَا يَرْحَلُ الطَّير فإذا هُما في الدّار التّي خَرَجَا مِنْهَا بَعْدَ أيام ولَيالي) ، واته بێگومان ئینجا حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای گەورەی لێبێت) دەستی پیرۆزی بە قاچی کورەکەی (لوقمانی حەکیم) داهێنا ئینجا خوا (شیفای) بۆ نارد هەروەها ئاوو خۆراکەکەشیان وەك خۆی لێ هاتەوە، دوای ئەوە بەو هێزەی کە خوای گەورە دابوویە حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) هەموویانی هەڵگرت و دەست بەجێ گەیاندیەوە شوێنەکەی خۆیان)...

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان کەوا بوو بڕیارەکانی خوا هەر هەموویان خێرو چاکەن بابە دیمەن و ڕواڵەتیش وانەبن ، خوێندەوارانی ئازیزم ، کاتێ باسی (قەزاو قەدەر) دەکەین ئەم مەبەستانەمان بۆ ڕون دەبێتەوە :

یەکەم) تاقیکردنەوە چوونکە وادەبێت بڕیاری خوا وا داوە دەکات کە تاقیکردنەوەکە بە ڕۆژی و خۆش گوزەرانی بێت واش دەبێت بە گوێەو کێشە بێت کە ئەمەش لەم ئایەتەدا بەدی ئەکرێت وەك ئەفەرموێت ﴿ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ سوورەتی/الأنبیاء: ٣٥) واتە: تاقیتان دەکەینەوە بەو شتانەی ئێوە بە خراپی دادەنێن یا بەچاکی دادەنێن وەهەروەها لە گەڕانەوەشتان بلای ئێمە دێنەوە ، جا هەروەها

خـــوای گـــەورە لـــەم ئایەتەشـــدا ئەفـــەرموێت ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ﴾سـوورەتی/ البقـرة: ٢٨٦) واتـە: بەڕاسـتی پاداشـتی بەدەسـت هێنانی چاکە بۆخۆیەتی و سزای وەدەست هێنانی خراپە لەسەر خۆیەتی)، کەواتە ڕوون و ئاشکرایە ئەگەر کەسێك لەسەربان بکەوێتە خـوارەوە ئـەوا دیارە هیچ بە ویوست و دەسەلاتی خۆی نیەو گشتی لـە دەسـەلاتی خـوای گەورەدایە بەلاَم ئەگەر بۆخۆی خۆی فڕێبداتە خوارەوە ئـەوە دیـارە لـەم کارەدا سەربەخۆیە بە ویست و دەسەلاتی خۆی خۆی فڕێداوە کەوابوو لەم دوو بەشـەدا بۆمـان دەرکـەوت کـە خـوای گـەورە ویـست و توانایـەکی لـە بەندەدا درووسـت کـردووە بـۆ وەدەسـت هێنـانی کردەوەکـانی، هـەروەها بەندەی خۆی کردۆتە سەرپشك بۆ کردن و نـەکردنی چـاکەو خراپـە ، ئـەم شەرپشکیە پێـی ئـەگوترێ (اختیـار) واتـە سـەربەخۆیی و زۆر لێ نـەکرد، هەروەك لە پێشەوە ئامارەمان بۆ کرد.

خوای گەورە پاداشتی ئەو کەسە بداتەو کە فەرموویەتی :

پێش بوونی آدم هەرچی ڕوویداوە — دوای بوونی ئەویش تا دونیا ماوە
ژیان و مردن ساغی و نەخۆشی — بوونی و هەژاری و غەمناکی و خۆشی
هەمووی بە ویست و زانستی خوایە — بەسەر هاتی تۆ تەواو نووسرایە
بەلاَم پێویستە هەر هەولْ بدەی — لەبەر چارەنووس تەمبەڵی نەکەی
بە گوێرەی توانا بکێشە زەحمەت — تا سەرکەوتوو بی لە دونیاو قیامەت(١)

---

(١) بڕوانە/ عەقیدەی ئیسلامی/ لەسەر ڕارەوی (ئەهلی سوننەو جەماعە) لە دانای مامۆستا (مەلا عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی) لاپەرە ٥٦.

أخي المؤمن عَلمت منْ هَذه الخُطْبةَ أنّ أركان إيمانكَ (ستّةٌ) فآمنْ بأرْكانِ إيمانكَ ليَغْفِر اللهُ لَكَ نَبهَني اللهُ وإيَاكُم مـنْ نَومـة الغـافلينْ/ وَحَـشرَني وإيّـاكُمْ تَحْتَ لواءِ سيّد المُرْسَلينْ /وَبَعْدُ أعوُذُ باللهِ مـن الـشّيْطانِ الـرّجيَم/ مـنْ عَمَـلَ صالحاً فَلِنَفسهِ وَمَنْ أسَـاءَ فَعَلَيْهـا ومـا رَبَـكَ بَظـلاّمٍ للعَبيـد (اللّهُـمَ اغفـر لَنـا آمين).

# ئامۆژگاری پەنجاو پێنج

## باسی ئەو ڕۆژە ئەکاو کەس نازانێ کەی قیامەت دێ غەیری خودا نەبێ

الحمدُ لله رَبّ العَالَمين والعاقبةُ للْمُتقّين والنَدامَةُ للْغافلين وأشْهَدُ أنْ لا إلـه إلاّ الله وحْدَهُ لا شَرِيك لَهُ وأشهدُ أنّ مُحَمداً عَبْدُهُ وَرَسُولهُ، والـصّلاة والـسّلام عَليهِ وعلى آلهِ وأصْحابهِ المُجاهدين إلى يَوْمِ الدّين (أمّا بَعْد أيّهـا المُـسْلمون إتَقُوا الله فإن التّقوى شِعَارُ المُؤمنِينْ ودثـارُ المُـتّقِينْ) واتـە: لـەپاش هەنـدێ ئـەی بـرا موسـڵمانەکان تـەقوای خـوا بکـەن چـوونکە تـەوقوا (شـیعاری) ئیماندارانە وە بەرگ و پۆشاکی لەخوا ترسانە و...هتد).

(ڕیوایەت) کراوە هاوبەشدانەرکان ووتیان، ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگـەر ڕاست دەکەی تـۆ پێغەمبـەری خوایت دەسا پێمـان بڵـێ ڕۆژی (قیامـەت) کـەی دێـت؟ جـا خـوا ئـەم ئایەتـەی دابەزانـدوو فـەرمووی ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ﴾ سوورەتی الأعراف/ ١٨٧) واتە لـە بـارەی ڕۆژی قیامەتـەوە لێـت دەپرسـن﴿ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾ واتـە: کـەی ڕوو دەداو دێتـە دی؟) ﴿ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ﴾واتە: پێیان بڵێ تەنها پەروەردگارم دەزانێ کەی دێت ﴿ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ﴾ئەو نەبێ هیچ کەس ناتوانێ لە وەختی خۆیدا بیخاتـە ڕوو و دیـاری بکـا ﴿ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾واتـە: هـەڵهێنان و زانینـی هاتنی کاتی قیامەت بۆ گشت ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەویـدان قـورس و

سەختە ﴿ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ﴾واتە هەر کت و پڕێك بۆتان دێت ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا ﴾واتە بەجۆرێك لەتۆ ئەپرسن ئەی مُحَمد (ﷺ) وەك تۆ لە زانینی هاتنەکەی پسپۆڕ بیت ﴿ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: تۆش بڵێ هەر خوا خۆی دەیزانی هیچ کەسی تر نایزانێ ئیتر ئەوانیش با ئەوەندە لەسەری نەڕۆن ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف/ ١٨٧) واتە بەڵام زۆربەی ئەم خەڵکە ڕاستیەکان نازانن، جا هەروەها لە (سورەتی) لوقماندا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾ واتە بەڕاستی زانیاری هاتنی ڕۆژی (قیامەت) تەنها لەلای خودایە جگە لەو کەسێ تر نازانێ قیامەت کەی دێ ﴿ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ ﴾ واتە : وە تەنها ئەویش باران دەبارێنێت لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا کەسێکی تر ناتوانێ باران ببارێنێ ﴿ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْأَرْحَامِ ﴾واتە : وەئەویش دەزانێ چی لە منداڵدانەکاندایە واتە هەر لەو کاتەوە کە ئاوەکە ئەمەیی و خۆی دەزانێ چیە کوڕە یا کچ بەختیارو سەرفرازە هتد...) ﴿ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ﴾واتە هیچ کەسێك نە چاکەکارو نە خراپەکار سەد لە سەد نازانێ سبەینێ چی دەکا لە چاکەو خراپە ﴿ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ﴾ واتە : هیچ کەسیش نازانێ لە کان سەر زەوی ئەمرێ واتە کام

جێگا دەبێتە گۆڕو ئارامگەی هەرچەندە لەوانەشە هەولیش درابێ بۆ زانینی ئەمە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ چوونکە بەڕاستی هەر خوایە زاناو بە تەواوی بەئاگایە بە تەواوی ڕووداوەکان و گشت نهێنی و ئاشکرایەکیشی لا یەکسانە جا هەروەها خوای گەورە لەم ئایەتەشدا ئەفەرموێت ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ﴾سوورەتی/ الأنعام: ٥٩ ) واتە: کلیلی گشت گەنجینەکانی (غەیب) تەنها لای خودایە تەنها هەر ئەویش پێیان دەزانێت وە تەواوی کارە نادیارەکان لەلای ئەو ئاشکراو دیارن.

**( ئاگادارییەکی گرنگ )**

(روى الامام البخاري في صحيحه (في خَمْسٍ لاَ يعلمُهنَ إلاّ الله، ثُمَ تَلاَ النَّبي (صلّى الله عليه وسلم) ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ سوورەتی/ لقمان: ٣٤ ) واتە: پێشەوا بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە پەرتوکە صحیحەکەیدا/ ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت پێنج شت هەن کەس نایزانێت جگە لە خوا ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾ واتە: لە ڕاستیدا هەر خوا کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت دازانێت هەر ئەویش باران دەبارێنێت هەر ئەویش دەزانێت چی لە منداڵدان دا هەیە هیچ کەس نازانێت سبەینێ چی دەکات هیچ کەسێك نازانێت لە چ خاکێکدا دەمرێت، لە ڕاستیدا خوا زاناو شارەزایە، جا هەروەها بێگومان (ئیمامی بوخاری و پێشەوا ئەحمەد) ئەم فەرموودەیە دێنن کە خاتووو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ (مَنْ زعَمَ أنّ رَسُول الله (ﷺ) خَبيرٌ بِما يَكُونَ في الغَدِ فَقَد أعْظَمَ

عَلَــى الله الفريّــة، والله يَقُــولُ: ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾سـوورەتی/ النمـل/٦٥) أخرجـه مـسلم بـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) بـە ڕاشكاوی دەبێ بە هەموو بەشەر واتە مرۆڤ بڵێ مـن هـیچ كـارێكی غـەیب و نادیار نازانم بۆیە خـوا فـەرمانی پێدەكات بڵـێ ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ ﴾ سوورەتی/ الأنعام/ ٥٠ ) واتە پێیان بڵـێ خـۆ من بە ئێوە ناڵێم كلیلداری گەنجینەكانی خوام تا هەرچیم لێ بخوازن بتوانم جێ بەجێ ی بكەم ﴿ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ ﴾ واتە : ناشڵێم لە گشت (غەیب) و نادیارێك دەزانم هەتا ئاگاداری هەموو شتێك بم[1].

جـا بێگومـان ئـەم ئایەتانـەی پێـشوو كـە خـستمانە بەرچـاو لەگـەڵ فەموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) تێمان دەگەیەنن كـە تەنانـەت پێغەمبـەریش هیچ زانیاریەكی لەو بارەوە نییە وە نەیزانیوە كەی (قیامەت) دێت و مەگەر هەندێ (عەلامەت) و نیشانەی باس كردووە لە ئاخری زەمان پەیدا ئەبن كە ئەبێتـە دەڵیـل و بەڵگـە كـە (قیامــەت) نزیـك ئەبێتـەوە، بـەڵێ بەڵگـەو نیشانەكانی قیامەت (دوو بەشن) بەشی یەكـەم/ نیـشانە بـچووكەكان/ جـا هـەروەها نیـشانە بـچووكەكانیش بـە كـورتی ئەمانـە هەنـدێكیانن هـاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بە پێغەمبەریەتی و كۆتـای (وەحـی) واتـە نیگـاو پـەیامی ئاسمــانی و وەفــاتی و داخــستنی دەرگــای پێغەمبــەرەیاتی وەك خــۆی فەرموویـەتی (بُعِثْـتُ انـا والـسّاعَةَ كَهَـاتَیْن) رواه الـشیخان، واتـە پـەنجـەی

---

(١) بڕوانە: تەفسیری (ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان) ، لە نووسینی خوالێخۆش بوو مامۆستا (مەلا ئەحمەد كاكە مەحمود) لاپەڕە/ ٢٣٧).

ناوەڕاست و پەنجەی شەهادەی ئاماژە پێکردو مـن ڕەوانـە کـراوم لەگـەڵ قیامەتدا ئاوەها، واتا پێکەوەین، جا بێگومان بەڕاستی وەفـاتی پێغەمبـەر (ﷺ) کارەسـاتێکی گـەورە بـوو بـۆ میللـەتی ئیسلام چـوونکە یەکـەم نەهامەتیە کە بەسە ر ئوممەتی ئیسلامدا هات وەفاتی پێغەمبەرەکەی بـوو (صلی الله علیه وسلم) وە یەکەم دەرگای ناکۆکی بە وەفاتی ئـەو کرایـەوە لە نێوان (مهاجرین و ئەنصار)دا خوایان لێ ڕازی بێت کاتێـك ئەنـصارەکان وتیان (منا أميرٌ ومنْكُم أمير) رواه النسائی/ وأبو يعلـی/ والحـاكم / واتـە بـا ئەمیرێکمان هەبێت و ئێوەش ئەمیرێك، وە هەروەها وەفاتی ئەویش بوو کە ژمارەیەك لە هۆزو خێڵە عەرەبەکان کـە هێـشتا ئیمانیـان بەتـەواوەتی لـە دڵیاندا نەچەسپیبوو بە فرسەتیان زانی و لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە هـەر بۆیەش پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی خۆی کردووە بـە یـەکێك لـە نیـشانەکانی ئاخر زەمان و یەکەم فیتنە کە ڕوو بـەڕووی موسـڵمانان دەبێتـەوە ئـەوەتا لەو فەرموودەیەی کە (عوف کوڕی مالك) ڕەزای خوای لێبێـت دەگێڕێتـەوەو دەڵێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (أُعْدُدْ ستاً بَيْنَ يَدي السّاعَةَ مَوْتي) رواه البخاري، واتە شەش ڕووداو بژمێرە لە پێش هاتنی قیامەتـدا و یـەکێ لەوانە مردنی مـن، لـەو فەرمودەیـەوە دەردەکـەوێت کـە پێغەمبـەر (ﷺ) وەفاتی خۆی کردووە بە یەکـەمین نیشانەکانی قیامـەت و سـەرەتای ئـەو ڕووداوانـەی کـە لـەپێش هـاتنی قیامەتـدا ڕوو دەدەن، هـەروەها ئەنەسـی کوڕی ماڵیکیش (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێت: (لمّا كانَ اليَوم الذّي دَخَل فيهِ رَسُول الله (ﷺ) المَدينَةَ اضَاءَ منْها كُلّ شَيء فَلَمّا كَانَ اليومُ الذّي مَاتَ فيهِ أظْلَم منْها كُلّ شَيءٍ ولمّا نَفَضْنا عَنْ رَسُول الله (ﷺ) الأيدي وانا لفي دَفْنـه حَتى أنكرنا قلُوبنا) رواه الترمـذي/ واتـە ئـەو ڕۆژەی کـە پێغەمبـەر (ﷺ)

هاته شاری مەدینـە وە هـەموو شـتێك لـەم شـارە ڕووناك بـووەوە وە لـەو ڕۆژەشدا کە تیایدا وەفاتی کرد هـەموو شـتێك لـەو شـارەدا تاریـك بـوو وە هێشتا دەستمان لە خۆڵی ناشتنی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵنەگرتبوو هـەروەها خـەریکی بـەخاك سـپاردنی و (دەفنـی) بـووین ڕقمـان لـە دڵـی خۆمـان دەبووەوە کە ئەمەش ناڕەحەتیەکی زۆر بوو بۆ ئێمە کـە پێغەمبـەر (ﷺ)ماڵئاوایی کردین بەڕێزترین پێغەمبـەر (ﷺ) تووشـیان بـوو بۆیـە (ڕقیـان) لـەخۆیان بوەتـەوە لـە خەفـەت بـاری و بـێ تاقەتیـدا چـوونکە هاوەڵـە خۆشەویستەکەیان کۆچی کردو ئیتر (وەحی) نایەت و کۆتایی هات.

## (سەرنجێکی گرنگ)

جا هەروەها (حەدیسە) دوورو درێژەکەی (جِبْريل يَسْأَلُ وَالنَّبِي (صـلى الله عليه وسلم) يُجيبُ)[1] دا واتە جوبرەئیل پرسیاری لێ ئەکاو حەرزەت(ﷺ) وەلامی ئەداتەوە (قَالَ فَأَخْبَرَني فِي السَّاعَة) واتـە جوبرەئیـل ئینجـا گـووتی پێم بفەرموو قیامەت کەیە؟ (قالَ مَا المَسْؤولُ عَنْها بأعلَم مِنْ الـسَّائل) واتـە منیش هەروەك تۆی لێ دەزانم یان پرسیار لێکراو ئاگادارترو زاناتر نیە لـەم ڕووەوە لـە پرسـیارکەرەکە (قَـالَ فـأَخْبِرنِي عَـنْ أَمَارَتِهـا) واتـە عـەزرەتی (جوبرەئیل) فەرمووی دەباشە نیشانەکانم پێ بفەرموو (قَـالَ أنْ تَلِـد الامَـة ربَّتَها وأنْ تَرَى الحُفاة العُراةُ العَالَة رِعاءِ الـشَّاء يَتَطَـاوَلُونَ فِي البُنْيـان)، واتـە فەرمووی، ئەوەتا کە منـاڵ بـە چـاوی کارەکـەرو نۆکـەر تەماشـای دایـك و باوکی خۆیان ئەکەن وە ئەوەتە بەچاوی خۆت بینی کە پێ خاوس و ڕەش

---

(1) جبرئيل (عليه السلام) يسأل والنبي (صلى الله عليه وسلم) يجيب، لە نووسینی (الشيخ محمد حسان)، بەرگی/ یەکەم/ لاپەڕە ١٨.

و ڕووت و ڕەجاڵ و شوان و گاوان ببن بە خاوەن موڵك و سامان و خانووبەرەو کۆشك و تەلار لێی ڕابکشێن و فیزو دەعیەی پێوە بکەن[1]

**(تێبینی)**

بێجگە لەمەش ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، فەرموودەیەکی هێناوە لەو فەرموودەدا (دە) خاڵی ڕیز کردووە لە عەلامەت و نیشانە بچووکەکانی پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت باسی ئەکا خاڵی یەکەم.

١) قیامەت نایەت تا دوو کۆمەڵی گەورە شەڕ ئەکەن و دەجەنگێن و کوشتارێکی گەورە لە نێوانیاندا دەبێت و هەردوو کیشیان یەك مەبەستیان هەیە.

٢) کۆمەڵێك پەیدا ئەبن نزیکەی ٣٠ سی کەسن هەر هەموویان داوای پێغەمبەرایەتی ئەکەن.

٣) زاناکان و زانیاری نامێنن، وەك حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (أنَّ مِنْ أشراطِ السّاعةِ أنْ يُرْفَعَ العَلَم ويكثُر الجَهْل) رواه البخاري. واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە زانیاری نەمێنێ و نەزانی و تاریکی زۆر ئەبێ و لە (ڕیوایەتێکی) تردا ئەفەرموێ بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە کە ئەفەرموێت (إن بَيْن يَدي السّاعَةِ ظهورُ القلم) رواه أحمد، واتە پێش هاتنی قیامەت قەڵەم و نووسین زۆردەبێت و دەردەکەوێت.

٤) هەروەها بوومە لەرزە زۆر دەبێت.

---

(1) هەندێ لە زانایان (شەرعی) وا ئەکەن و ئەڵێن (پاشاو ئەمیرو سەرۆکەکان لە جاریەو کەنیزەیەك پێك دێن واتە لە باقی ڕەسەن لە بنەماڵەیەکی پاك و خاوێن و شەریف بن و کە ژن دێنن لە خێزانێکی سادەو /بێ ئەصڵ و /نەسەب/ ژن ئەخوازن و دێنن).

٥) ڕێگەی دوور نزیك دەبێتەوە، واتە ئەو ڕێگایانەی جاران بەچەندەها ڕۆژ و کاتژمێر دەبڕان ئێستا بە ماوەیەکی زۆر کەم دەبڕێت، (وەکو/ وەسائلی/ نوویٚ ئەتگەینیٚ/ بۆ هەر جێگایەکی مەبەست).

٦) کوشتن و خوێن ڕشتن زۆر دەبێت وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (سَيَكْثُرُ الهَرَج أي القَتْلُ) واتە: کوشتنی بەناهەق زۆر دەبێت (هەرەج) بە زوبانی (حەبەشە) بەمانای کوشتارە.

٧) ماڵ و سامان زۆر دەبێت بە شێوەیەك خاوەن سامان هەوڵ دەدات بەدوای کەسێکا صەدەقەو زەکاتی لیٚ وەرگریٚ وە زۆر دەیدات بە گوێی خەڵکاو ئەوانیش دەڵێن ئێمە پێویستمان پێی نییە.

٨) خەڵك کۆشك و تەلارو (قەصر و قصور) زۆر دەکات بەشێوەی ڕەنگاو ڕەنگ بەرزو بڵند دەکات بە شێوەی چەند (قات) لەسەر یەك تا خانووی خشت و قوڕ باوی نامێنێت.

٩) هەروەها زیندوو دەڕوات بەلای گۆڕستان یا گۆڕی مردوو ئاوات دەخوازیٚ بە جێگای ئەو .

١٠) خۆر لە خۆر ئاوا هەڵدێت واتە پێچەوانە دەبێتەوە ئینجا ئادەمی بە تێکرا باوەڕ دەهێنن بەڵام تازە باوڕیان لیٚ وەرناگیریٚ مەگەر پێشتر ئیمانیان هێنابیٚ وەك خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ﴾، ئیتر هەر کەسێك بەر لەوە باوەڕی نەهێنابیٚ ئەو ڕۆژە باوەڕ بهێنیٚ هیچ قازانجێکی لیٚ ناکات ﴿أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾ سوورەتی/ لأنعام: ١٥٨) واتە یان بیەویٚ لەو ماوەیدا چاکەیەك بەدەست بهێنیٚ هەمیسان بیٚسوود دەبێت کەوابوو بەر لەو ڕۆژە

باوەڕ بهێنن وەکارێکی باشیش وەدەست بخەن بۆ خۆتان ، خوایە ئیمانمان سەلامەت بکەی.

**( پاشکۆ )**

(ئیمامی بوخاری) بەتەواوی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەهێنێ و دەفەرموێ بەخوا قیامەت دێت وا دەبێ دوو پیاو پارچە قوماشێکیان بڵاو کردۆتەوە ئیتر نە مامەڵەکەیان پێ دەکرێت نە پێشیان دەپێچرێتەوە واتە هاتنەکەی زۆرمسۆگەرە بەشێوەیەکەمەردم پێی نازانێ تا کتوپرش دەرگایان پێ دەگرێ.

جا بێگومان بەخوا (قیامەت) دێت هی وا هەیەووشترەکەی دۆشیوە شیرەکەی ئامادەکردووە بیخوات کەچی مۆڵەتی نیە بیخوات ، بەخوا قیامەت دێت لە کاتێکدا هی وا هەیە خەریکی چاك کردنی حەوزەکەیەتی ئیتر دەرفەتی نامێنێ ئاوی تێبکات بەخوا قیامەت دێت وا دەبێت پارووی ئامادەکردووە بیبات بۆ دەمی ئیتر دەرفەتی نییە بۆی ناکرێ بیخوات ئەم فەرموودە پیرۆزە وا نیشان دەدات کە هاتنی ڕۆژ قیامەت گومان و دوودڵی تێدانیە .چوونکەزۆر لەناکاو دێت و بە کتوپڕی دێت و مرۆڤ هەستی پێ ناکات[1]

خوایە ئیمانمان بپارێزی لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکی هەردوو جیهان ئامین، (نَبَهَني الله وإيّاكم مِنْ نَوْمَةَ الغَافلِين وحَشَرَني وإيّاكُمْ تَحْتَ لِواءِ سَيّد المُرْسَلِين إنّ هذا لَبَلاغاً لِقَومٍ عَابِدين)

---

(1) بروانەپەرتوکی (فەتح الباري شرح صحيح البخاري)، دانراوی (الحافظ أحمد بن علي بن حجر العسقلاني) بەرگی/ یەکەم / لاپەرە/ ٢٤٣.

# ئامۆژگاری پەنجاو شەش

## باسی نیشانە گەورەکانی رۆژی قیامەت ئەکات

الحَمْدُ لله ثُمَ الحَمْدُ لله مَا تَـوْفيقي ولا إعْتـصامية الاّ بـالله العَلـيُ العَظـيم الحَمْدُ لله المَلَكُ العَظيم الخلاّق الذّي لَمْ يَنسى أحدٌ مِنْ مَخْلوقاتِه مِـنْ الأجـالَ والأرْزاق وهُوَالذّي يَنصُر مَنْ يَشاءُ ويَخذُل مَنْ يَشاء بِمَحْض فَـضْله وَعدْلَـهُ لاَ بالوجُوب والإستِحْقاق فَسُبْحانَهُ مِنْ آله فَتَح على عبَاده مَا إفْسَد عَلَـيْهم مِـنْ الأغلاق ولَطَـف بِهـم في حُكْمِه وقَـضَائه فَلَـمْ يُكَلِفُهـم بمـا لا يُطـاق، أحمَـدُهُ سُبْحانَهُ وتَعالى وأشْكُرهُ عَلى نِعْمَتِه التّي تَملأ الأفَاق وأتُوبُ اليـه وأسْـتَغْفرهُ وأسألهُ أنْ يُطهر قُلُوبَنا من الشقاقِ والنِّفاقِ وسُوء الأخْلاق وآنْ يُزيِّنَ ظَواهرنَا وبوَاطِنِنَا بمَكارمِ الأخلاقِ، وأشْهَدُ أنْ لا إله إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَـهُ شَـهادةً نُدخّرهُا لِيَوم الـتّلاقِ وأشْـهد أنْ سَـيِّدنا مُحَمَـداً عَبْـدهُ وَرَسُـولهُ النَبّـي الـذّي اشْرَقْت بـهِ الـدّنيا نَمايـةَ الاشـراق والـصّلاة والـسّلام عَلَيـهِ وعلـى آلـهِ وعَلـى أصْحابِهِ الى يَومْ الـدّين ومَـنْ تَـبعَهُم بإحْـسان إلى يَـوم الـدّين/ أمّـا بَعـد أيّهـا المُسْلِمون أوْصيكُمْ عِبادَ الله بتّقوا اللهِ وطاعَتِه في جَميع أوْقاتكم) واتـه: لـه دوای هەنـدێ موسـڵمانەکان وەسـیەتان لێ دەکـەم بـە تـەقوای خـواو جـێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوداوله هەموو کاتو ساتێکدا وە هـەروەها خـۆ بەدوور گرتن لەگوناهی گەورە و گچکەکان، بەتایبەت خۆپاراستن لە تـاوان و گوناهە گەورەکان چوونکە ئینسان بە هیلاك دەبات و دەیفەوتێنێ)[1]

---

(١) بۆ ئەم بابەتانە بڕوانە پەرتوکی (تاوانە گەورەکان) لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ، لە نووسین و ئامادەکردنی (عبدالرحمن مەلا طە عبدالعزیز) ناحیەی دارەتوو).

## (كورتە باسێك ، ئیمان بە ڕۆژی قیامەت واتەدوایی)

جا هەروەها بێگومان ئیمان بە ڕۆژی قیامەت واتە بە پاشەڕۆژ ئەمەیە ئینسانی موسڵمان باوەڕی ببیٚ وەكو چۆن ئەم جیهانە كەم زۆر هیچی نەبوەو خودای گەورە لە نەبوون درووستی كردووە وەكو (مەشهورە) (العالم حادث) واتە لە نەبونەوە بوە بە بوونەوەر جا بێگومان پێویستە وەها باوەڕت ببیٚ كە ئەم جیهانە بە (ئەمر) و فەرمانی خودا ئاسمان و عەرزو ئەستێرەكان و كەژو كێو هەموو ئەفەوتێنیٚ ئەو جا جیهانێكی تازەی گوشاد درووست ئەكات و بە ڕووناكیەكی تایبەتی هەمووی ڕووناك ئەكا وەكو كاتی پێش هەتاو كەوتنی ئەم جیهانە وەك لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾ سوورەتی/ الزمر: ٦٩) ئەویش لەو ڕۆژەدا بە نووری پەروەردگاری خۆی ڕووناك دەبێتەوە، وە هەروەها هەموو مردوەكان زیندوو ئەكرێنەوە ئینجا (سەوق) ئەكرێن بۆ مەیدانی مەحشەر (كۆمەڵگاهە گشتی و سارای جەماوەری) وە لەسەر ڕووناكی قورئانی پیرۆز ئەم كارەساتە وا دێتە جێگە ئەوجا فریشتەییٚ هەیە ناوی (ئیسرافیلە) (سەلامی خوای لێبێت) مەئمورە لەسەر جیهازێكی تایبەتی كە (بەقەدەر ئەرواح) كونی تێدایە بە ئەمرو فەرمانی خودا دووجار (ئیسرافیل) فوو ئەكا بەو جیهازەدا كە ناوی (صور)ە بە جاری یەكەم هەموو (كێوو عالەم) صاف ئەبن وە بەجاری /دووەم هەموو/ مردوەكان زیندوو ئەبنەوە جا هەروەها ئینسانی هۆشیار كە تۆزیٚ تەماشای خۆی و جیهان بكا پێویستی بە دەلیل و بەڵگە نامێنیٚ باوەڕ بە (حدوث) و پەیدابوونی دونیاوفەناو فەوتاندنیان ئەكا جا بێگومان زانایەكی فەڵەكی

ئەزانیٚ ئەم مـانگ و ڕۆژو ئەستێرانە ئەوانـەیان کـە ئـەجولێن و هاتوچۆی دەرەوە ئەکەن هەرکام دائیرەییٚ تایبەتی هەیە ئەگەر بە مـوییٚ لا بـدە لـە خەتی خۆی دونیا بە یەکجار تێك ئـەدا هـەروەها زەویش کـە یەکێکـە لـەو مـاددە درووسـت کراوانـە ئینجـا لەسـەر ئـەم یاسـایە کـە خـودای مـەزن فەرموویـــــــــەتی ﴿ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ﴾ سوورەتی/النحل: ٧٧) واتە: (نیە هاتنی قیامەت و (فـەنای) ئـەم جیهانـە ئیلّلا وەکو (ئیشارەی) چاو یـا نـزیکترو کـەمتر) یـا ڕاڤـەی بـە شـێوەیەکی ڕێسا تر ئەمەیە: واتە هاتنی ڕۆژی قیامەتیش هێندە ئاسان و خێرایـە هـەر بەقەدەر چاو تروکانێکە یان لە خێراییدا لـەوەش نـزیکترە، چـوونکە تـەنها هەر ئەوەندەیە کە خوا پێی بفەرمویٚ ببەو دونیا خراپ ببە ئـەوجا دەست بەجیٚ دەبێت.

**( ئاگادرینێك )**

جـا ئـەو کەسـەی شـتیٚ درووسـت بکـات ئـەش تـوانیٚ تێکـی بـدا ئـەو (زەلزەلە) و تەکانە کە پەیدا ئەبن لە زەویدا ئەگەر چەند پایە زیاد بکا دنیا هەمووی ئەگۆڕیٚ تێك ئەچیٚ، ئێمە لە چاوی عـەقلّی خۆمانـەوە ئـەڕوانین و ئەم (فەناو – بەقا) بە گران ئەزانین، بـەلاّم لـەلای خـودای گـەورە زۆر زۆر ئاسانە[1].

---

(1) بڕوانە پەرتوکی نووری ئیسلام ، دانراوی خوالێخۆش بوو (مەلا عبدالکریم مدرس) لەگەلّ دەستکاری لاپەڕە ٣٤.

## (تێبینیەك لە نیشانە گەورەكان)

پێغەمبەر (ﷺ) گەڵی لە نیشانەكانی هاتنی قیامەتی بەیانكردووە، ئەو نیشانانە گەورەو بچووكیان هەیە هەروەك لەپێشەوە باسمان كرد، بەلاّم نیشانە گەورەكان یەك لە دوای یەك دێن وەك لە فەرمودیەكدا هاتووە كەوا (عبدالله)ی كوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (الآيات خَرْزاتٌ مَنْظومات في سَلكٍ فإنْ يَنْقطِع السّلكُ يتبعُ بعضها بعضاً) رواه أحمد واتە: نیشانەكان وەك مۆری هۆنراوە وان لەسەر پەتێك هەر لەگەڵ پەتەكە پچڕا یەك لە دوای یەكدا دەخزێن وە دەكەونە خوار، ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (يَتَقارَبُ الزّمان) واتە زەمانە كورت دەبێتەوە (بەجۆرێكی وا كە ساڵ وەكو مانگ و مانگ وەكوە حەفتەو حەفتە وەكو ڕۆژوو/ وەكو سەعاتی لێ دێ ڕەزیلی زۆر ئەبێ (ويُلْقى الشّحُ) واتە: ڕۆژ دێ ڕەزیلی زۆر ئەبێ و (ويظهر الفِتَنُ ويكثر الهَرَجُ) واتە فیتنەو كوشتن زۆر ئەبێ، وە هەروەها لە نیشانە گەوررەكانە كەم بوونەوەی زانیاری لە دیندا زۆر بوونی (كوشتار) لە جیهاندا وە لەوانەیە كەم بوونەوەی شەرم و حەیا لەناو (ئەهلی) جیهانداو هەروەها كەم بوونەوەی فەرمان بە یاسای ئیسلام وە یەكێ لە حەدیسە گرنگەكان كە ئاماژە ئەكات بۆ ئەو كاتە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (إذا وُسُدَ الأمر إلى غَيْرِ أهلِه فأنتظروا السّاعة) رواه البخاري، واتە كاتێ فەرمان و كاروباری جیهان درایە دەستی كەسێ بۆ ئەو كارە نەشێ چاوەڕوانی قیامەت بكەن، جا هەروەهالە عەمری كوڕی تەغلیب (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (إنّ مِنْ أشراطِ السّاعة أن

يَفْشُوا المالَ ويَكثر وَتَفَشُوا التِجارة ويظهر العلْم ويبيع الرّجلُ البَيْع فيَقُول لا حتّى أستأمر تاجِر بني فُلانٍ ويَلْتَمِس فِي الحَيّ العَظم الكَاتِب فَلاَ يُوجدُ) رواه النسائي، واته: له نيشانه‌كانی رۆژی دوايی مـالْ وسامانی زۆر ده‌بـیْ عـيلم وزانـست زۆر ئـه‌بیْ وه كـرين و فرۆشـتن زۆر ئـه‌بیْ وا ده‌بێـت كـه يـه‌كێك نابينيه‌وه‌كه بـراوی پێبكـه‌ی بۆيـان بنوسـیْ و ده‌ڵێت بابـچينبۆ لای فلانـه كه‌س كه له فلانـه تيره‌يه‌ئـه‌ويش نابينيـه‌وه بۆيـان بنووسـیْ كـه ئـه‌مين و ده‌ست پاك بێت.

## (باسێك لـه‌و نيـشانانه‌ی كـه له‌مـه‌وپاش ده‌رده‌كـه‌ون واتـه نيـشانه گه‌وره‌كان)

جا هه‌روه‌ها بێگومـان (حـوذه‌يفـه‌ی كـوڕی ئوسـه‌يدی غـه‌فاری (ڕه‌زای خوای لێبێت) ئه‌گێڕێته‌وه‌و ئه‌ڵی (أطلّع النّبّي (صلى الله عليه وسلم) علَيْنـا ونَحْـنُ نَتَـذاكر فقَـالَ مَـا تـذكرون؟ قَـالُوا نَـذْكر الـسّاعة)، واتـه جارێكيـان پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) لێمـان ده‌ركـه‌وت له‌كاتێكـدا ئێمـه خـه‌ريكی قـسه‌و بـاس بووين فه‌رمووی ئه‌وه باسی چی ده‌كه‌ن؟ ووتمـان باسـی (قيامـه‌ت) و دوارۆژ ئه‌كه‌ين، ئينجا فه‌رمووی (قَالَ إنّها لَنْ تَقوم حتّـى تَـرَوْنَ قَبْلَهـا عَـشرَ آيـات) واتـه: (قيامه‌ت) هه‌ڵناسێت هه‌تا ده نيشانه له پێش هاتنيدا نـه‌بينن (فَـذَكر الدّخانَ والدّجَال والدّابة وَطلُوع الشّمْس مِنْ مَغْرِبِهَا وَنـزُوْل عِيـسى إبـنْ مَـرْيَم (عليهِ السّلام) ويَاجُوجَ ومأجوج) واته فه‌رموی دوكـه‌ڵ و ده‌جـال و (دابـه) واته حه‌يوانێكه هه‌ڵهاتنی خۆر لـه‌خۆرئاواوه، وه دابـه‌زينی عيـسای كـوڕی مه‌ريه‌م (سه‌لامی خوای لێبێت) وه ياجوج و مه‌ئجوج)ه.

(وثلاثَة خسُوفٍ خَسَفٌ بِالمَشرق وَخَسْفٌ بالمغربِ وخَسْفٌ بجزيرة العَرَب وآخرُ ذلك نَارٌ تَخْرُجُ مِنَ اليَمَنِ تَطْرُدُ النّـاس الى مَعْشَرِهُم) أخرجـه مـسلم في صـحيحه، واتهسـێ رۆچـوون پهیـدا ئـهبێ و رۆچـوونێك لـه خۆرهـهلات و رۆچوونێك لـه خـۆر ئـاواو رۆچـوونێك لـه دوورگـهی (عـهرهب) و وهكۆتـایی ئـهوانیش ئاگرێكـه دێـه دهر خـهلكی راو دهنێـت بـهرهو شـوێنی (حهشـر) كردنیان ئهبات)، جا ههروهها (ئیمام موسلم) حهدیسێكی تری هێناوه، بـه شێوهیهك كهوا پێغهمبهری خوا (ﷺ) فهرموویهتی باسی ئـهوهی كـردووه سێ (خهسف) واته زهوی رۆچوونی گهوره له جیهاندا ئهبن له خۆرههلات و خۆر نشین و (جهزیرهی) عهرهبی یدا هـهروهها [1] گـهلێ فیتنـهی وا پـهیدا ئهبن كه هۆشیار سهرگهردان ئهكهن نهك لهبهر ئـهوه عـهقلیان ناشـكێ بـه رزگاری لهوانه بهلام توانایان نیه چارهیان بكهن.

## (چەند ئاگاداریيەکی گرنگ)

یهكـــهم) رۆژ لـــهرۆژ ئـــاواوه ههلـــدیت ، بهپێـــچهوانهی ئێـــستا وهك پێغهمبهری خۆشهویستمان (صلی الله علیـه وسـلم) دهفـهرموێت (قیامـهت نایهت تا رۆژ له رۆژئاواوه ههلنێت ئهوجا كه ههلهات و خـهلكی چـاوی پـێ كهوت ئیتر به گشتی بروا دێنن بهلام ههركهسێك پێـشتر بـروای نـههێنابێت تازه بێ سوود دهبێت) بوخاری و مسلم ریوایهتیان كردووه.

دووهم) هاتنی حهوبانێكه دهكهوێته گفتوگۆ لهگـهلّ ئـادهمیزاد، دهلیـل وبهلگـه بـۆ ئهمـهش ئـهم ئایهتـه پیرۆزهیـه لـه سـوورهتی (النمـل) دا وهك

---

(1) واته: وهكو له كتێب و حهدیسهكان بهیان كراوه و .

ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ ﴾ واتە: كاتێ فەرمانی سزای ئەمانە درا وەبڕیاریش درا کە (قیامەت) بێت ﴿ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً ﴾ ئەوا لە سکی زەویدا (دابة الارض) یان بۆ دەردەهێنن ﴿ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴾ سوورەتی/ النمل ٨٢) واتە قسەمانلەگەڵ ئەکاو ئەڵێ بەڕاستی زۆربەی ئەم خەڵکە باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نەهێناوەیەقینیان پێیان نەبووە بەڵێ هاتنی (دابة الأرض) یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی ڕۆژی قیامەتە).

سێ هم) هاتنی (خەلیفە مەهدی)یە: جا هەروەها بێگومان ئەوەی لەم بارەیەوە ببێ کە لەنزیکی هاتنی دوارۆژا پیاوێك پەیدا ئەبێت ناوی (محمد کوڕێ عبدالله)یە ئەم زاتە لە خانەدان و بنەماڵەی حەزرەتە (ﷺ) واتە سەییدە وە هەروەها لەنەوەی (فاطمە)ی کچی پێغەمبەرە (ڕەزای خوای لێبێت) وە لە ڕەوشتا دەچێتەوە سەر پێغەمبەر نەك لە ڕواڵەتا جا هەروەها سەر زەوی پڕ ئەکات لە دادو عەدالەت: جا بێگومان ئەبو سەعیدی خدری (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لتَمْلأنَ الأرضَ جوراً وَظُلماً فإذا مَلأت جوراً وظُلْماً يبعثُ الله رَجُلاً مِنّي إسْمُه إسْمي وإسْم أبيه أسم أبي فيملؤها عَدْلاً وقسْطاً كَمَا مُلئتْ جوراً وظلماً فلا تَمْنع السّماء شَيئاً من قطرِهَا والأرْضُ شَيْئاً مِنْ نَبَاتها يَمْكُثُ فيكم سَبْعاً أوْ ثَمانية فإنّ أكْثَر فتسعاً) رواه الطبراني والبزار وأبو نعيم، واتە: زەوی پڕ دەبێت لە زوڵم و ستەم وە کە پڕ بوو لە زوڵم و ستەم خوای گەورە پیاوێك دەنێرێت لە نەوەی منەو وە ناوی ناوی منە وە ناوی

باوکیشی ناوی باوکی منه زەوی پڕ دەکات لە ڕێکی و دادپەورەری، هەروەکو چۆن پڕ ببو لە (زوڵم وستەم) لە زەمانی ئەودا ئاسمان هیچ لە بارانی ناگرێتەوە، واتە بە بەردەوامی باران دەبارێ زەویش هیچ لە گیاو گۆری خۆی ناگرێتەوە حەوت یان هەشت ساڵان لەناودا دەبێت ئەگەر زۆر خایاند ئەوا نۆ ساڵ ئەخایەنێ ...) جا هەروەها زۆربەی نووسەرو مێژوو نووسان ئەڵێن لەدوای (محمد المهدی دەجال) دێت ئینجا حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) دێتە خوارەوە ئینجا بە (ئەمری) خوا حەزرەتی (عیساو محمد المهدی ئەو دەجالە[1] لەناو ئەبەن وە لەدوای ئەوە (مەهدی) کۆچی دوایی دەکات وە موسڵمانەکان نوێژی لەسەر دەکەن ئینجا بە خاکی ئەسپێرن).

**(تێبینی)**

ئەمە کورتەی ئەو (ڕیوایەتانەیە) کە دەربارەی (مەهدی) هاتبوونەوە (خولاصە) ەی ووتە ئەوەیە لەسەردەمی دوایی (ئاخر زەمان) دا پیاو چاکیک پەیادا ئەبێت وە ئەو پیاو چاکە ئەبێ بە دەرگای هەموو خێرو

---

(١) زۆربەی سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان باسی دەرچوونی (کافرێکی) ناباری کردووە کە ناوی (مەشهوری) دەجالە، واتە زۆر درۆزنە، وە هەروەها گەڵی ئادەمیزادی بێ دین و بێ عەقڵ ئەکەونە شوێنی بە ناڕەوا ،وەباسی دەرکەوتنی (ئەمیرێکی عادلی) کردووە کە ناوی (مهدی) زاڵم ستەمکاران بەدەستی ئەو ئەفەوتێن وە هەروەها حەزرەتی عیسا لە زەمانی ئەودا لەئاسمان دێتە خوارەوە وە جەنگ ئەکەن لەگەڵ دەجالدا هەروەها دەجال بەدەست ئەوان ئەکوژرێ و سوپاکەی پەرش و بڵاو ئەبێتەوە وە حەق سەرئەکەوێتەوە بڕوانە نوری ئیسلام لەگەڵ دەست کاری/ لاپەڕە/ ٣٦

چاکەیەك ئیتر ئێمەی موسڵمان (ئەهلی سوننەتو جەماعەت سەبارەت بە حەزرەتی مەهدی ئەمە عەقیدەو بیرو باوەڕمانە ، نەوەك بیرو باوەڕی مەزهەبیەکان چاوەڕوانی ئەکەن[1].

## پاشکۆی هاتن و دەرکەوتنی سۆفیاتی

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (يَخْرُجُ رَجُلٌ يُقالُ لَهُ السُّفياني في عُمْقِ دِمَشْق وعامّة مَنْ يَتْبَعَهُ مِنْ كَلْب فيَقْتُل حتّى يَبْقَرَ بُطُونَ النّساءِ ويَقْتُل الصّبيان فَتَجْتَمِعُ لَهُ قَيْسٌ فَيَقْتُلَهَا حتّى لاَ يَمْنَعَ ذَنَبَ تِلْعةٌ وَيَخْرُج رَجُلٌ مِنْ أهْل بَيْتِي في الحُرّة فَيَبْلُغ السّفياني فَيَبْعَثُ اليهِ جُنْداً مِنْ جُنْدِهِ فَيَهْزِمَهُم فيَسير اليهِ السّفياني بِمَنْ مَعَهُ حتّى إذا صار بيداءِ مِنْ الأرضِ خُسِفَ بِهُم فَلا يَنْجُو مِنْهُم إلاّ المُخْبِر عَنْهُم) (رواه الحاكم في المستدرك على شرط الشيخين) واتە: پیاوێك پەیدا دەبێت پێی دەوترێت (سوفیانی) لە قوڵایی دیمەشقەوە وەزۆربەی ئەوانەی شوێنی دەکەون لە خێڵی (کلب) کوشتارێکی زۆر دەکات هەتا وای لێدێت سکی ئافرەت هەڵدەدرێت و منداڵ دەکوژێت پاشان خێڵی قەیس لە دژی کۆدەبنەوە ئەویش بەسەریاندا زاڵ دەبێت وەدەیان کوژێت لەو کاتەدا پیاوێك لە (ئال و بەیتی) من لە ناوچەی حرە کە جێگایەکی (مەشهورە) لە

---

(1) بڕوانە/ (خواپەرستی لە ئیسلامدا) بە پێنووسی خوالێخۆش بوو (ئەحمەدکاکە مەحمود) لاپەڕە ١٥٩، وە لەگەڵ دەست کاری ، وە هەروەها بڕوانە/ (دوایین ڕووداوەکان و کۆتایی جیهان) لە نووسینی بەڕێز (محمد حسان) لە وەرگێڕانی (عبدالمجید عبدالحمید) لاپەڕە /١٦٥.

نزیك شاری (مەدینە) سەر هەڵدەدات وە هەواڵی بە سوفیانی ئەگات ئەویش لەشکرێك لە لەشکرەکانی خۆی بۆ دەنێرێت بەڵام دەیان بەزێنێت ئەم جارەسوفیانی بە خۆی و بە سوپایەکەیەوە بۆی بەڕێ دەکەون هەتا کاتێك دەگاتە زەویەکی بیابان هەموویان ڕۆ دەچن بەناخی زەویدا کەسیان لێ ڕزگار نابێت تەنها ئەوە نەبێت کە هەواڵیان دەهێنێتەوە.

**(سەرنجێك)**

لەم فەرموودە پیرۆزوە بۆمان دەرئەکەوێت کە لەپێش هاتنی (محمد المهدی) دا پیاوێکی زاڵم و ستەمکار لە سوریا دەسەلآت دەگرێتە دەست وە چەندین شەڕو کوشتار ئەکات ئینجا لە کۆتاییدا (محمد) ی مەهدی لە وڵاتی حیجاز سەر هەڵئەدات خۆی و موسڵمانەکانی سوپاکە ئەکەونە دوعاو پاڕانەوە کە ئەو لەشکرە ستەمکارە لەناوبچێت و ئینجا خوای گەورە دوعاو پاڕانەوەیان قەبوڵ ئەکات، جا هەروەها پێدەچێت کە سوفیانی دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بێت بۆیە بوونی هێزێکی ئیسلامی لەناوچەکەدا پێ قەبوڵ ناکرێت دوا جار لەشکرکێشی دەکاتە سەریان جاری یەکەم سوپاکەی شەڕی (مەهدی) دا دەشکێت بەڵام جاری دووەم خۆی و سوپاکەی ڕۆدەچن بەناخی زەویدا.

(پاشکۆ) هەروەها مێژوو نووسان ئەڵێن پێویستە بزانین کە (سوفیانی) ناوی ئەو پاشا زاڵمە نیە بەڵکو (لەقەب) و شورەیتی وەهەروەها پێدەچێت کە بارو دۆخی (سیاسی) ناوچەکە لەو کاتەدا لەبار بێت بۆ سوفیانی بۆیە

دەتوانێت لەشکرەکەی دووجار ڕەوانەی (حیجان) بکات و ئەنجامی بدات[1].

## (چوارەم باسی هاتنی دەجالە)[2]

جا هەروەها بێگومان نیشانەیەکی تری گەورەی قیامەت، پەیدابونی (دەجالە)، کە ئیدیعای خوایەتی دەکات (العیاذ بالله) وە دەیەوێ خەڵکی لە ئاین دوور بخاتەوە وە عالەم (کافر) بکات وە بەهۆی ئەوشتانەوە دوورن لە تواناوە کە لەسەر دەستی پەیدا ئەبن چونکە چەندەها شتی سەر سوڕهێنەر لەسەر دەستیا ڕوو ئەدەن وە خەڵکی پێوە سەرگەردان ئەبن چوونکە ئینسانی جادووگەر هەڵفرێنەرە ، بەلاَم سوپاس بۆ خودا موسڵمانەکان (ثابت) دەن و دوای ناکەون و بە وات و ویتی ئەو هەڵناخەڵەتێن ئینجا بەتەواوی ئیماندارەکان بۆیان دەرئەکەوێت بەتەواوی ئەوە (دەجالە) چوونکە لەنێو چەوانی نووسراوە (هذا دَجَال هذا کافر) واتە: ئەوە (دەجالە) ئەوە کافرە و بێ باوەڕە وە ئەوجا هەموو موسڵمانێك ئەم نووسراوە لەنیچو چەوانی دەخوێنێتەوە وە ئینجا بۆیان دەردەکەوێ وە دەیناسن و وە هەوڵی کوشتنی دەدەن وە سەرکەوتوو دەبن لە ئیشەکەیانا وە بە سەرکردایەتی عەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێت)

---

(1) بڕوانە/ پەرتووکی/ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی و ڕووداوەکانی پێش هاتنی) لە نووسینی هاوڕێ محمد امین لەگەڵ دەستکاری / لاپەڕە/ ١٢٩.

(2) دەجال : لە زۆربەی فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی هاتووە بەلاَم لە قورئاندا خۆ باسی نەکردووە لەبەر ئەوەی (ئیهتیمامی) پێ نەکردووە وە گوێی پێ نەداوە) بڕوانە پەرتووکی (مصباح القلوب ومفرج الکروب) دانراوی (عبدالرحمن مەلا طە عبدالعزیز) بەرگی دووەم/ لاپەڕە/ ٥٦٠.

لەگەڵ (محمد المهدی) موسڵمان جەنگاوەرەکان ئەو کاتە لەناوی دەبەن و بەڵێ دەجال ئەو فتنە گەورەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە دەرحەقیدا ئەفەرموێت (يا أيّها النّاس إنها لَمْ تَكُن فتْنةً في الأرْضِ مُنْذُ ذَرَ الله ذُريَة آدم أعْظم فِيتنة مِنْ الدّجال وإن الله لَمْ يَبعَث نَبيّاً إلاّ حَذر أمَتّه الدّجال وأنا آخر الأنْبياءِ وأنْتُم آخر الأُمَم وهو خارجٌ فِيكم لاَ مَحالَة [1] واتە: ئەی خەڵكینە هەتا ئێستا هیچ فیتنەیەك نەبووە لەسەر رووی زەویدا لەو رۆژەی كە خوای گەورە نەوەی ئادەمی لەسەر زەوی بڵاوەپێ كردووە لە (فیتنە) ی دەجال گەورەتربێت وە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە كەئوممەتەكەی لە دەجال ئاگادار نەكردبێت منیش كۆتایی پێغەمبەرانم، ئێوەش كۆتایی ئوممەتانن وە بە دڵنیاییەوە لەناو ئێوەدا دەردەچێت) هەروەها حەزرەت (ﷺ) لە فەرمودەیەكی تردا ئەفەرموێت : (مَا بَيْنَ خَلق آدم إلى قِيام السّاعة خَلقٌ أكْبَرُ مِنْ الدّجال) رواه مسلم ،واتە : لە ئەوەڵەوە كە خودا ئادەمی درووست كردووە تا ئەو دەمە كە قیامەت هەڵدەستێ هیچ (فیتنەیەك) واتا ئاژاوەیەك نی یە لە فەرتەنەی دەجال گەورەتر بێت (خودا بمان پارێزێت) جا هەورووەها ئەنەسی كوڕی مالیك (خودا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (ما بَعَثَ نَبيّ إلاّ أنْذَر أمّته الأعور الكذّاب إلا أنّه أعَورٌ وإنّ رَبّكُم لَيسَ بأعْوَر وإنّ بَيْنَ عَيْنَيْهِ مكتُوب كافِر) [2] رواه البخاري، واتە خوا هیچ پێغەمبەرێكی ڕەوانە نەكردووە ئیلاّ ئوممەتەكەی

(١) بروانەپەرتوكی صحيح الجامع الصغير ، بەرگی شەشەم ، لاپەڕە ٢٧٣.

(2) دوایین (ڕووداوەكانی كۆتایی جیهان) لە نووسینی (محمد حسان) لە وەرگێڕانی (عبدالمجيد عبدالحميد) لاپەڕە/٥٠٩.

لەو درۆزنە چاو کوێرە ئاگادار کردۆتەوە بەڵام ئێوە بزانن کەوا، ئەو چاوی کوێرە، وە خوای گەورە هەرگیز کوێر نییە وە لەنێوچەوانیشی نووسراوە (کافر) وە لە (صحیح مسلم ) دا هاتووە لە فەرموودەی (حوزەیفەی کوڕی الیمانی ) ەوە کەوا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی ( مكتوبٌ بين عَينيهِ كافر يقرؤه كُل مؤمن كاتب وغير كاتب) واتە هەموو کەسێکی مووسڵمان دەیخوێنێتەوە خوێندەوار بێ و نەخوێندەواربێ)

**( پاشکۆ )**

جا بێگومان زانایانی ئایینی ئەفەرموون، ئەو فەرموودانەی لە بارەی دەجالەوە گوتراون هەرهەمویان وا دەگەیەنن کە حەزرەت (ﷺ) دەجالی بۆ دەرکەوتووە وە بۆی ڕۆن بووەتەوە کە لەسەردەمی دواییدا پەیدا ئەبێ وە چەند شتێکی ناشەرعی ئەکا و مرۆڤ سەرگەردان ئەکا و چونکە لە نەتەوەی (جولەکەیە) ئینجا موسڵمانەکان لە ناوی دەبەن وە هەر وەها کوشتارێکی باش دەکا لە جوولەکەو ئینجا موسڵمانەکان دەیکوژن و لەناوی دەبەن، جا هەروەها بێگومان (دجال) پیاوێکی جوولەکەیە لە نەوەی (آدم)ە گەنجێکی سوری کورتە باڵای سینگ پانی توێڵ کەچەڵی قژ لوولە هەردوو قاچ لارو بڵاون چاوی لای ڕاستی نییە[1] و سڕاوەتەوە وە لە شوێنی نوسراوە (ك ف ر) واتە (کافر) چوونکەلەگەڵهەندێشدا لاف خوایەتی

---

(1) جا هەروەها بێگومان (دەجال) چاوێکی کوێرەو سڕاوەتەوەو / ڕەش کراوەتەوە (عين طافئة) واتە ڕووناکی تێدا نەماوە یان (عين طافية) واتە : عەیبدارە هەردوو لەو شتانە تەواون ، بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو).

لێدەدا چل ڕۆژ لەسەر زەویدا دەمینێتەوە یەك ڕۆژی بە ئەندازەی ساڵێکە وە ڕۆژێکی تریشی بەئەندازەی مانگێکە وە ڕۆژێکی تریشی بە ئەندازەی هەفتەیەکە وەڕۆژەکانی تریشی وەکو ڕۆژانی ئاساییە.

جا لەو ماوەیەدا هەموو سەر زەوی دەگەڕێت بەلاَم (ناتوانێ بچێتە شاری مەککەو مەدینە) جا خوای گەورە حەزرەتی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) بۆ دادەبەزێنێت لە(باب اللد) ئەسیری ئەکاو حەربەیەکی ئاراستە ئەکاو ئەیتۆپێنێ.

## ( چۆنیەتی خۆپاراستن لە فیتنەی دەجال )

جا بێگومان دوعاو پەنا گرتن لە فیتنەی دەجال بەتایبەتی لە نوێژدا وەك لە چەندین فەرموودەی (صحیح) داهاتووە هەروەها ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (إذا شَهِد أحَدُكُمْ فَلْيَسْتَعِذ باللهِ مِنْ أرْبَعٍ يقُول (اللّهُمَ إنّي أعُوذُ بِكَ مِنْ عَذّاب جهنّم ومِنْ عَذاب القَبْر ومِنْ فِتْنَةِ المَحْيا والمَمَاتِ ومِنْ شرِّ فِتْنَةِ المَسيحِ الدّجال) رواه مسلم، واتە: (کە یەکێکتان شایەتمانی هێنا لە نوێژدا واتە (تەحیاتی) ئاخیردا با دوعا بکات و پەنا بە خوا بگرێت لە چوار شت بڵێت خوای گەورە پەنا بەتۆ دەگرم لە سزاو عەزابی دۆزەخ وە لە عەزابی گۆڕ وە لە فیتنەی زیندوو بوونەوەو مردن وە لە فیتنەی مەسیحی دەجال) وە هەروەها (ابو الدّردا) یش (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێت کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ حَفِظَ آياتٍ مِنْ أوْلِ سُوُرَة الكَهْف عُصِمَ مِنْ الدّجال) رواه مسلم، واتە: هەر کەسێك دە ئایەتی یەکەمی سورەتی (الكهف) لەبەر بکات لە فیتنەی دەجال پارێزراو دەبێت (خوا بمانپارێزی)

نَبَهَني اللهُ وإياكُم مِنْ نَومة الغافلين وحشرني وَإياكُم تحتَ لواء سيد المُرسَلين آمين

## پێنجەم ( باسێك لە دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم ( عليه السلام )

پێش ئەوەی باسی دابەزینی ئەم زاتە بکەین (سەلاّت و سەلامی خوای گەورەی لێبێت)، ئەمەویّ کورتەیەك ژیانی لەدایك بوونی ئەم بەڕێزە بخەمە بەرچاوی خوێنەران، بەلّیّ حەزرەتی عیسا (ع) وەکو هەموو منداڵێك گەورە بوو بەلاّم لەبیرو باوەڕدا لە عەقلّ و شعورو خووڕەوشتدا لەهەموو منداڵێك

جیاواز بوو لەسەر پشتی لانکەدا واتە بێشکەدا قسەی دەکرد لە تەمەنی منداڵیدا (موعجیزەی) دەنواند هەروەها لە سورەتی (المائدە) دا خوای گەورە منەت بەسەر حەزرەتی عیسا دا دەکات و پێی دەفەرموێت ﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا﴾ سوورەتی/ المائدة: ١١٠) لەو فەزڵ و موعجیزانەی کە بەتۆم بەخشیوە ئەوەیە کە لەسەر (لانك) واتەبێشکە قسە لەگەڵ خەڵکی دەکەیت هەروەها بە جحێڵی و پیریشی جا هەروەها بێگومان (ابن کثیر) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێ خوای گەورە لە سورەتی (آل عمران) دا لەناوەڕۆکی هەشتاو سێ ئایەت دا بەرپەرچی گاورەکان دەداتەوە دەربارەی ئەو تۆمەت و قسەوباسانەی کە خستویانەتە پاڵ عیسی (سەلامی خوای لێبێت) وە وایان بڵاو کردۆتەوە کە گوایە خوای گەورە کوڕی هەیەو کوڕەکەشی (عیسایە) بەلاّم بێگومان بەڕاستی خوای گەورە پاك و دوورە لەو قسەو باسانە ئەوەبوو کات خۆشی نوێنەری گاورەکانی (نەجران) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وە باسی ئەوەیان کرد کە ئەوان لە هەڵیەکی گەورە دان کەبیرو باوەڕیان لەسەر (سیانە) دامەزراندووە کە بریتین لە (ذات المقدّسَة، وَعیسی مَرْیم) وە لەسەر ئەوەش جیاوازییان هەیە خوای گەورەش ناواخنی ئەم سورەتەی دابەزاند بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەڕوونی کردەوە کە (عیسا)ش وەك هەر مرۆڤێکی تر (بەندەیەکە) لە بەندەکان ، خوای گەورە هەر ئەو خوایە خۆی لەڕەحمی دایکیدا وێنەی کێشاوە وە درووستی کردووە ، وە هەر وەکو چۆن مەخلوقاتەکانی تریش وێنەکێش کردووە وەبێ باوك درووستی کردووە ، هەروەك چۆن ئادەمیش هەر بێ باوك و دایك درووست کرد ، وە خوای گەورە بە(کُنْ فَیَکُنْ) ئەویشی درووست کرد.

جا بێگومـان حـەزرەتی (عیـسا علیـه الـصلاة والـسلام)، لـه (٣٠) سـی ساڵیدا (جوبرەئیل) هـات بـۆلای وە وەحـی واتـه نیگـای بـۆ هێنـا لەلایـەن خواوە، ئینجا بێ ووچان دەستی کـرد بـه گەیانـدنی بەرنامـەی خـوا بـەلاّم ناپاکان هەروەك له هەموو چەرخێك سزاو ئەشکەنجەیان داو تووشـی ئـێش وئازاریان کردبەڵێ ئینجا دوای ئەوە وەسیەتی کرد بۆ (حەوارییەکانی) واتـه قوتابیەکانی فەرمووی (کـاتی گەڕانـەوەهاتووە بـۆلای خـوا مـن دەڕۆم بـۆ شوێنێك ئێوە ناتوانن لەگـەڵم بـێن ئامۆژگاریەکـەم وەرگـرن ماوەیـەکی تـر (فارقلیط)[1] دێـت دەبـێ بـه پێغەمبـەر (ﷺ) بەمنزیکانـه نـامبینن ئینجـا ئەویش لەگەڵ قوتابیـەکانی دا (ئـاخیر) جـار کۆبـۆوە بـەلاّم یـەکێکیان لـه پێناوی چەند دەرهەمێکا دەسـتی دوژمنـەکانی ڕاکێـشاو هێنـانی بـۆ سـەر جێگەکە تا بیکوژن، ئینجا ئەو پیلانەیان کرد خوای گەورە بچمی عەزرەتی (عیسای) گۆڕی بردیە سەر ڕەنگـی پیـاوە (جاسوسـەکە) وە جابەربوونـه ئەوو ئیتر کوشتیان وە دوایی بلاّویان کـردەوە کـه (عیـسایان) کووشـتووە ئینجا خوای گەورە لە قورئاندا ئـەو ڕاسـتیەمان زۆر بـه ڕوون وئاشـکرا بـۆ دووپـات دەکاتــەوە کـه عیـسای کـوڕی مەریـەم (سـەلامی خـوای لێبێـت) بەدەستی جوولەکەکان نەکوژراوە وەك خۆیـان بانگەشـەی بۆ دەکـەن وە هەروەها (دیانەکانیش) پێی هەڵخەڵەتاون وە باوەڕیان پـێ کـردووە بـەڵکو خوای گەورە پاراستویەتی لە دەستی جوولەکەوە هەڵیکێشاوە بۆئاسمـان

---

(١) فارقلیط: به زوبانی (عبرانی) مەبەست پێغەمبەرە (ﷺ) واته حەزرەتی محەمەدە (صلی الله علیه وسلم)، بەلاّم لەسەر زاری حەزرەتی عیسا (ع) ئەفەرمووێت: ﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ ﴾ الصف/ ٦ / واته مزگێنی به هاتنی پێغەمبەرێك دەدەم كه پاش خۆم دێ ناوی (احمد)ه و...)

وەك لــە ســوورەتی (النــساء) دا خــوای گــەورە بۆمــان دەگێڕێتــەوەو ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ ســوورەتی/ النــساء/ ١٥٧ – ١٥٨) واتــەبێگومان نەکوشتویانەو نە لەخاچشیانداوە بـەڵکو کەسێکی تریـان بـۆ خرایـە سـەر شێوەی ئەو وە ئەوکەسانەش کە ڕاو بۆچـوونی جیاوازیـان هەیـە لەسـەری هەموویان لێی بە گومانن هیچ زانیارییەکیان دەربارەی نییە جگە لە شوێن کەوتنی گومان نەبێت وە دڵنیانین لەوەی کـە بەڕاسـتی کوشـتویانە بـەڵکو خوای گەوەر هەڵیکێشاوەو بەرزی کردۆتەوە بۆلای خۆی، وە خوای گەورە هەر خۆی (خاوەن عیزەت) و حکمەتە، کەواتـە عـەزرەتی عیـسا (سـەلامی خــوای لێبێــت) نــەمردوەو نــە کــوژراوە. بــەڵکو خــوای گــەورە بــەتواناو دەسەلاتی خۆی بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان لە ئاخیر زەمانیشدا جـارێکی تــر دایدەبەزێنێتــەوە ســەر زەوی هــەروەك دەفــەرموێت ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾ سوورەتی/ الزخرف/ ٦١) واتە : عیـسا (سـەلامی خـوای لەسـەر بێت) نیشانەیە بۆ هـاتنی قیامـەت ، وەهـەروەها دەشـفەرموێت ﴿ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ﴾ســوورەتی النــساء/ ١٥٩) واتــە کەسانێك هەن لە (ئەهلی کتاب) مەبەست پێیان (جوولەکەو دیانە) لـەپێش مردنی عیسادا باوەڕیشی پێ دەهێنن، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئـەوەی بەشێکی زۆر لەو دیانانەی کە عیسا بە خواو کوڕی خـوا تێدەگـەن لـەکاتی هاتنە خوارەوەی (عیسا) (سەلامی خوای لێبێت) بۆ جاری دووەم لە ئـاخر زەماندا لەو بیرو باوەڕە پووچەڵەی خۆیان پەشیمان دەبنەوەو باوەڕی پێ

دەهێنن کە بەندەی خوایە[1].

**(تێبینیەك)**

جا هەروەها بێگومان ئەو فەرموودانەی سەبارەت بە عەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێت) هاتوون هەر هەموویان وا دەگەیەنن لە سەردەمی دواییدا وە لە کاتی پەیدابوونی دەجال دا عەززرەتی عیسا پەیدا دەبێت ، ئینجا تەرازووی ماف و داد پەروەری دادەنێت وە بەپێی بڕیارو نەخشەی شەریعەتی ئیسلام دەڕوا بە ڕێوە ئینجا دەجال دەکوژێت و هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد ئەوجا لە پاشان ژن دێنێ و مندالّی ئەبێ ئینجا چەندی خوا حەز بکات لەلایەن خواوە بڕیاری دابێت بۆ مانەوەی ئەوەندە دەمینێتەوە ، ئەوجا لە دواییدا وەفات دەکات و موسلّمانەکان نوێژی جەنازەی لەسەر ئەکەن ئەوجا لەپالّ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەخاك دەسپێردرێت[2].

**(باسێکی زۆر گرنگ)**

مامۆستای خوالێخۆش بوو (مەلاّ عبدالكريمی مدرس) لە (کتێبی) نوری ئیسلامدا[3].باسێکی گرنگی نووسیوە جا ئەفەرموێ (باوەڕ بەبوونی

---

(1) بڕوانە پەڕتوکی (نیشانەکانی ڕۆژی دوایی ڕوداوەکانی پێش هاتنی) لە نووسینی (هاوڕێ محمد امین) لەگەلّ دەستکاری خۆم / لاپەڕە/ ٢١٨.

(2) إبن كثير ئەلّێ عەزرەتی (عیسا) لەدوای ژن هێنانی ئینجا ئەچێ بۆ (حەج و عومرە) لە دوای چل سالّ کە(حوکم) ئەکاو ئەژی پاشان کۆچی دوایی ئەکا، گوتراوە لە ژوورەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بەخاك دەسپێردرێت لای گۆڕی پیرۆزی لای هەردوو (شەیخەین) مەبەست حەزرەتی (ابو بکر) و (عومەر)ەوە (خوایان لێ ڕازی بێت).

(3) بڕوانە پەڕتوکی (نوری ئیسلام) دانراوی خوالێخۆش بوو (مەلا عبدالكريمی مدرس) لاپەڕە/٣٧ .

حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێ) لە ئاسمانداو هاتنە خوارەوەی لە ئاخر زەماندا هەرچەند لەم ئاخر زەمانەدا بەعزێ کەس دوودڵی تێدایە بەڵام ئەوە کارێکی دینی و ڕاست و (حەقیقەتە) وەك قورئان ئەفەرموێت ...هتد.) جا عەزرەتی عیسا (ع) بەبێ باوك و بە (قودرەتی) خوا لە سکی دایکیدا پەیدابوو پاش لەدایك بون لە بێشکەدا قسەی کردووە لەگەڵ خەڵکدا و لە قوڕ شتی دروست ئەکرد وەکو (پەڵەوەر) ئینجا فووی پیا ئەکرد بە (ئیزنی) خوا ئەبوو بە پەڵەوەر وە هەروەها کوێری زگماکی چائەکردەوە (بەئەمری) خوداو بەسەدان کوێرو شەڵ و پەککەوتەی چا ئەکردەوە جا بەئیزنی خودا مردووی زیندو ئەکردەوە هەروەها داوای کرد لە خودا سفرەی لە ئاسمانەوە بۆ ناردنە خوارەوە بۆ کۆمەڵەکەی جا زاتێ ئەم هەموو (موعجیزاتەی) بۆ کرابێ ئەگەر لەکاتی هێرشی دووژمنەکان خودا بیپارێزێ لێیان و/ وێنەی بخاتە سەر یەکێکی تر ئەو ڕزگار بکاو بیبا بۆ ئاسمان بەقەدەر موعجیزەیەك لە موعجیزە پێشوەکان وە ئاسمان هەزاران شوێنی تێدایە وەکو عەرزکە بۆ ژیان ئادەمیزادئەشێ ، مەبەست ئەمەیە ئەم جۆرە کارانە هەرچەند بە (عادەت) گرانن بەڵام بە توانایی خودا ئاسانن عەلاوە چەند دەڵیلی ئایەت و حەدیسی لەسەرە، خوایە گیان ئیمان و باوەڕمان هەیە بەوەی کە خۆت فەرمووتە و قورئان فەرموویەتی ڕاست و درووست و گومانی تیانیە..) .

**( پاشکۆی هەموو باسەکان )**

هەروا بێگومان لە نیشانەکانی (قیامەت) دەرچوونی ئوممەتێ لە ئادەمیزادە کە قورئان بە ناوی (یأجوج و مأجوج) ناوی بردوون ، ئەم ئوممەتە لەسەر (تەحقیقاتی) زانایانی دین ئوممەتی (مەنغۆلیان) لە شیمالی

ولاّتی چین له بەینی ئەوان و میللەتی چیندا وارشی (سد) ی (ذي القرنين) دیاره ئەمانه له تاریخی (شەش سەدو پەنجا) ٦٥٠ی/ کۆچی دا دەرچوون بوون به چەند قۆلّ قۆلّێ بۆ هیندستان وقۆلّێ بۆ (روسیا) و قۆلّێ روسیا گەیشتنە بەغدا و دەوڵەتی عەباسی یان فەوتان وهیندستان وروسیایان داگیرکردو تا ماوەیەك مانەوە وە بەشی عێراق موسڵمان بوون).

جا ئەگەر مەبەست له ئایەتی دەرچوونیان ئەم درەچوونە بێ ئەوا باشە ئەگەر نا ئەوانە له (ئاخر زەماندا) جارێکی تر دەرئەچن و (دابة الأرض) که له (نەصصی) ئایەتی قورئانداهەیە پێویستە ئینسانی موسڵمان باوەڕی ببێ بە وانە بەلاّم درێژە ئەحوالی ئەم (دابة الأرض) هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد یاخود (یاجوج و مەئجوج) یا باقی نیشانەکانی حەوالەی (عیلمی خودایە).

## (تێبینەیەکی گرنگ)

جا هەروەها بۆ ئەو ڕاو بۆچوونەی خوالێخۆش بوو مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) هەروەها لای (موفەسیرەکانیش) وەکو (جواهر الطنطاوی وە شەیخی مراغی وە سید قطب) وە زۆرانی تریش ئەم ڕاو بۆچوونەیان هەبووەو جا بۆئەوەی سوود بەخش بێت فەرموو/ لەگەڵ ئەم چەند ئایەتە تەفسیرو ڕاڤەکانی و جا هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴾ چوونکە ذو القرنين گەیشتە دەڤەرۆ لای (ئاجوج و ماجوج) پاش ڕامکردنی ولاّتی خۆر هەلاّت ڕێگەیەکی ترو هۆیەکی تری گرتەبەر بەرەو باکور ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴾ واتە تا

گەیشتە نێوان دوو کێوی گەورە کە لە باکووری ولاتی چین دان و بۆتە جیاکەرەوەی ولاتی چین و مەنغۆلیا وە لە دەوروبەری ئەرمینیا و ئازەربایجان دا ﴿وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا﴾ واتە لە خوارەوەی دوو کێوەکەدا خەڵکانێکی دیت بێجگە لە دوو دەستەکەی تر ﴿لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ لەوانەبوو لە هیچ قسەیەك تێنەگەن واتە خەڵکێکی زمان نەزان و ناتێگەیشتوون و دوور لە شارستانیەت بوون چوونکە لە ناوچەیەکی شاخاوی و دوور لە ئاوەدانی بوون وە ئەو خەڵکە بەدەست دووژمنێکی سەرسەخت بەناوی (یاجوج و ماجوجەوە) گیرۆدە بوون بۆیە کاتێ دەسەلاتەکەی (ذو القرنین) یان دیت خۆرا پەنایان پێ برد ﴿قَالُواْ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ﴾ ووتیان ئەی زولقەرنێن ﴿إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ سوورەتی/ الکهف: ٩٤- ٩٢) واتە بەڕاستی (یاجوج و ماجوج) لەم کاتەدا بەدفەڕو خراپەکارن بەڵێ ئەمانە هەر ئادەمیزادن بەلام سیمایان تێکەو لێکەیەکی وایان هەیە/ کورتە بالایە/ هەیانە/ بالا بەرزە) بەلام گەلێکی تالان کەرو/ دزو جەردەن و/ پیاو کوژن/ هەر چیان بەر لەپ بکەوێ ئەیخۆن و لەناوی ئەبەن (عَنْ زينب بِنْتِ جعشٍ (رضي الله عنها) قَالَتْ : (إسْتَيْقظ النَبّي (صلى الله عليه وسلم) مِنْ نَومِه وَهُوَ مُحمَّر الوَجْه وَهُوَ يَقُول لا إله إلاّ الله وَيْلٌ لِلْعَرَب مِنْ شَرٍّ قَدْ اقْتَربَ فَتْحُ اليَوم مِنْ رَدْم يأجُوج و مَأجُوج مثل هذا وَحَلَقَ قُلْتُ يا رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) أنَهْلِكُ وفينَا الصَّالحُون؟ قَالَ نَعْم إذا كَثُرَ الخُبْثُ) رواه أحمد، واتە: خاتوو زەینەب (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لەخەو بەخەبەر هات کە ڕەنگ و ڕووخساری سوور هەڵگەڕابوو دەیفەرموو هاوار وا وەیلا بۆ (عەرەب) لەو

شەڕو خراپی و بەدفەڕیەی لێیانەوە نزیك بۆتەوە وا ئەمڕۆ دەرگای بەربەستەکە لە (یاجوج ماجوج) دەکرێتەوە وەك ئەو دوو پەنجەیە (پەنجەی گەورەو پەنجەی شایەتمانان) واتە وەکو ژمارە نۆهەت کە لەلای (عەرەب) باو بووە بەو جۆرە یەکتریان لە ژمارە ئاگادار کردووە، خاتوو زەینەب ووتی ئاخۆ ئێمەش تیابچین کە خەڵکانی (صالح و) باشمان لە نێوەندا بێت؟ فەرمووی بەڵێ هەرکات (زیناو فەسادو خراپەکاری) زۆر بوو[١].

## ( پاشکۆ )

هەزار ڕەحمەت لەو کەسەی کە گوتوویەتی :

ئەصڵی پێنجەمینی بە ئیستیقامەت — تەصدیقت ببێ تۆ بە قیامەت
نیشانەی زۆرە ڕۆژی قیامەت — بۆت بەیان دەکەم عومدەی عەلامەت
خەسفێ لە شەرقا خەسفێ لە غەربا — یەك لە جەزیرەی عەرەبی عُەربا
بروزی فیتنەی کوفری سوفیانی — ظهوری مەهدی و مەولای یەمانی
خروجی دەجال گومڕای بەدئەنجام — نزووڵی عیسا بۆ ئەرازی شام
(یاجوج)و (مەئجوج) هەم دابە الأرض — دونیا دەگەڕێن تەواو طول و عەرض
ڕۆژ لە مەغریبو سەر دێنێتە دەر — دوکەڵێك دونیا دەگرێ سەرانسەر
ئاگرێ لە عەدەن باش دەکا ظهور — فإسرافیل يَنْفُخُ في الصَّور
ئەم عەلامانە دێنە جێ یەکسەر — نطق بِهَا صَحِيحُ الأثَر[٢]

(1) بڕوانە/ تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان / لە نووسینی خواڵخۆشبوو/ مامۆستا (ئەحمەد کاکە مەحمود) ، لاپەڕە/ ٤٨٣.

(2) بڕوانە سەرچاوەی ئایین/ دانراوی مامۆستا مەلا(عبدالكريمی مدرس) لاپەڕە /٢٤.

خوایه عەفومان کەی، خوایه رەحمان پێ بکەی خوایه لەکەسو کاری مردومان خۆش بی خوایه له بێ ئەمری خۆت مەحفوزمان بکەی، خوایه دین و ئیمانەکەمان سەلامەت بکەی خوایه له مەیدانی مەحشەرو پردی (سیرات) دەربازمان کەی خوایه له شەڕی شەیتان و بەلای زاڵمان مەحفوزمان بکەی خوایه له فیتنەی ئاخر زەمان و دەجال مەحفوزمان بکەی خوایه له بەلاو موسیبەتی دونیاو قیامەت بمانپارێزی، وبعدُ أعُوذُ بالله منْ الشّيْطانِ الرّجِيم رَبنّا آتنا مِنْ لَدُنْك رَحمَةً وهيء لَنا مِنْ أمْرِنا رُشْداً) نَبهَني اللهُ وإيّاكُمْ مِنْ نَوْمَة الغافلِين وحَشَرَني وإيّاكم تَحْتَ لِواءِ سَيِّد المُرْسَلين).

# ئامۆژگاری پەنجاو حەفت

## باسی هاتنە سەر ڕووی دونیاو لەدایك بوونی ئینسان

الحَمْدُ للهِ ثُمّ الحَمْدُ للهِ مَا تَوفيقيَ ولاَ إعْتِصاميةُ إلاّ باللهِ عَلَيْهِ تَوكَلْتُ وإليهِ أُنيبِ، الحَمْدُ للهِ الذّي خَلَقَ الأنْسانَ منَ العَدم وأشْهَدُ انْ لاَ إله إلاّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرَيكَ لَهُ وأشْهَدُ أنّ سَيّدنَا مُحَمّداً عبْدُه وَرَسُولَهُ بِلا رِيب والصّلاة والسّلام عَلَيْهِ وعَلى آلهِ وأصْحابِه المُجَاهدين إلى يَومْ الدّين) أمّا بَعْد أيّها المُسْلمُوْن أوْصِيكُمْ بِتَقوا اللهِ وطاعتهِ)، واتە: لەپاش هەندێ ئەی موسڵمانینە با بزانین ئینسان چۆن درووست بووە چۆن هاتۆتەسەر ڕووی زەوی و دونیـاوە بـۆچ خوای گەورە ئینسانی خەڵق کردووە جا بێگومان خوای گەورە لە قورئانـدا ئەفەرموێت ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴾ واتـە کاتێك دوورو درێژ بەسەر ئادەمیزادا تێپەڕ بووە بەبێ ئەوەی بوون و ژیانی بووبێت دواتر خودا لە نەبوونەوە هێناویەتیە بوون و ژیاپێ بەخشیوە ، یان ئایە زەمانێك نەبووە کـە ئینـسان لـەو زەمانـەدا نـەبووە ؟ دیـارە لـەپێش خەڵق ئادەمدا سەرتاسەری کوڕەی زەوی ئادەمیزادێکی تێدا نـەبووە ﴿ إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ﴾ سـوورەتی/ الإنسان: ٢) واتە ئێمە ئەوئادەمیزادەمان لـە نەبوونـەوە درووسـت کـرد لـە دڵۆپە ئاوێك کە لـە پیـاو دەردەچـێ وە تێکـەڵاوی (هێلکۆکـەی) ژن دەبـێ یەکتر دەگرن بۆیەشمان درووست کردووە تاکو تاقی بکەینەوە وامان لێکرد ئەو مرۆڤە هەستی بیستن و بینینی هەبێ وە تێگەیشتنو هۆشی هەبێ تاکو

بتوانێ شتی چاك و خراپ ببیسێ و ببینێ بەهۆش و عەقلی خۆی لێکی جیا کاتەوە .

**( بەڕاستی بەدیهێنانی ئینسان نیشانەی دەسەلاتی خوایە )**

جا هەروەها بێگومان خوای بەدەسەلات لە سورەتی (المؤمنون) دائەفەرموێت ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾ سوورەتی/ المؤمنون: ١٢) واتە: بێگومان ئێمە مرۆڤی یەکەممان (حەزرەتی ئادەم) لە پالاوتەو پوختەیەك لەو قوڕ بەدی هێنا، ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾ سوورەتی/ المؤمنون: ١٣)اتە لەپاشان نەوەکەیمان کرد بە تنۆکە ئاوێك (نوتفە) وە لە بنکەو قەرارگایەکی زۆر (مەحکەمدا) دامان بەزاند لەنگەرمان پێ گرت کەواتە خستمانە جێگایەکی زۆر ئارام وەزۆر (قایم) کە منداڵدانە ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾ واتە لەپاشا مەنیە کەمان کرد بە خوێن پارەیەك وە خۆی بە دیواری منداڵدانـدا هەڵواسی ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾ واتە: خوێنبارەکەشمان کرد بە گۆشتپارەیەك ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا ﴾ جا ئەو پارچە گۆشتەشمان کرد بە کرۆك و ئێسك خانەکانی ئێسکمان تێدا درووست کرد ﴿ فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ﴾ ئینجا گۆشتمان کرد بەبەر ئێسکەکاندا. بەڵێ چەندین ساڵە قورئان ئەم ڕاستیەی تۆمار کردووە کە خانەکانی ئێسك بەر لە خانەکانی گۆشت پێك دێن ئەمەش تازە زانیاری درکی پێکردووە.

**( ئاگاداریيەك )**

(عبـدالله)ی کـوڕی مەسـعود (رەزای خـوای لێبێـت) دەڵێـت پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إنّ أحَدُكم لِيَجْمَع خَلْقَهُ في بَطْنِ اُمّهِ في أرْبَعين يَوماً ثُـمَ يَكُونُ عَلَقةً مِثلَ ذلك ثُمّ يَكُـونَ مُـضَخةً مثْـلَ ذلـك ثـم يرسـل الله اليـه الملـك فَيَنْفخَ فيه الرّوح (ويؤمَر بأرْبع كَلِمات رِزقهُ و أجَلهُ وَ عَمَلَه وَهَلْ هُوَ شَـقيٌ أو سعيدٌ) رواه البخاري، واتەبێگومان هەر یەك لە ئێوە چل ڕۆژ بـە نوتفـەیی لەمنداڵدانی دایکیـدا دەمینێتـەوە، دیـسان چـل ڕۆژی تـر بـە خوێنپـارەیی ئەوساکە بووە گۆشت پارەش هەروا واتە تـا ئـەو سـێ سـەدو بیـست ڕۆژە دەبڕێ یان دەلێین چوار مـانگ دەچـێ ئینجـا خـوای بـالا دەسـت فریـشتە دەنێرێ و فووی پیا دەکا (روح) دەکرێ بە بەریا ، ئـیتر هـەر لـەو کاتـەوە چوار شتی بۆ دیاری دەکرێ ڕزق و ڕۆزی و تەمەن و ئاکامی کارو کردەوەی چارەنووسی بەدبەختە / یان بـەختیارە/ جـا هـەروەها ئەفـەرموێت ﴿ ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَ ﴾واتـە پاشـان کردمانـە شـێوەی درووسـتکراوێکی تـر واتەگیانمان کرد بەبەردا بەڵێ ئادەمیزاد ئا بەم شـێوەیە درووسـت کـراوە قورئان باسی ئەکات بۆمان هەروەك گیان لەبەرانی تر، بەلاّم خوای گـەورە هەندێ شتی تایبەتی بەخشیوە لـە ئـاژەڵ جیـای کـردووە ئـاژەڵ هـەر لـە جێگـای خۆیـدا مایـەوە وەك قورئـان ئەفـەرموێت ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴾ واتە بەڕاستی ئادەمیزادزۆر گەورەو پڕ بەرەکەتە ئەو خوایـەی کە باشترینی درووست کەرانەهـەر ئەویـشە دەسـت ڕەنگـین، جـا هـەروەها بێگومان ئەوخوایـە گـەورە و بەدەسـلاتە بـەو تنۆکـە ئـاوە/ئـەو قوناخانـە

دەبڕیٚ پاشان ئەبێتە ئـەو مرۆڤـە و گیـان ئـەکات بەبـەریا ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴾ واتــە پاشــان بەڕاســتی دوای ئــەو هــەموو ژیــان وبڕینــی قۆناغانــە ئێــوە گــشت ئــەمرن ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ ﴾ سوورەتی/المؤمنون:١٢– ١٦ ) واتە: دوایی بۆ جارێکی تـر هـەر ئێـوە لـە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێنەوە/ وە گیان دەکرێتەوە بە بەرتانا.

جا هەروەها بێگومان خوای گەورە لـەم چـەند ئایەتانـەش لـە سـورەی طـارق دا ئەفـەرموێت ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴾ جـا بـا مـرۆڤ تەماشـا بکـە لەچی درووست کراوە ..؟ ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٖ دَافِقٖ ﴾ واتە لـە ئاویـچکی ملقـدەر درووسـت کـراوە ﴿ يَخۡرُجُ مِنۢ بَيۡنِ ٱلصُّلۡبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴾ واتــە لـە نێـوان بڕبڕەکـانی پشتی پیـاو و/ ئێـسکەکانی سـنگی (ژن) ەوە/ دەردەچـێت ﴿ إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجۡعِهِۦ لَقَادِرٞ ﴾ الطارق:٦– ٨).

واتە بەڕاستی ئەو خوایە دووبارە بۆ درووست کردنەوەی زۆر بەتوانایەو دەتـوانیٚ زۆربەئاسـانی پـاش مردنـی وەك خـۆی لێبکاتـەوە واتـە خوایـەك هێندە دەسەلاٚتی هەبێت کە ئا بەوشێوەیە ئادەمیزاد درووست بکـات ئـەی چۆن لێی نایەت دیسانەوە زیندووی بکاتەوە .

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا هەروەها بێگومان هەق وایە ئادەمزیاد بیر لە گەورەیی خودا بکاتەوە کە چۆن درووستی کردووە ئەو خوایە بە دەسەڵاتە، لە دوو (قەترە) ئاوی پشتی باوك و سنگی دایك کە لە ڕەحمدا تێکەڵ دەبن دەبێتە نوتفەو پارچە خوێنێکی سوور لە پاشان دەبێتە پارچەیەك گۆشت، بەڵام تۆ وەرە بیر لە گەورەیی (قودرەتی خوا بکەوە) بزانە چۆن لەو پارچە (مەنیە) ڕەگ و دەمارو ئێسقان و گۆشت و خوێن و پیست و موو و ئەعزاو ئەندام درووست دەکا زۆربەیان تا (نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ) لەو مەنزڵە تاریکەدا دەمێننەوە، ئینجا بە (ئەمری) خوا ئەویش بە جێ دەهێڵن وە دێنە (مەنزڵی) دونیاوە/ جا هەروەها دەبینی زۆری پێ ناچێ خوای گەورە لەیەك (قەترە) ئاو بەدەستی قودرەت دەیکا بە/ ڕۆح لەبەرێك و/ منداڵێکی ڕێك وپێك، (سوبحان الله) لە حەزەمەتو گەورەیی ئەو خودایە، کە هەر لەو دوو (قەترە) ئاوە چەندین ئەعزاو ئەندامی نهێنی و ئاشکرای درووست کردووە، سەری ئینسانی بە خڕی درووست کردووە وە چاوو گوێ و لووت و دەمی بۆ درووست کردووە لە کێووشاخی سەردا سەرچاوەی ئاوی (تاڵ وسوێرو شیرین و بۆگەنی تێدایە) بەچاو ببینن بە گوێ ببیستن وە بە لووت بۆن بکەن وە بە زمان بچێژن وە بەدەم و زمان و ددان و لێو قسە دەکا، هەر لە دوو (قەترە) ئاو بەو نەرمیە ئێسقانی بەو ڕەقیە درووست کردووە وە کردویەتی بە کۆڵەکەو (عەمودی) بەدەنی ئینسان ئەگەر هەیکەلی ئیسنان بێ ئێسقان بوایە نەیدەتوانی ڕاوەستێ جا هەروەها بێگومان ئەو ئێسقانەش چەند جۆریان هەیە وە لەسەر چەند شکل و هەندەسەی جیاواز

درووست کراون هەندێك باریك و/ بەعزێ ئەستوور هەیانە درێژە ئی وا هەیە پانە ئەگەر ئێسقانی بەدەنی ئیسنان هەر یەك پارچە بوایە گەڕانی بۆ نەدەکرا، تەماشا بکە هەر قامکێکی لە چەند دروست کردووە، هەموو ئینسانێك (دوو سەت) پارچە ئێسقان و (سێ سەت و شێست) ڕەگ و دەماری بۆڕی ئاوو خوێنی تێدایە بۆ ئەوەی ئاوو خوێن بەتەواوی بە بەدەنی بگەیەنن جا بێگومان بڕوانە ڕێزی ئەو ددانانە کە وەك سەدەف و مرواری لە ناوەدەمدا بۆی داناوە بەعزێك بۆ بڕین و /هەندێك بۆ هاڕین و/ ئینجا بڕۆوانە جوانی دەست و پێو هاتوچۆیان، یان وەرە بیر لە دڵ و (مەعیدە) و جەرگ و سپڵ و ڕیخۆڵەو ڕەحم و میزڵدان و زراو بکەو هەر یەکە لەسەر شکلێك هەر یەکەو کارێکی تایبەتی دەکەن ئەدی بزانە چ نازو نیعمەتێکی گەورەیە خوای گەورە ئەو عەقڵ و شعورەی دایتە تۆ چوونکە بەڕاستی ئەمە نیعمەتێکی زۆر گەورەیە بڕوانە خوای پەروەردگار زیاد لەهەموو گیان لەبەرێك تۆی چۆن وەك داری ڕاست درووست کردووە ئەوان بە خواری هەموو گیان لەبەرێك دەبێ بۆ خواردن دەم بۆ خواردنەکەی بەرێ وەسەردانەوێنێ بەڵام تۆ خواردنەکە دەبەیتە پێش خۆت، یا بنی ئادەم کە لە دایك ببوو پێویستی بە خواردن دەبێت بە تایبەتی ئەو مەلۆتکەی کە تازە لەدایك دەبێ ئینجا پێویستی بە خواردن دەبێ مژین فێر دەکا چوونکە ددانی نەڕواون وە شتی ڕەقی پێ ناخورێ شیر لەو (مەمکە) نەرمو شلانە بۆ پەیدا کردووە تا زەحمەتی پێ نەگا، واشی درووست کدرووە تا نەیان مژێ شیریان لێ نایە جا یەکێ لە (حیکمەتەکانی) ئەو شیرەش ئەوەیە بە هاوینان ساردو فێنکەو بە

زستانانیش گەرمە وە شیرینە (سبحان الله) لەو خودایە ئیشی چەندجوان و دێرینە کردەوەکانی بۆ بەندەی خۆی هەمووی زێرینە شیرینە.

جا هەروەها ئەگەر ئەو منالە گەورە بوو زیاتر پێویستی بەو خواردن دەبێ ئەوجا ددانی بۆ دەڕوێنێ تا بتوانێ شتی ڕەقیشی پێ بخوات و بیجوێ، (خولاصەی کەلام) ئەوە بەشەرە لە تەوقی سەرەی ڕا تا بەری پێیانی پڕە لە شتی (عەجایب و غەرایب)، جا بەڕاستی ئیسنان تێیدا مات و سەرگەردانە بتەوێ و نەتەوێ پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێ ئەوەی تۆ ئاگات لێی بێ و ئەوەی ئاگات لێی نەبێ چوونکە خوا ئاوای درووست کردووی، جا بێگومان مانگ و ڕۆژو هەورو باو ئاسمان وئەستێرەو کوڕەی زەوی وەگەڕ خستووە تا تۆ نانێك بەدەست بێنی و بە (غافلی) لەخوا نەیخۆی وەك شێخی سەعدی لە پەرتوکی گوڵستان[1] دا ئەفەرموێت :—

أبرُوُ بَادُو مەو خورشیدَ و فَلَك درکارند تانُو نانی به کَفْ أري و به غَفْلَت نخوری

هَمَهْ أزْ بهِر تو سرگشته و فەرمانبرادر شرط إنصاف نبا شد که تو فەرمان نبری

واتە: هەورو با لە گەڵ مانگ و ڕۆژ و ئاسمان هەموویان لە ئیش و کارن هەتا تۆ نانێکپەیدا بکەی و بەبێ ئاگایی و بێ هۆشی نەیخۆی، هەروەها بۆتۆ دێن و دەچن و فەرمانی خوا بەجێ دێنن و بەلام جێگای داخە کە تۆ بێ (ئەمری) واتە بێ فەرمانی پەروەردگارت بکەی وە سوپاسگوزاری نازو نیعمەتی خوای گەورە جێ بەجێ نەکەیت.

(١) بروانە پەرتوکی: (گوڵستانی شێخ مصلح الدین) لە دانراوی /سعدی شیرازی/لاپەڕە ١٠.

**( پاشکۆ )**

جا هەورەها بێگومان پێویستە ئادەمیزاد بەتەواوی خوای خۆی بناسێ وەبێ فەرمانی نەکات و لەخۆبایی نەبێ وە هەڵنەخەڵەتێ و نەگۆڕێ و بەسەهو نەچێ؟ چوونکە (کافر وە زندیقیش) سەرو سورەتیان هەیە وەك تۆ بەلام تۆ دەبێ زۆر ئاگات لەخۆ بێ لە کردەوەو خوڕەوشتدا فەرقو جیاوازیت هەبێ چوونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: (ئێمە ڕێزمان لەئینسانی ئیماندار گرتووە) هەروەها ئینسانمان وەك (حەیوانات) و ئاژەڵ درووست نەکردووە (هەر بخواو بخواتەوەو) بخەوێ و پاڵداتەوە بەڵکو وەکو ئایەتەکەی پێشوو ئەفەرموێت ﴿نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا﴾ سوورەتی/ الإنسان: ٢) واتە ئینسان تاقی دەکەینەوە بەهۆی پێغەمبەران، وە یاساو دەستوری ئاسمانیان بۆ دەنێرین تا بزانی ئاخۆ بە قسەمان دەکەن یان لە قسەمان دەچنە دەر هەر لەبەر ئەو تاقیکردنەوەیە کە قوەی عەقل و ژیری و زانیاریمان داوەتێ تا ڕێگای خێرو شەڕو چاکەو خراپی پێ لێك جیاوەکەین وە بزانین جا لەبەر ئەم گرنیگیەیە کە قورئان ئەفەرموێت ﴿إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ﴾ سوورەتی/ الإنسان: ٣) چوونکە بەهۆی دین و ئایین و پێغەمبەرانەوە ڕێگای ڕاستمان نیشانەی بەرەی ئادەمیزاد داوە جا ئەگەر بە ڕێگای دین و ئاییندا ڕۆیشتن ئەوا شوکرانەی نازو نیعەتی خوایان کردووە وە بەهەشتی دەدەینێ لە دوارۆژدابەلأم ئەگەر (کوفرانی) نازو نیعمەتی خواش بکەن ئەوا بێگومان دەچنە جەهەنەم و دۆزەخ.

هەزار ڕەحمەت لەو كەسەی كە ووتویەتی :

| | |
|---|---|
| قەت غافڵ مەبن لە شوكری نیعمەت | خصوص نیعمەتی ئەمان و صحت |
| قەدری عافیەت كەسێ ئەیزانی | گیرۆدە بوبێ بە ئێشو زەحمەت |
| پێویستە سوپاس بە فەرمانی دین | یەكەم بۆ خودای جیهان ئافەرین |
| دووەم بەرامبەر بە فەخری ڕەسول | لەگەل یاران و ئالو تابعین |
| سێهەم و چوارەم بۆ دایك و بۆ باب | سوپاس واجبە بەنەصی كتاب |
| كەی ڕەوای حەقە سوپاسیان نەكەی | گەر بە بونیادەم خۆت ئەكەی حیساب |
| پێنجەم سوپاسی ئوستادی بەرزە | ئەتكا بە زانا لەسەر ئەم ئەرزە |
| شەشەم ئەو كەسەی كەوا بە ڕەحمەت | پەروەردەت ئەكا بە نازو نیعمەت |
| حەوتەم ئەو كەسەی ڕزگارت ئەكا | كاتی لێقەومان لە دەردو زەحمەت |

(خوایە عەفومان بكەی خوایە لە گوناهەكانمان ببورە خوایە موسڵمانان سەربەرزو سەركەوتوو بكە، حاڵیان چاك بكەو دوعایان قەبوڵ بكە (أقُولُ قَوْلِي هذا وأسْتَغْفِر الله العَظيم وأعُوذُ باللهِ مِنْ الشّيطان الرّجيم ربنّا آتِينا في الدّنيا حَسَنَةً وفي الأخرة حَسَنَةً وقِنا عَذَاب النار) آمين، نبهني الله وأياكم من نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين.

# ئامۆژگاری پەنجاو هەشت

## باسی هەرکە هاتیە سەر دونیاوە لە پاشان باسی قەبرو گۆڕ ئەکات

الحَمْدُ للهِ ثُمّ الحَمْدُ للهِ مَا تَوْفقي ولاَ اعتصامية الاّ باللهِ عَلَيْه تَوكّلت وإليه أُنيب الحَمْد لله الذّي خَلَق المَوْتَ والحَياة لِيَبْلُوكُمْ أيّكم أحْسَنُ عمَلاً وقوله تعـــــالى: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةًۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴾ وأشْهَدُ انْ لاَ إلهَ إلاّ الله وحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَد انّ سَيدنا مُحَمَداً عَبْدهُ ورَسُوله والصّلاة والسّلام عّليهِ وعلى آلهِ وأصْحابهِ إلى يوم الدين (أمّا بَعْد أيّها المُسْلِمُون أوْصيكم بتَقوا الله وطاعته في جميع أوقاتكم)، واتە لە پاش هەندێ ئەی موسڵمانەکان وەسیەتان لێدەکەم بەتەقوای خوداو ملکەچی خوداو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا لە هەموو کاتێك و ساتێکدا جا هەروەها ئەی گوێگری موسڵمان بزانن خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ ﴾ واتە دڵنیابن لەهەر جێگایەك بن مردن پێتان دەگات ﴿ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٖ مُّشَيَّدَةٖ ﴾ سوورەتی/ النساء: ٧٨ ) واتە ئەگەر با لە (قەسری) زۆر قایمیش دابن یان ئەگەر لەناو کۆشك و قەڵای سەخت وقایمیش دابن هەر دەمرن چوونکە کەس لەدەستی (ئەجەل) ڕزگاری نابێ وە قوتاری نابێ جا هەروەها بێگومان لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ كُلُّ نَفْسٖ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ

﴿ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾ سوورەتی/ آل عمران: ١٨٥ ) واتە : هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت تەنها لە رۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بە تەواوی پێ دەدرێت ، چوونکە دەرئەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە رێتان ، جا هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا پێمان ئەفەرموێت :

﴿ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُۥ ﴾ واتە ئادەمیزاد بۆ بیرناکاتەوە وە بزانێ خوا لەچی دروستی کردووە ....؟)

﴿ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴾ واتە لە دلۆپە ئاوێکی هەڵقولاوە دروستی کردووە جا ئەندازەی گرتوەو بەچەند قۆناغێکا تێی پەڕاندو رێکی خست بەڵێ لە منداڵداندا دلۆپە ئاوێك بوو جا بووە خوێن پارە ئەوسا کردیە گۆشت پارەو ئەندازە گیریەکی ووردی کردو هێنایە دونیاوە ﴿ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴾ واتە : لەوەو دوا رێگە بۆ خۆش و ئاسان کرد تا لە سکی دیاکی بێتە دەرەوە، یا هەندێ لە (موفەسیرەکان) بەم جۆرە تەفسیری دەکەن (ئینجا رێگای ڕاست و دین و ئیمانی بەهۆی پێغەمبەرانەوە نیشان دەدا وەك (موجاهید لە ئیبن و عەبباس (ریوایەتی) کردووە دەڵێ ﴿ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴾ وەك ئایەتی ﴿ إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴾ وایە ، هەروەکو لەپێشەوە باسمان کرد واتە خوای گەورە سەرپشکی هەردوو رێگایەکەی کردو ﴿ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴾ واتە پاشان دەیمرێنێت و بە فەرمانی خۆی لە گۆری دەنێت ، لەبەر رێز لێنان ولەبەر ئەوەی کە درندەو شتی وا نەیخوات ﴿ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴾ سوورەتی عبس:١٨ – ٢٢واتە : پاشان کاتێك بیەوێ دوای مردنی زیندووی دەکاتەوە .

## (سەرنجێکی گرنگ)

جا بێگومان فەرمانێکی خوداییە هەموو کەس دەیگرێتەوە بەبێ جیاوازی (مەلیك) ئەبیٚ بمرێت پادشا و گەدا بی ئەبێ بمرێت بەلاّم دەبێ ئەوەش بزانین مردن (سەفەرێکی) دوورو درێژە ئەزیەت و ئازارو کۆسپ و بەربەستی زۆرە/ چوونکە بێگومان (مردن) قیامەتی بچووکە بۆ مرۆڤ، بەهۆی ئەو شتانەی نەیدەزانین بۆی ئاشکرا دەبن ، چوونکە بەڕاستی مردن میوانێکی لە ناکاوەو کەس نازانێت کەی دەگاتە جێ و دەبێتو هەموو دەمێك خۆی بۆ ئامادەو حازر بکەین وەکو ئەسحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆیان بۆ مردن حازرو (مەهەییّا) کردبوو هەرکاتێك تووشی نەخۆشیەك و یان تووشی تاو لەرزێك بوونایە دەیانگووت (مرحباً بالموت) واتە ئەیان گووت یاخوا بەخێربێ ی ئەی مردن .

بەلاّم بەداخەوە شەیتانی (لەعین) واتە نەفرەتی چەند کەسانێکی (مەغرور) کردووە هەروەها بەبێ ئاگان لەو مردنە سامناکەو جا ئەڵێن بەم جۆرە کەسانەی کە بێئاگان لە مردن و دوارۆژیان (أيْنَ آدمَ الذّي خلَقَهُ وأصْطَفاهُ وَجَعَل الجنّة منْزلهُ وَمَثْواهُ أيْنَ نُوح الذّي وَهَبَهُ اللهُ عُمْراً طويلاً وَمن المَوتِ مَا عَافَاهُ، أيْنَ موسى بِن عِمْرانَ الذّي كَلّمهُ اللهُ علَى جَبَلِ الطُور ونَاجاهُ، أيْنَ دَاود الذّي ألآنَ لَهُ الحَديدَ وبنِعْمَته أرْضاهُ، أيْن سُلَيْمان الذّي وَهبَهُ اللهُ مُلْكاً لا يَنْبَغي لأحدٍ سِواهُ، أيْن عِيسى إبْن مَرْيم الذّي كانَ يُبرِيءُ الأكمة والأبرص ويَحْي المَوتّى بإذنِ اللهِ أيْن سَيّدنا مُحَمَد (صلى الله عليه

وسلم) أسرى بهِ وقرّ بهِ وأدْناهَ ولمْ يكُنْ أحدٌ أعَزَ منْهُ علـى مـولاهُ)[1] واتـه: كوا ئادەم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) کە خودا خەڵقی کردو کردی بە پێغەمبەر و گەورەی کرد ئینجا بەهەشتی پان و بەرینی کردە جێگای)

هەروەها کوا نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) کە خودا تەمەنێکی پێداو مێژوو نووسان ئەڵێن تەمەنی/ ١٥٠٠ ساڵ بـووە/ ئـەوجا لـە مـردنیش ڕزگاری نەبوو (ئاخیری) هەر مرد، ئینجا کوانێ حەزرەتی (موسـای کـوڕی) (عمران) کە خوا قسەی لەگەڵ کرد لەسەر کێوی تور، ئەی کوانێ حەزرەتی داود (علیه السلام) کـە خـوای گـەورە ئاسـنی بـۆ وەکـو هـەویر لێکردبـوو، ئەوجا کـوانێ (سـولەیمانی کـوڕی داود) کـە خـوا مـولکێکی زۆری پێـدابوو ئەوەی دابووی بە ئەو نەیـدابوو بەهـەموو کەسـێك ئینجـا کـوانێ عـەزرەتی عیسا (علیه السلام) کە (گوڵ و بەڵەکی) بە (ئەمری) خودا چاك دەکردەوە هـەروەها مـردووی زینـدوو دەکـردەوە، ئـەوجا کـوانێ حـەزرەتی (محمـد المصطفی) کە خـوا شـەو ڕەوی پێکـردو ئینجـا بـانگی لای خـۆی کـرد زۆر نزیکی کردەوە لەخۆی بەڵێ، ئەو هەموو (پێغەمبەرە نازدارانـە) هـەموویان وەفاتیان کردوو خوای گەورە بۆلا خۆی بردنەوە ئەوجا لە مردن نـەجاتیان نەبوو بەڵێ ئەوەیە مردن هەر ژیانێك خـۆش بـوو تـاڵی دەکـات ، هـەر بنـە دارێك بەرز بوو نزمی دەکات هەرکۆشـك و تـەلارێك درووسـتکرا ئـیلا تێکـی دەداو خراپی دەگات وەکو خوا خۆی لە قورائاندا ئەفەرموێت ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾ واتە هەرچی بەسەر پشتی زەویەوەیە ئادەمیزاد بێت یان گیانلەبـەر

(1) بڕوانە/ پەرتوکی/ (خطب إبن نباته) دانراوی (الشیخ عبدالرحیم بن محمد بن اسماعیل)، لاپەڕە/ ٣٠.

هەرهـــــەمووی لـــــەنێو دەچـــــێ ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴾ سـوورەتی/ الـرحمن/٢٦- ٢٧) واتــە تــەنها ڕووی پــەروەردگاری خـاوەن شـکۆو بەخـشندەیە، تـەنها زاتـی پـەروەردگار دەمینێتـەوە کـە خـاوەنی گەورەیی یەو پێویستی بە هیچ شتێك نی یە/ چوونکە ئەو خودایـە شـیاوی ئەوەیە بەندایەتی بۆ بکرێ / بەگەورەو شکۆمەند بناسرێ /خودای خـاوەن تواناو مەزن / فەیزو چـاکەی گـشتی هەیـە / شـایەنی ئەوەیـە بـە پـاکی و بێگەردی (عیبادەتی) بۆ بکرێ و بە ئیخلاسی بپەرستریّ). .

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان پێغەمبـەری خۆشەویستمان (سـەلأت و سـەلامی خوای لەسەربێ) ئەفەرموێت (الكيسُ من دانَ نفسهُ وَعَمَـل لمـا بعـدَ المَـوت والعَاجِز مَنْ إتّبعَ نَفْسهُ هَواهَا وَتَمَنى عَلى الله الأمانيّ) رواه الترمـذي وأحمـد والحـاكم وإبـن ماجـة/ واتـە: (ژیـرو (عاقـل) واتـە هۆشمەنـد ئـەو کەسـەیە (موحاســەبەی) نــەفس و ئـارەزووی خـۆی بکـا بـۆ دوای مـردن کاربکـا و زەخیرە دابنیّ/ وە گێل و پەك کەوتوو ئەوکەسەیە بەدوای ئـارزەوی خـۆی بکەوێ وەبەتەمای ئەوەبێ خوا لێـی خـۆش بـێ) دیـسان حـەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت: (ما مِنْ أحدٍ يَمُوتُ إلاّ نَدَم قَالوا ومَا نَدَامَته يَا رَسُول الله (صـلى الله عليه وسلم)؟ قالَ إنْ كَانَ مُحْسناً نَدَم أنْ لايَكُون أزدادَ وإنْ كَـانَ مُـسيئاً نَدمَ أنْ يلا يَكُونَ نَزُعَّ) رواه الترمذي والبيهقـي/واتـە: کـەس نییـە نـەمرێ و پەشیمان نەبێتەوە گووتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا پەشـیمان بوونەکـەی لەچی یە؟ فەرمووی ئەگەر چاکەکار بـووبێ پەشـیمانە لـەوەی کـە زیـاتری

نەکردووە، وە ئەگەر خراپە کار بووبێ پەشیمانە لەوەی کە وازی نەهێناوە وە تۆبەی نەکردووە لە گوناهان)، خوایە عەفومان بکەی/خوایە لەسەرە مەرگا ئیمانمان بەنسیب بکەی/خوایە بە ئاسانی رۆح و گیانمان بکێشی، (أَقُولُ قَوْلي هذا واسْتَغْفِر الله لي ولَكُم ولِسائر المُسْلمين/رَبَنّا اكْشِفْ عَنّا العذاب إنّا مُؤمنينَ، نَبَهَني الله وإيّاكُم منْ نَومة الغَافلين وَحَشَرني وإيّاكم تَحْتَ لِواءِ سَيِّد المُرْسَلينْ اللهُمَ إغفر لَنا آمين).

# ئامۆژگاری پەنجاو نۆ

## باسی سەبرکردن لەسەر بەلاو موصیبەت ئەکا

الحَمْدُ للهِ الذّي أمَرَ المُسْلمِينَ بِما أمَرَ بِهِ المُرْسَلِين وجَعَلَ الصّبْر مِنْ صِفَات أهْل اليَقِينْ وَحَثّهُم عَلَيْهِ فِي مُحْكَمِ الذّكرِ المُبِينْ بِقولِهِ تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾ وقولـه تعـالى ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ نَحْمَدُهُ تَعالى ونَسْألهُ العَفْوَ والعَافيـةَ والهِدايـةَ إلى أقْـومِ سـبِيل وأشْهدُ أنْ لاَ إلهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لاَشَرِيك لَهُ أمَرَنا بِالـصّبْر وَوَعَـدَ عَلَيْـهِ بـالثّواب الجَزيل ونَشْهَدُأنّ سَيِّدنَا مُحَمَداً عبْـدَهُ وَرُوسِـلِه المَـأمُور بِالـصّبر الجَمِيـل في مُحكم التَنْزِيل الذّي جَعَل الصّبْر مِفْتاحُ الفَرَج والـصّلاةُ والـسّلام عَلـى سَـيّدنَا مُحَمَد وعَلى آلهِ وأصْحابهِ وأتْباعـهِ الـصّابِرينْ إلى يَـوم الـدّين (أمّـا بَعْـد أيّهـا المُؤمنون أوْصِيكُمْ بِتَقوا اللهِ وطَاعَتهِ)، واتە: لە پاش هەندێ ئەی موسڵمانە خاوەن باوەڕەکان وەسیەتان لێ دەکەم بە تەقوای خواو پەیڕەوی کـردن و وەجێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودای گـەورە، جـا هـەروەها بـزانن کـە ئادەمیزاد لە ماوەی ژیانیـدا یـان لـە حـاڵی خۆشـی و سـاغی و سـەلامەتی و(صیحەتی) بەدەن و دەوڵەمەندی دا دەژی یان فەقیرو نەخۆش و نەساغە وتووشی هەزاران بـەلاو موصـیبەت بـووەو دەبـێ جـا بێگومـان موسـڵمانی تـەواو دەبـێ لـە هـەموو کـاتێ (فـەرەحی) و ناخۆشـی وخۆشـی و سـاغ و سـەلامەتیدا، (شـوکرانەی نیعمـەتی) خـوا بکـا هـەروەها ڕازی بێـت

بەهەمووشێوەیەك ئەگەر (فەقیرە) یان نەخۆشە یا بەلاو موسیبەتێكی بەسەر دا هاتووە یان تووشی تەنگ و چەڵەمەیەك بووە و دەبێ لەسەر ئەو (بەلاو موصیبەت) و تەنگ و چەڵەمەو هەژاری و نەداریە خۆڕاگرو سابیر بێ هەتاخوای گەورە (ئەجر) و پاداشتی بداتەوە وە لەپاشان بەهەشتی پێئەداو لەناو نازو نیعمەتی خوادائەمینێتەوە هەتا هەتایێ و جا هەروەها خاوەن باوەڕانم ووشەی (صەبر) لەقورئانی پیرۆزدا لە (حەفتا جار) زیاتر هاتووە بەچەند مەعنا وجۆر بەلام لەو ووتارەدا بە واتای خۆڕاگرتن لەسەر (تاعەت و عیبادەت) و بەلاو (موصیبەت) ئێمە لەسەری دەڕۆین / برایانی خاوەن باوەڕم/ پێویستە ئێمە بزانین كە بەلاو موسیبەت (تاقی كردنەوەی بەشەرە/ لەلایەن خوداوە/ هەروەك خوای گەورە لە سورەتی (البقرة)دا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ﴾قالَ المفسرون: المعنى أي لِتُصيبَنّكُمْ ولنَخْتَبرَنّكُمْ يا أمّة مُحَمَدْ بالخَوْفِ مِنَ اللهِ أوْ مِنَ عدوٍّوالجُوع مِنْ القَحْطِ وتَعَذّرِ حَصُولِ القوت أوْ مِنَ الجُوعِ بِسَبَبِ صِيَّام رَمَضان وَنَقصٍ فِي الأمْوالِ بِضياعِها وبالهَلاك والخُسْرانِ ومَوْت المَواشِي وتَلْفِ الأموال وفِي الأنفْسِ بالمَوتِ أي بِمَوْتِكُمْ أوْ مَوْتِ أوْلادِكُمْ أوْ مَوتُ أقْربَائِكمْ أوْ بِالقَتْل أو المَرضِ أوْ الشَيْب وفِي الثَمرات بِقَلتها)[1]، واتە: بێگومان دووچاری هەندێك حالەتی ناخۆشتان دەكەم وەك كەم بوونەوەی خواردن و میوەهات و سەروەت و سامان و لەدەست دانی چەند كەسێكی خۆشەویست تان دەبێت ئارام بگرن خۆڕاگربن ئەی

(1) بڕوانە (الكشف والبیان في تفسیر القرآن - المعروف تفسیر الثعلبي) بەرگی یەكەم لاپەرە/٢١٨.

پێغەمبەر (ﷺ) پووختەی ماناکەی ئەوەیە، واتە ئەی ئومەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بە ترسان لەخواو لەئاگری دۆزەخ وە هەروەها بە ترسان لە دوژمن بە برسیەتی بەهۆی گرانیەوە یان بەهۆی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانەوە، تووشی هەژاری و دەست کورتیتان دەکەین بە ماڵ سووتاندن وبەتاڵان کردن و مردن بە هۆی زەرەر لە کەسابەتدا تاقیتان دەکەینەوە بەژن مردن و کورو کچ مردن و (باو ك و دایك) مردن وخزم مردن بە کوشتنی خزم وکەس و کارو بە نەخۆشی و بە پیری و بەکەمی ڕزق و ڕۆزی و بەبێ بەری دەغڵ و دان و باغ و باغات هەروەها بەکەمی (واریدات) دڵتان تەنگ دەکەین جا ئەگەر لەسەر ئەوو بەڵاو موسیبەتانە شوکرانەتان کرد خۆڕاگر بوون بەوە ئەوجا خوای گەورە دەفەرموێت﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴾ سوورەتی/ البقرة: ١٥٥ – ١٥٦) واتە: ئەی پێغەمبەر موژدەی پاداشتی گەورەو سەرکەتن بدە بەو کەسانەی (صەبریان) هەیەو بەرگەی ئەو بەڵاو نارەحەتیانە دەگرن یا موژدە بدە ئەی (محمد) بەو کەسانەی کە تووشی (موصیبەت) دەبن و خۆڕاگرن ودەڵێن خۆمان و ماڵ وسەروەت و خزم و کەس و/ کارمان هەموو/ ئی خوایەو (راجیعە) وەلای خوا ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴾ سوورەتی/ البقرة: ١٥٧) واتە ڕەزامەندی (ڕەحمەتی) خودا بۆئەوانەیە بەڕاستی ئەوانە ڕێگای ڕاستیان دۆزیوەتەوە (هیدایەت) دراون)

## (چەند فەرمودیەکی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی صەبرەوە)

ئیمامی طبرانی ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێناویەتی ئەڵێ (الصّبْرُ نصْفُ الإيمان) واتە: ئارام و خۆڕاگرتن نیوەی باوەڕە هەروەکو لەپێشەوە باس کراوە بەڵام لە (ڕیوایەتێکی) تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الإيمانُ نِصْفَانِ نِصْفٌ صَبْرٌ ونصْفٌ شكرٌ) واتە: ئیمان باوەڕی دوو بەشە بەشێکیان سەبرەو بەشێکیان شوکرە واتە سوپاسگوزاری، جا هەروەها بێگومان سەرنج بدەو بڕوانە ئەوتا پێغەمبەران (عليهم الصلاه والسلام) بێ گوناه بوونەو لە گوناهی گەورەو بچووك وەهەروەها هەڵبژاردەی خوای گەورەن ئینجا لەهەموو خەڵکی زیاتر تووش بەڵاو موصیبەت هاتوون ئەوەتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بارەیانەوە ئەفەرموێت (أشدّ النّاسِ بلاءً الأنْبِياءُ ثُمّ الصّالِحُون ثُمّ الأمْثَلُ فَالأمْثَل) رواه البخاري/ واتە لەهەموو خەڵکی زیاتر تووشی بەڵاو (موصیبەت) وناخۆشی بوونە پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لێبێت) ئینجا لە پاشان پیاو چاکان وە لەدوای وان پلە بەپلە بەرەو خوارتر لە ڕووی خواناسی و تەقواوە، جا ئەوەی ڕاستی بێت سەبر (شتێکی زۆر چاکە) وە دەرمانی هەموو دەردێکە چوونکە ئینسان لە دونیادا سەری هەموو دەردو بەڵایەکە تووشی هەزاران (موصیبەت) دەبێ وە ئەبینی هەندێ جار (موصیبەت) لە ناکاو تووشت ئەبێ ئەوجا خوای گەورە لەم (حەدیسە) قودسیەدا ئەفەرموێت: (إنّ اللهَ عَزّ وجل يقول إبن آدَمْ إنْ صَبَرْتَ وأحْتَسَبْتَ عِنْدَ الصّدْمَةِ الأولى لَمْ أرضَ لَكَ ثَوابًا دُونَ الجنّة) رواه ابن ماجة والترمذي ، واتە: بەڕاستی خوای (تەبارەك و تەعالا) دەفەرموێت ئەی ئادەمیزاد ئەگەر

له گرمەی بەڵاو موصیبەت و کارەساتەکاندا ئارامت هەبێت ئەوا منیش جگە لە بەهەشت بەهیچ شتێکی تر پاداشتت نادەمەوە،وە هەروەها لە (حەدیسێکی) تردا ئەڵێ ئەویش خوای گەورە لەفەرموودەی قودسیدا ئەفەرموێ: (إنّي وَجَهْتُ إلى عبدٍ منْ عَبيدي مُصيبة في بَدَنِه أوْ مَالِه أوْ وَلَدِه ثُمّ أسقبَل ذَلك بِصَبرٍ جَميل إسْتَحْيَيْتُ منْهُ يومّ القيامّة أن أنْصَبُ لَهُ ميزاناً أوْ أنْشُرُ لَهُ ديواناً) رواه الشيخان، واته: من ئەگەر ڕووی بەلایەکم کردە بەندەیەك لە بەندەکانم ئینجا لەخۆی بێت کە نەخۆش بکەوێت یاخو چ ماڵی بێت کە لێی بسێنمەوەو یا تووشی زەرەری بکەم وەیاخود لە منالی بێت جەرگی بسوتێنم پاشان ئەو بەندەیە ئارام بگرێ و هاواری خۆی بۆ کەس نەبات جگە لە خودا وە (ناشوکری) نەکات شەرم دەکەم لە ڕۆژی دواییدا تەرازوی کردەوەکانی لەبەردەم دانێم وە یاخوددەفتەری کردەوەکانی لەگەڵ (حیساب) بکەم).

جا بوخاریش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەم فەرمودەیەی هێناوە لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: (قَالَ رَسُولُ الله (صَلى الله عليه وسلم) مَايُصيبُ المُسلمَ مِنْ نَصَبَ ولاَ وصَبٍ ولا هَمٍ ولاَ حَزَنٍ ولا أذىً ولا غَمٍ حتّى الشّوْكةُ يشاكّها إلا كَفّر اللهُ بِهَا مِنْ خطَايَاهُ) رواه البخاري، واته: هەموموسڵمانێك تووشی هیلاکی و نەخۆشی و دڵ تەنگی و غەم و پەژارە دێت وە یا دڕکێکی لەو پێدا ڕابچێت خوای پەروەردگار دەیکاتە سڕینەوەی تاوان و گوناهەکانی، واتە هەر جەزای ئەداتەوە (بەمەرجێك ئارام بگرێت و ناشکور نەبێت / بە قەزاو قەدەری/ خوا ئەوەی خودا بینێتە سەری و ڕازی بێت) .

## (چەند ئاگادارییەكی گرنگ)

١) جـا بێگومـان پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه وسـلم) ئەفـەرموێ لـە حەدیسێكی صحیحدا (مَنْ يردِ الله خَيراً يُصبُ مِنْهُ) واتە ئەگـەر خواویستی یەكێك بخاتە سەر ڕێگای چاك و ڕاست خوا ئەو كەسە تووشـی دەردو بـەلاً ئەكا هەروەها تووشی ئـازاری ئـەكا بـۆ ئـەوەی ئـەجرو پاداشـتی بداتـەوە چـوونكە بۆیـە نـەخۆش ئەجروپاداشـتی زۆرە چـوونكە بـەهۆی ئێـشو ئازارەكەیەوە هەمیشە خوای لە بیرە وە یـادی خـوا ئـەكا هـاواری لێ ئـەكا پەنای بۆ ئەبا كەواتە هەمووجولانەوەو هاواری نەخۆش هـەر (عیبـادەت) و خوا پەرستیە.

٢) لە پەڕتوكی (گولزاری پیاو چاكاندا) [1] ئەڵێ یەكێك لە پیـاو چـاكان ئەفەرموێت : (خوای گەورە جۆرە بەندەیەكی هەبووە و هەیەتی كـە بـەلاو (موصیبەتیان) لەلا وەكو هـەنگوین شـیرین بـوەو وەگرانـی و زەحمـەت و ناخۆشی دونیایان لەلا وەكو شەكر بووە ، هەروەها غەم و پـەژارەوعاجزی دونیاشیان لەلا وەكو شیرینی ڕووتاب بووە..) .

هەزار (ڕەحمەت) لەو كەسە بێت/ كە فەرموویەتی/ لەم هۆنینەوەدا بـە عەرەبی و ئەڵێ :

إذا ما رَمَاكَ الدَّهْرُ يَوماً بِنَكْبةٍ فَهِيَ لَهُ أمْراً وأوْسع لهُ صَدْراً
فإنّ تصاريف الزّمان عَجيبةٌ فَيوماً تَرى يُسراً ويوْماً تَرى عُسْراً.

---

(1) ئەوەی ڕاستی بێت كتێبەكە ناوی ( كنز العرفان بۆ ناسینی سەروەران)ە لە باخچەو گوڵزاری هەندێ پیاو چاكان ) كە ئێستاكە (مخگوگ) لە (مكتەب) و ئامادەیە بۆ بەچاپ گەیاندنی (إنشاو الله).

واتە: ئەگەر هاتوو ڕۆژێك وەزعت گۆڕا تووشـی نەكسەیەك هـاتی و تـۆ ئامادەباشی دەربڕە و سینگی خـۆت بـۆ فـراوان بكـە، چـوونكە بەڕاسـتی گۆڕانی زەمانە شتێكی سەر سوڕهێنەرە ڕۆژێك وای لە خۆشی و ڕۆژێكـیش وای لە ناخۆشی).هەروەها ئـەم ئایەتـەش ئەگرێتـەوە ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ سوورەتی/ الشرح ئایەتی/ ٥).

٣) ئیمـامی عـەلی كـوڕی ئـەبی تالـب (خـوا لێـی ڕازی بێـت) فـەرمووی ئامۆژگاریتان دەكەم بە پێنج شت :

١) لە خوا زیاتر داوا لەكەسی تر مەكەن. ٢) تەنها لـە تـاوانی خۆتـان بترسن . ٣) با شەرم نەكات ئەگەر پرسیاری لێكراو نەیزانی بابڵێ نازانم . ٤) ئەگەر نەیزانی با خۆی فێر بكات . ٥) بزانن كەوا (صەبر)و ئارام گرتن بە (نیسبەت) ئیمانەوە وەكو سـەر وایـە بـە (نیـسبەت) لەشـەوە ، ئەگـەر سەر لە لەش جیا كرایەوە ئەوا لاشـەكە هـیچ، ئەگـەر (صـەبریش) ڕۆیـشت واتە ئیمان ڕۆیشت (اللّهُمَ إحْفظْنا من البَلايَا والمَصّائب، اللّهُمَ ارْزُقْنا الـصّبَر علَى المَصائب، اللّهُمَ إجْعَلنا مِنْ الصّابرِيْن، واجْعلنـا مـنْ ورَثـة جنّـة النّعـيم، نَبَهَني اللهُ وأيّاكُمْ مِنْ نَوْمَةَ الغَافلين وحَشَرَني وإيّاكُمْ تحْتَ لِواء سَيِّد المُرْسَلين وبَعْد أعُوذ بالله مِنْ الشّيْطان الرّجيم رَبّنا افرغ عَلَيْنا صبْراً وتَوفَنا مُسْلمِين، اللّهُم إغْفِر لَنَا آمين يَا رَبّ العَالمين).

# ئامۆژگاری شەست

## باسی تەعاون و یرمەتیدانی یەکتری دەکات

الحَمْدُ للهِ ثُمّ الحَمْدُ للهِ مَا تَوْفِيقي ولا إعتصامية إلاّ بِاللهِ عَلَيهِ تَوَكَّلتُ وإليهِ أُنيب الحَمْد للهِ الذّي أمَرَنَا بِالتَعَاون بَيْنَنَا وأشْهَد أنْ لا إله إلاّ الله وحْدَهُ لاَشَرِيكَ لهُ وأشهدأنّ سَيِّدَنا مُحَمَد عَبْدُهُ وَرَسُولهُ والصّلاة والسّلام على مُحَمّد رَسُولُ الله ونَبِيِّنا وعلى آلهِ وأتْبَاعهِ إلى يَوْم اللقاءِ) أما بعد أيها المُسلِمُونَ أوصيكم عباد الله بِتَقوا الله وَطَاعَته).

واتــە: لــە دوای هەنــدێ گــەڵی موســڵمانان وەســیەتتان دەکــەم ئــەی بەندەکانی خوا بە تەقواو لەخوا ترسان وە لەپاشان (إطاعـە)ی بکـەن بـە هەموو شێوەیەك وە هەروەها کۆمەکو یارمەتی یەکتری بدەن لەسەر چاکەو برایەتی و تەبایی هەروەها لە ووتاری ئەوڕۆکەدا لە ئامۆژگاری ئێستاکەمان باسی یارمەتی دانی یەکترتان بۆ دەکەم کەچەند (خێـرە) چوونکە خـوای گـەورە (عەبـد)و بەنـدەی درووسـت کـردووە بـەلاّم (سـەعادەت) و خـۆش بەختی و ژیانی بەختەوەارنـەو ڕزق و ڕۆزی ئینـسانی بەستۆتەوە بەچـەند شتێکەوە کە بۆ هیچ کەس ناگونجێ هـیچ کـەس نـاتوانێ بەتـەنیا هەرچـی پێویست بێ بیکا و (موحتاج) بەکەس نەبێ بازۆریش بـە تاقـەت و خـاوەن دەسەلاّت بـێ بـەڵکوبنیادەم لـە زۆر شـتدا بگـرە لەهـەموو مـاوەی ژیانیـدا (موحتاجە) بە یارمـەتی خـەڵك جا هـەر لەبـەر ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە (ئەمری) کردووە بـە موسـڵمان یارمـەتی یـەکتری بـدەن وەکـو لـە قورئانـا ئەفەرموێت ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾واتە لەسەر هاوکاری وکۆمـەك

و پارێزگـاری یارمــەتی یــەکتر بـدەن ﴿ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾ سوورەتی/ المائدة: ٢) بەڵام بە گوناهو تاوان و دەست درێژی و لە سـنوور دەورچوون هاوکاری و کۆمـەکی یـەکتر مەکـەن چـوونکە پێغەمبـە ر (ﷺ) دەفەرموێت: (أُنْصُر أخَـاكَ ظَالِمـاً أوْ مَظْلومـاً) رواه أحمـد واتـا هاوکـاری و یارمەت براکـەت بـدە سـتەمکار بـێ یـان سـتەم لێکـراو جـا ئەسـحابەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەو قسەیە سەرسام بوون بۆیە گووتیان ستەم لێکراوەکە ڕاستە و جێی خۆیەتی هاوکاری بکـەین بـەڵام ئـەی چـۆن یارمـەتی سـتەم کارەکە بدرێت ؟! ئەویش فەرمووی دەستی بگرەو مەهێڵە سـتەم بکـات ، ئەوە دەبێتە یارمەتی بۆی .

**(تێبینی)**

لەو ئایەتەی پێشوودا ئەوەمان بۆ دەردەکـەوێت وەرئـەگیرێ پێویـستە موسڵمانان هەمیشە لەسەر جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا یارمەتی و هاوکاری یەکتر بکەن بەسەبرو بە ئارامیش بن چوونکە ئـەو فەرموودەیـەی پێغەمبەریش هەر لەم بارەیەوە هاتووە دەفەرموێت (المُؤمِن الـذّي يُخَـالِطُ النّاس ويُصْبِر عَلَى آذاهُم أعْظمُ أجْراً منّ الذّي لاَ يُخَالِط النّاسَ وَلا يَصْبِر عَلى اذَاهُـم) رواه أحمـد، واتـە: بێگومـان ئـەو ئیماندارانـەی کـە لەگـەڵ خـەڵك تێکەڵاو دەبن دووری لەخەڵك ناکەن چوونکە بەڕاسـتی ئـەو موسـڵمانانە ی لەگـەڵ خــەڵك هەڵدەسـتن و دادەنیـشن و هاتۆچـۆیان دەکـاو زەحمـەتیان قەبوڵ دەکا ئینجا پلەو پایەی زۆر لەوانە لەلای خوا بەرزترە گە تێکـەڵاوی خەڵك ناکەن و دوورن لە خەڵك.

**( چەند سودو فائیدەیەك )**

(ڕیوایەت) کراوەو ئەگێڕنەوە کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا عەرزی کرد یا رسول الله واتە ئەی نێراوی خـوا (أيُّ النّـاس أحَـبُ إلى اللهِ) واتە کێی لەلای خوا لەهەموو کەس خۆشەویسترە ئینجا ئەویش لە وەلآمدا فەرمووی: (أحَبُ النّاسِ إلى اللهِ أنْفَعَهُم لِلنّاسِ) واتـە خۆشەویسترین بەندەکانی خوا ئەو کەسەیە کە سوودو قازانجی بۆ خەڵك هەبێ زۆرتـر بـێ وەهەروەها لە (ڕیوایەتێکی) تردا ئەفەرموێ: (وأحَبُ الأعْمَال إلى اللهِ سرورٌ تُدْخِلُهُ عَلَى كُلِّ مُسْلِم) رواه الطبراني؟

**( یارمەتی و کۆمەکی موسڵمان زۆر خێرە بەتایبەتی ئەوانەی کە فەقیر و هەژارن )**

جا هەروەها پێویستە ئەوەی مالْ و سامان و دارایـی هـەبێ دەسـتی فەقیرو هەژارو چەوساوەکان بگرێ وە یارمەتیان بدات جگـە لـە (زەکـاتی) ماڵی خوا ئەمە (فەرزەو) پێویستە لەسەری ئەدای بکـات چـوونکە کەسـێك مـالْ و سـەروەتتی دونیـای هـەبوو (واجیبـە) لەسـەری چـاکەی پـێ بکـە یارمەتی خەڵك بدا بەو مالْ و سامانەی با چاکەی پێ بکاو ماڵەکەی بکاتـە (صدقە ی جاریە) وەکو ئەمە مزگـەوت و مەدرەسـەی پـێ درووسـت بکـات هـەوەها (مـستەشفاو) جێگـای نەخۆشـخانە وە بـیرو ڕێگـاو بـان وە پێویـستیەکانی موسـڵمانان جـێ بجـێ بکـات هـەروەها کەسێك(عـیلم و زانیـاری) و صـەنعەتێکی دەزانـی (واجبـە) لەسـەری بـە (عـیلم و صەنعەتەکەی) یارمەتی خەڵك بدات هەروەها خـەڵك بـانگ بکـات بـۆ سـەر

ڕێگای ڕاست وە فێری زانست و صەنعەتیان بکا ئامۆژگاریان بکا (ئەمر) بە چاکەو (نەهی) لە خراپە بکەن.

جا بێگومان ئایینی ئیسلام بەوە ڕازی نابێ خۆت تێرو پڕ بی و ماڵ و منداڵت تێرو تەسەلّ بن وە خزمەکانت لە برسان بمرن، دینی ئیسلام بەوە ڕازی نابێت خۆت تێر بی و دراوسێ و (جیرانت) یا برای دینت برسی بێ، جا ئەگەر زانا ئاگای لە نەزان بێ و دەوڵەمەند ئاگای لە هەژار نەبێ وە خاوەن پایەو (مەقام) چاوی لە داماوان نەبێ وە خەڵك یارمەتی یەکتر نەدەت ئەوا ژیانی زۆربەی خەڵکی ئەو جێگایە تاڵ ژاڵ ئەبێ باری ژیانی کۆمەڵایەتیان تێك ئەچێ وە ئاڵۆز دەبێ، هەروەها برایەتی و تەبایی لە بەینی موسڵمانان دەپچڕێ، جا لەبەر ئەو (حیکمەتانەیە) خوای گەورە لە قورئانـــدا فەرموویـــەتی: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾ سوورەتی/ التوبة: ٧١) واتە: پیاوان و ژنانی باوڕەدار هەمو دۆست و خۆشەویست و یارمەتیدەری یەکترن لە گشت خۆشەیەکو ناخۆشییەکدا جا هەروەها بێگومان هەندێك لە موسڵمانان دەبێت یارمەتی هەندێکیان بدەن وە دەستیان بگرن وە فریایان بکەون بۆیە پیاوە باشەکانی پێشینان ئەگەر نانێکیان هەبا لەگەڵ خەڵك دەیان کرد بە نیوە وەك شێخی سەعدی لە گوڵستاندا ئەفەرموێت:

نِیم نانی گر خُوَرد مَرْدِ خُدای بَذْل دەورێشان کند نیمی دگر

واتە: بێگومان پیاوی خودا ئەگەر نانێکی هەبێ نیوەی ئەخوا وە نیوەکەی تریشی ئەداتە بێ نەوایان وە فەقیرو هەژاران بە ڕاستی مەردی خواو پیاوی خوا ئەگەر نانێکیان هەبێ وە نیوەکەی بخۆن نیوەکەی تری

ئەدەن بە ئینسانی برسی و فەقیرو هەژار و (موحتاج) جاری واش بووە کە بۆ ئەوەی ئەگەر پێویستیان هەبێ و خۆیان برسی ئەکەن و خواردنەکە ئەدەن بە خەڵك هروەکو (ڕیوایەت) کراوە دەگێڕنەوە کە ئێوارەیەك ئەبو تەڵحەی ئەنصاری (ڕەزای خوای لێبێت) میوانێکی پێغەمبەری (ﷺ) بردەوە ماڵەوە ئینجا بە خێزانەکەی گووت (قَدْ نَزَلَ بِنَا ضَيْفٌ فَهَلْ عِنْدَنا طَعَامٌ)، واتە بەڕاستی ئافرەت ئەوە میوانمان هاتووە ئایە هیچمان هەیە بیخوات؟ (فَقَالَتْ إن عِنْدَنا مِنَ الطَعَامِ مَا يَشْبَعِ الواحِد وفي رِوايةٍ إلاَّ قُوتَ صُبْيَانِنا) واتە ژنەکە گووتی بەڵی هەر ئەوەندەمان هەیە نەفەرێك پێی تێر بخوا یا بە (ڕیوایەتێکی) تردا گووتی بەس بای منداڵەکان ماوە جا هەروەها (ڕاوی) دەڵێ ئەو ڕۆژە هەردوو کیان بەڕۆژوو بوون وە هەروەها کوڕێکیشیان هەبوو : ئینجا (ئەبو تەلحە) بە خێزنەکەی ووت باشە ئەوی خودا داویەتی دەیدەین بە میوانەکە و ئەو شۆکە خۆمان هیچ ناخۆین بەڵام لەپێش نان خواردنەکا کوڕەکە بنوێنە هەروەها کە نانیشت دانا چرایەکە بە فێلێك بکوژێنەوە هەتا مێوانەکە وابزانێ ئێمەش خەریکی نان خواردنین و با تێرو پڕ بخوات وە شەرم لە خۆی نەکات ئینجا ژنەکە منداڵەکەی نواندو نانەکەی هێنا لە پێش مێوانەکەی دانا بە بیانوی ئەوەی کە چراکە خۆش دەکا چوو بەلای چراکە وە بە دزیەوە فووی لێکرد وە کوژاندیەوە وە (ئەبو تەلحە) لە تاریکیدا دەستی دەبردە ناو ئامانکەوە کە چێشتەکەی تێدا درووست ئەکرێ هەرچەندە بەتاڵیش بوو تەقە تەقی پێی ئەکردو بۆ دەمی خۆی ئەبرد بۆ ئەوەی میوانەکە وابزانێ ئەویش لەو دیوەوە نان دەخوات بەڵام میوانەکە/ هەرچی لەناو (قوصعەکەدابوو)

هەمووی خوارد.

ئینجا بەیانی زوو (ئەبو تەڵحە) چوو بۆ مزگەوت وە لە خزمەت پێغەمبەردا نوێژی کرد لەپاشان کە پێغەمبەر (ﷺ) سەلامی نوێژی دایەوە ئینجا ڕووی کردە (ئەبو تەڵحە) و فەرمووی: (عَجَبَ اللهُ مِنْ صَنيعكُما، أي رَضَي بذلكَ) واتە خوای تەبارەك و تەعالا لە (عەمەل) و کردەوەی ئەوشۆتان زۆر زۆر ڕازییە کە کردووتان لەگەڵ ئەو میوانەداو جا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە لەسورەتی/ حەشردا فەرموویەتی ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ[1] فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾سوورەتی/ الحشر: ٩) واتە: ئەوانە لەناخی دڵیانەوە خۆشییان بۆ (غەیری) خۆیان دەوێت وە خۆنەویستی دەکەن وە هەرچەندە خۆیان نەیان بێت وە پێویستیان پێ هەبێت، هەرکەسێك خوی لە ڕەزیلی بپارێزێت ئەوا بە ڕاستی ڕزگارو سەرفرازە لەناو قازانجێکی زۆردایە هەر مایەی بەختەوەریە.

## ( پاشکۆ )

(سەڵەفی سالحین) ئەفەرموون خۆت لەسەر خێرو چاکەکردن ڕابهێنە وە هیچ شتێ لە خێرکردن مەگێڕەوە و مەبڕە ئەوە بکە بەخێر بەلاتەوە شیرن و خۆشەویستە ، خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ

---

(1) خصاصە / واتە هەژاری (شُحَّ نَفْسِهِۦ) واتە/ ڕەزیلی/ یا چاووچنۆکی، هەندێکی تر لەزانایان بە خیلیشی/ پێ ئەڵێن) .

تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴾ سوورەتی/ آل عمران: ٩٢) واتـە: هـەرگیز ناگەنـە هیچ پلەیەکی خێر و چاکە تا لەو شتەی خۆتان خۆشتان دەوێ نەبەخشن لە بۆ ڕێی خوا ئەوجا هەروەها هەتا پێتان دەکرێ خێرکردنتـان بـە نهێنـی بێ بەلاّم (زەکات) دانتان بە ئاشکرا بێت تاکو خەڵکی چـاوت لێ بکـەن کـە خێرت ئەنجام دا یەکەم جار بدە بـە کەسـوکارە هـەژارو چـاکەکانت ئینجـا بەوانی دوور) جا برایانی خاوەن باوەڕان ئینسانی موسڵمان بەهۆی عەقڵ و دین و زانیاریەوە خـۆی لـە ڕەزیلـی و بـەخیلی و ڕوشـدی بپـارێزێ و دوور بگرێ وە هەروەها لە دونیادا هـەر بۆخـۆی هـەوڵ بـدا ئینجـا دەبـێ تـابۆی ئەکرێ یارمەتی خەڵك بدا).

ئەوەبوو بە کورتی باسی (تەعاون) و یارمەتی موسڵمانانمان کرد ئومێد دەکەم یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکە بـەڵکو خـوا یارمـەتیمان بـدات، (خوایە یارمەتیمان بدەی) خوایە تاعەت و عیبادەتمان قەبوڵ بکەی/ خوایە لە بەلاّو موسیبەتی دونیـاو قیامـەت بمانپـارێزی،أعـوذُ بـاللهِ مـنَ الـشيطانِ الرجيم هذا بيانٌ للناس وَهُدىً وَموعِظَة لِلمُتَقين (نَبَهني اللهُ وايّـاكُمْ مِـنْ نَوْمَـة الغَافلِين وحَشَرَني وايّاكم تَحْتَ لِواء سَيِّد المُرْسَلِين، اللّهُم إغفِر لَنا آمين .

# ئامۆژگاری شەست و یەك

## باسی (الإحسان) واتە چاکەکردن ئەکات

الحَمد لله فَالِق الحَبِ والنّوي يَخْرج الحيَّ مِنَ المَميت وَمُخرِجُ المَيتَ مِنَ الحَي، الحَمْد لله الذّي يُحبُ المُحْسنين أهْل الخَيْر والفَلاح والصّلاة والسّلام على سَيّدنا مُحَمّد الذّي يُعْطي السّائل ويَقْربُ الضَيْفَ وَيُطْعِمُ الطّعامَ وَيُبْدي بشَاشَةَ الوَجْه ويلين في الكَلام مَعَ الضُعَفاء والأيتام ثُم الرِضَا عَنْ آله وأصْحَابه الذّين انْفقوا أمْوالَهُم عَلىَ المساكين والفقَراء والمعَوذين وفي سبيل الله لأجل نَصرَةِ الحَقّ والدّين، وأشْهد انْ لا إله إلاّ الله هُوَ الرّزاق ذُو القوّة المَتين وَأشْهَدُ أنّ سَيِّدنا مُحَمّداً عبْدُه وَرَسُولَه ذوُ القلب الرّحيم والخَلْق الرّزين وعلى آله وأصْحابه الطَيبينَ الطاهرينَ وَعَلىَ أتباعه إلى يَوم الدّين) أمّا بعْد فيا عِبادَ الله اتّقوا الله تَعالى وكونوا من أهل البرّ والإحْسانِ إلى الفُقَراء والبُؤساء ببذل الفضل اليهم ممّا انْعَم الله به عَلَيْكُم مِنْ المالِ ولا تَنْسوا الآية الكَريمة ﴿وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾[1] سوورەتی/ القصص: ٧٧) واتە: لەپاش هەندێ ئەی بەندەکانی خودا تەقوای خوای تەعالا بکەن جا

(1) حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) ئامۆژگاری (قارونی) ئەکرد هەروەکو قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە ﴿وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ﴾ واتە چاکە بکە وەك خوا چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە)، بەلاّم گوێی بە حەزرەتی موسا نەدا وە لە خۆبایی بوو وە سەرپێچی کرد لە (ئەمری) خودا و ئەوجا خوا غەزەبی لێگرت وە بەناخی زەویدا چووە خوارەوە وەك قورئان سەرگوزشتەی بۆمان ئەگێڕێتەوە ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ﴾سوورەتی/ القصص: ٨١) واتە: جا سەرەنجام خۆی و خانووەکەیمان برد بە ناخی زەویدا بە سامان و گەنجینەکەشیەوە .

ئێوە پێویستە لە چاکە کەران بن چوونکە دەبێ هەروەکو خوا بەو هەموو نازو نیعمەت و ساغ و سەلامەتیە چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە تۆش تابۆت دەکرێ لەگەڵ ئەواندا چاکەی بکە دەستی یارمەتی بۆ لای خەڵك درێژ کە بەتەنها چاکە لەگەڵ هەژارو بەڵنگازو لێی قەوماوان بکە، وە ئەبێ ئەو ئایەتەش لەبیر نەکەیت کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت واتە چاکە لەگەڵ خەڵك بکە هەروەکو خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردووە (هەرچەندە قازانج و فائدەی چاکە بە زۆری هەر بۆ خۆت دەگەڕێتەوە هەروەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ وَإِنۡ أَسَأۡتُمۡ فَلَهَاۚ﴾ سوورەتی/ الإسراء: ٧ ) واتە ئەگەر چاکە بکەن قازانجەکەی بۆخۆی دەگەڕێتەوە وە ئەگەر خراپەش بکەن ئەوا تاوان و گوناحەکەی هەر لەسەر خۆتان ئەنوسرێت پێشینان فەرموویانە (هیچ سیفەتێك بەقەدەر سەخاوەت و ئیحسان بە نرخ نیە بۆ ئینسان) چوونکە بێگومان تۆبزانە (أسخى الأسخياء) واتە پێغەمبەرمان (ﷺ) لە هەموو کەسێك سەخی تر بووە چوونکە لە (حەدیسدا) هاتووە (السَخيُ حَبيبُ الله) واتە ئیسنانی سەخی دۆست و خۆشەویستی خوایە/ جا شێخی سەعدیش لەم بارەیەوە فەرموویەتی :

شَرف مَرد بجُوداسَتْ و کرامت بسجُود      هەرکە إن هەردُو ندارد عَدَمش بەزوجود

واتە شەرەفی مەردو پیاوەتی بە سەخاوەت و ماڵ بەخشینە وە کەرامەتی ئینسانیش بە نوێژو خوا پەرستی و تاعەتە/ بەڵام ئەگەر هەردوکیان نەبوون/ نە سەخاوەت و نە کڕنوش/ ئەو ئینسانە بمرێ باشترە لەوەی کە ووجودی هەبێ نەبێ باشترە ..)

## (چەند ئاگادارییەكی گرنگ)

(یەكەم) جا هەروەها خاوەن ئیمان و باوەڕان هەر كەسێك چاكەیەك بكا لە دونیا خوا یەك بە دە ئەجرو پاداشتی دەداتەوە هەروەكو خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴾ سوورەتی/ الأنعام: ١٦٠) واتە: هەركەسێك چاكەیەك بكات پاداشتی چاكەكەی لەڕۆژی دواییدا بە دە قات وەردەگرێتەوە ، وە هەروەها خوای گەورە (مُقْتَدِرة)، بە حەوصەدیش (ئەجر) و پاداشتی بداتەوە وەك لە (حەدیسدا) هاتووە جا هەروەها (عبدالله) ی كوڕی (مەسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (أيُّكم مَالَ وارثه أحبَ إليه منْ مَاله؟ قالوا يَا رسُول الله مَا منّا أحدٌ إلاّ مَالَهُ أحَبُ إليه، قال فإن مالَهُ ما قَدمَ وَمالَ وارثه مَا أخرَ) رواه البخاري/ واتە: فەرمووی كامتان ماری میراتبەرەكەی لە ماڵی خۆی خۆشتر دەوێ ، ئینجا عەزیان كرد قوربان، ئێمە هەموومان ماڵە خۆمانمان لە میراتبەرەكەمان خۆشتر دەوێ، فەرمووی دە بزانن ئەو ماڵەی كە بە كەڵكی دونیات بێت ئەو ماڵەیە كە لەپێش خۆیەوە ڕەوانی دەكا بۆ ئەو دونیا واتە بۆ دواڕۆژ ماڵی میراتبەرەكەشی ئەو ماڵەیە كە هەر كۆی دەكاتەوە تا لە پڕ خۆی (دەمرێ) و ماڵەكەی بەدوای بەجێ دەمێنێ وە دەبێ بە هی میراتگری.

دووەم) خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ سوورەتی/ البقرة: ١١٠) واتە هەر كارێكی خێرو چاكە لەپێش خۆتدا ڕەوانەی بكەی پاداشتەكەیان لای خوا پێدەگاتەوە

وون نابێت ، چوونکە بێگومان هر دەستێکی خێرو چاکەی پێ بکرێت ئەو دەستە نارزێ و تێك ناچێ هەروەکو دەگێڕنەوە لە مێژودا کە چەند ساڵ دوای مردنی حاتەمی (طەی) بارانێکی زۆر لە قەبرستانی دا کە (حاتەمیان) تێدا نێشتبوو وێران بوون و ئاو بردبوونی بەڵام کوڕی (حاتەم) چوو گۆڕی باوکی وەگوێزێ بۆ ئەوەی ئاو نەیبا کاتێ خۆڵەکەیان لەسەر وەلادا تەماشان کرد هەمو و ئەندامی (حاتەم) ڕزی بوونە بەڵام بەس (دەستی ڕاستە) نەبێ کە بەقەد (میسقالە زەڕەیەك) نەگۆڕابوو خەڵك زۆری لەلا (عەجیب بوو) بەڵام زانایەکی ئەو کاتە ڕووی کردە خەڵکەکەو گووتی ئەی خەڵکینە لاتان سەیر نەبێ چوونکە (حاتەم) بەو دەستە زۆی چاکەو خێرو خێرات وە سەخاوەت و پیاوەتی پێکردووە/ وە بۆیە دەستەکەی نەڕزیوە وە خەڵکەکە گوتیان ڕاست دەکەی فەرموودەکەت تەواوەو لەجێی خۆیەتی[1]

(سێ هەم) جا هەروەها بێگومان (ئەهلی سیرە) ئەڵێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو کەس (سەختی تر) بووە، وە هەروەها کەس نەگەیشتوەتە ئەو، ئەوجا لەپەرتوکی (المواعظُ العصفورية)[2] دا ئەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك تەشریفی چووە بۆ بازاڕ هەشت درهەمی پێبوو وە دەیویست کراسێك بکڕێ لە بازاڕ ئینجا لەسەر ڕێگادا چاوی بە

١) جا هەروەها بنوارە بەهۆی چاکەوە دەستی (کافرێك) نەڕزی لە گۆڕدا چۆن خوای گەورە سەخاوەت و چاکەی ئیماندار بە (زایع) دەبات کە پیاوەتی یارمەتی موسڵمانان بدا چۆن خوا (عەفوی) ناکات وە بەهەشتی پێ نابەخشێ ...)

١) بڕوانە پەرتوکی (المواعظ العصفورية) (وهُوَ كِتابٌ مُشْتَمَل عَلى الاربعين مِنْ الأحاديث النبويّة) ، دانرواوی (الشيخ مَحمد بن أبي بكر المشهور بالعصفوري) لاپەڕە/ ١٨.

ئافرەتێـك كـەوت دەگریـا (فَـسَأَلَهَا فقَالَـتْ خَرَجْـتُ أشْـتري حاجَـةً لأهلـي بدْرهَمَين فَذَهَبا منّي)، واتە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێ کردو ئـەویش لـە وەلآمدا گووتی دووو درهەمم پێبوو هاتم شت بکڕم ئەویشم لـێم کـەوتوون و وون بوو ئینجا حەزرەت (ﷺ) دوو درهەمەکەی دا بە ئافرەتەکە وە ئینجـا تەشریفی چوو بۆ بازاڕ کراسێکی کڕی بە (چـوار درهـەم )وە هـەروەها لـە گەڕانەوەدا تووشی پیاوێك بوو دەیگوت و هاواری دەکرد (مَنْ كَسَانِي ثَوْباً كَسَاهُ اللهُ مِنْ حُلَلَ الجَنّة فَدَفَعَ إليـهِ القَمِيصَ) واتـە هـەر کەسێك کراسێکم بـداتێ وە پۆشتـەم بکـا خـوا لەبـەرگ و لیباسـی بەهەشـت دەیداتـەوە وە پۆشتەی ئەکا ئەوجا پێغەمبەریش (ﷺ) کراسەکەی دابە کابراو، دووبـارە پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ باوزاڕو کراسێکی تری کڕی بەو دوو درهەمەی کە پێی مابوو ئینجا بەرەو ماڵ گەڕایەوە لە ڕێگـادا تووشـی جارییـەك بـوو دەگریا لێی پرسی بۆ دەگریێ ، گووتی ئەوەی ڕاستی بێت (أخَافُ العقُوبَـةَ مِنْ أهْلي لِطُول غيْبَتي) واتە: بەڕاستی زۆر لـە مێـژە لـە ماڵـەوە هاتومەتـە دەرەوە لـە خاوەنەکـەم دەترسـم بۆیـە دەگـریێم جـا جاریەکـە عـەرزی پێغەمبەری کردو گووتی (إلحَقِنِي بأهلي) ئەوجا پێغەمبـەریش (ﷺ) وە پێشم کەوە با بت بەمەوە بۆ مـاڵی خـۆت/ ئینجـا پێغەمبـەر (ﷺ) لەگـەڵ جاریەکە/ ڕۆیشتن تا چوونە بەر دەرگای ماڵەکەیان جا پێغەمبەر (ﷺ) لە دەرگای ماڵەکەیانی دا سەلامی کرد بەڵام کەس وەلآمی نەدایەوە دووجاری دای لە دەرگای داو سەلآمی کـرد ئـەوجا جوابیـان داوە هـاتن بـە پیریـەوە فەرمووی (لِمَ لَمْ تُجِيبونِي مِنْ أوّلَ مَرّةٍ) واتە ئەی بـۆ یەکـەم جـار جوابتـان نەدامەوە؟ (فقَالوا أرَدْنـا أن نَتَبّـركَ بِـصَوْتكَ) واتـە گوتیـان بـۆ ئـەوەی بـۆ

بەرەکەت گوێمان لەدەنگت بێت جا پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێخۆش بوونی کرد بۆ جاریەکە کە لێی تورە نەبن (فَقَالوا هيَ حُرَّةٌ لأجْلِكَ يَا رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم)، واتە عەرزیان کرد، ئەوا لە بەر خاتری تۆ ئازاد مان کرد، (فَرَجعَ يَقُول مَا رَأيتُ ثَمَانيةَ أعْظمُ مِنْ هذه أمِنّا بِها جَارِيةً وأعْتَقنَا بِهَا جَارِيةً وكَسَوْنا بِهَا عُرْيَاناً)، ئەوجا خواحافیزی کردو گەڕایەوە بۆماڵ و فەرمووی لەو (هەشت درهەمە) گەورەترم نەدیوە (جاریەکمان) پێ ئەمین کرد وە جاریەکەمان پێ ئازاد کرد وە هەروەها عەورەتی ڕوتێکمان پێ داپۆشی ئەو چاکەو خێرو پاداشتەشمان بەنسیب بوو سوپاس بۆ خوا .

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (السّخَاءُ شَجَرَةٌ مِنْ أشْجارِ الجنّة أغْصَانُها مُتدلّياتٌ في الدّنيا فَمَنْ أخَذَ بِغصْن مِنْها قَادَهُ ذلكَ الغُصْنُ إلى الجنّةِ) واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی سەخاوەت درەختێکە لە درەختی بەهەشت کەسێك دەست بە لقی ئەو درەختە بگرێ ئەو لقە ڕایئەکێشێ بۆ بەهەشت.

(وَالبَخْلُ شَجَرةٌ مِنْ أشْجار النّار أغْصَانُهَا مُتَدلياتٌ الى الدّنيا فَمَنْ أخذ بِغُصنٍ من أغْصانِهاَ قادهُ ذلك الغُصْنِ إلى النّار) رواه البخارى والبيهقى. واتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی بەخیلیش درەختێکە لە درەختی دۆزەخ کەسێك دەستی بە لقەی ئە و درەختە بگرێ ئەو لقە ڕای ئەکێشێ بۆ دۆزەخ، وە هەوەها فەرموویەتی لە فەرمودەیەکی تردا (السّخي قريبٌ مِنْ الله قَرِبٌ مِنْ الجنّة بعيدٌ مِنَ النّار والبخيل بعيدٌ مِنَ الله بَعيدٌ مِن الجنّة قَرِيبُ

من النّار) رواه الترمذي وَقَالَ حَديث حسن، واتـه: (فەرموویـەتی ئینـسانی سـەخی مەرتەبـەی زۆر نزیکـە لـە خـوا هـەروەها نزیکـە لـە خـەڵك و لـە بەهەشـت) (دووریـشە لـە دۆزەخ) و لـە ئـاگرەوە، بـەڵام ئینـسانی بـەخیل دوورە لە خواو دوورە لە خەڵك و دوورە لەبەهەشت نزیکە لە (دۆزەخ) و لە ئـاگرەوە، جـا هـەروەها سـەخاوەت (صـیفەتی پێغەمبەرانـە) (سـەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) بەتایبەتی پێغەمبـەری خۆمـان چـوونکە هـیچ کەس بە ئەندازەی ئەو زاتـە موبارەکـە سـەخی نـەبووە وە هـەتا دەڵـێن سەخی تر بووە لە هەور بارانێکی ڕەحمەت کـە ببـارێ چـوونکە بەڕاسـتی وەسـفی سـەخاوەت لـە پێغەمبـەر (ﷺ) (مەشـهورە) ئاشـکرا بـووە وە ئەسحابە بەڕێزەکانی هەروا هەتا دەگێڕنەوە لە حەزرەتی (ابـو بکـر) (خـوا لێی ڕازی بێت) هەموو ماڵی خۆی کرد بـە خێـر و خێـرات ئینجـا عـەرزیان کـرد ئـەدی بـۆ مـاڵ و منداڵـەکانت چـیت هێـشتۆتەوە، فـەرمووی خـواو پێغەمبـەر (ﷺ) (خودایـە عـەفومان بکـەی/ خودایـە لـە دەردی بـەخیلی بەدوورمان کەی/ خودایە سەخاوەتمان بە نسیب بکـەی/ خودایـە لـە بـەلاو موسیبەتی دونیاو قیامەت بمانپارێزی/ ئامین، أقُولُ قَوْلِي هَذا واسْتغْفر الله لِي ولَكُم ولسَائر المُسْلمِينْ أعوذ باللهِ منَ الشيطان الرجيم ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ سوورەتی/ الأنبياء: ١٠٧ ) نَبَهَني الله وإياكم مِنْ نَوْمَة الغافلين وَحشَرَني وإيّاكُمْ تحت لِواء سَيّد المُرسلين).

# ئامۆژگاری شەست و دوو

## باسی ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت ( تعمير المساجد ) ئەکات

الحَمْدُ لله الذّي شَرَفَ بَعْضَ الأمَاكن عَلَى غَيْرها وَجَعَل أشْرَفَ بُقعَةٍ في الأرضِ مَكّة ومَا حَوْلَها ثُمّ أي المَدِيْنَة المُنَورة لوجُودْ ضَرِيح النَبّي(ﷺ) فيها فَبيتُ المقدّس وَنَواحِيها ثُمّ بيوتْ الله المُنْتَشِرةَ في جوانب الأرْض وَوَسَطِها ثُمّ الحَمْدُ الله الذّي جَعَل المَساجِد بِيوتاً لِلعِبادةَ، نَحْمَدُهُ سُبْحانَهُ وتَعالى ونشكرهُ علَى مَا وَفَق اليه عِبَادَهُ وَهُدى مِن أعمَالِ المَعْرُوف ومِنْ سُنَنْ الهُدى ونَسْتَغْفِرهُ ونَتُوبُ إليهِ مِمّا خفي منْ ذُنوبِنَا وَمَا بَدا وأشْهَد أنْ لاَ إلـه إلاّ الله وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لهُ وأشْهَدُ انّ سَيِّدنَا مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُولَهُ أرْسَلَه بِالهُدى ودين الحقّ لِيُظْهِرهُ على الدّين كُلّه والصّلاة والسّلام على سَيِّدنا مُحَمّد وعَلَى آلـه وأصْحابهِ الذّين سَلَكُوا طَرِيقَ السّعادة) أمّا بَعْد أيّها المُسْلمُون أوْصِيكُمْ بِتَقُوا اللهِ وطَاعَتِه في جمِيع أوْقاتِكُم لِكي تَفُوزَ بِسَعادةِ الدُنيا والآخرة .....الخ).

واتـە لـەپاش هەندێ موسڵمانەکان وەسیەتان لێ دەکەم بـە تـەقوای خـوداو لـە هـەموو کـات و سـاتێکدا بـەڵکو سـەربەرزی هـەردو دونیـادەبن هەروەها سەرکەوتووی هەردوو دونیا دەبن، جا ئـەوەی ڕاستی بێت هـەر کەسێ گوێداری خواو پێغەمبەری خوا بکات وە لە فەرمانەکانیان دەرنەچێ ئەوە بێگومان سەرکەوتوو دەبێت لـە دونیـاو هـەم لـە ڕۆژی دوا ییـدا جـا خاوەن باوەڕان موسڵمانینە لە ئامۆژگاری ووتـاری ئـەو ڕۆکـەمان باسـی درووست کردنی مزگەوت و ئاوەدانکردنەوەی بۆ خواپەرستی و بە (تاعەت)

و عیبادەت کردنی ئەکەین هەروەها پێویستە هەموو پێداویستیەکانی دابینبکرێن وەکو چراو ڕوناکی و و کارەباو گڵۆپ و فەرش و ئاوڕاکێشان و تەوالێت و هەموو پێداویستیەکانی جێ بەجێ بکرێ.

## ( لەموشریکان ) ئاوەدانکردنەوەی مزگەوت ناوەشێتەوە )

خوای گەورە لەسورەتی (التوبە) دەربارەی تەعمیروئاوەدانکردنەوەی مزگەوتدا[1] فەرمویەتی قَالَ تَعَالَىٰ: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا مَسَاجِدَ اللَّهِ شَاهِدِينَ عَلَىٰ أَنفُسِهِم بِالْكُفْرِ ۚ أُولَٰئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ وَفِي النَّارِ هُمْ خَالِدُونَ ﴾ سوورەتی/ التوبة: ١٧) واتە: شایەنی شأنی (کافران) واتەبێ باوەڕان نیە کە (تەعمیری) مزگەوت بکەن ومزگەوت ئاوەدان وەکەن لە کاتێکدا ئەوان (کافران) ئیمانیان بە خوا نییە و خۆیان شاهیدی کوفری خۆیانن هەموو قسەوکردەوەیەکیان بەڵگەیە لەسەر بێ باوەڕیان بەخوا جا چۆن لایەقی شانی ئەوەن مزگزەوت ئاوەدان دەکەن؟ ئەوان بەهۆی (کوفر)و بێ دینیانەوەهەر کردەوەیەکی دەیکەن بەتاڵە و دەچنە (جەهەنەم) وە هەتا هەتایە لەوێ دەمێننەوە خاکیان بەسەر ئینجا خواوەندی گەورەر شایەدی بۆ (ئەهلی) ئیمان و باوەڕ ئەدا بە پێچەوانەی بێ باوەڕەکان و ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ

(1) موفەسیرەکان/ ئەڵێن لەوکاتەدا ئەم چەند ئایەتە دابەزین لەو سەردەمەدا کاروباری مزگەوتی حەرام کەوتبووە/لای موشریکەکان/ واتە بێ باوەڕەکان ئەوجا خواش لەدەرهەقیان فەرمووی..هتد)بڕوانە(تەفسیری ئیمامی قرطبي) بەرگی/٥ لاپەڕە/ ١٠٤.

﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ سووره‌تی/ التوبة: ١٨) واته به‌ڕاستی ئاوه‌دان کردنه‌وه‌ی مزگه‌وتان شایه‌نی شانی ئه‌و که‌سانه‌یه که باوه‌ڕیان به‌خواو پێغه‌مبه‌رو ڕۆژی قیامه‌ت هه‌بێ وه نوێژ ده‌که‌ن و زه‌کات ئه‌ده‌ن و له کاروباری دیندا هه‌ر له‌خوا ئه‌ترسن ئومێد وایه ئه‌و جۆره که‌سانه به (سه‌عاده‌ت) و خۆ به‌ختی دونیاو قیامه‌ت بگه‌ن ، بێگومان بن ئه‌وانه ئه‌و کرده‌وه‌چاکانه ئه‌که‌ن له‌ڕێزی شاره‌زا کراوان دان[1].

**(تێبینیه‌کی گرنگ)**

برایانی خاوه‌ن باوه‌ڕان بزانه ئه‌وه‌دان کردنه‌وه‌ی مزگه‌وت دوو جۆره :

١) ئاوه‌دان کردنه‌وه‌ی (حسی)ی و ئاوه‌دان کردنه‌وه‌ی (مه‌عنه‌وی) ئاوه‌دان کردنه‌وه‌ی (حسی) وه‌کو درووست کردنه‌ی مزگه‌وت وئاوه‌دان کردنه‌وه‌ی وه‌کو کڕینی فه‌رش وچراو گلۆپ و چاکردنه‌وه‌ی ئه‌و شوێنانه‌ی پێویستی به چاکردنه‌وه هه‌بێ ئه‌وه خێری زۆره‌و عه‌لامه‌ت و به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه له‌سه‌ر ئیمان و باوه‌ڕی ئه‌و که‌سه که ئه‌و شتانه ده‌که .

٢) ئاوادان کردنه‌وه‌ی (مه‌عنه‌وه‌یش) بریتیه له‌وه‌ی هاتوو چۆی مزگه‌وت زۆر بکه‌ی تاعه‌ت وعیباده‌ت و خوا په‌رستی زۆری تێدا بکه‌یت به

---

(1) خوای گه‌وره‌له کۆتایی ئایه‌ته‌که‌دا ئه‌فه‌رموێت : ڕه‌جا وایه ئه‌وانه بچنه به‌هه‌شت و خوا لێیان (ڕازی بێت) وه عه‌فویان بکاو به‌مانای ئه‌وه‌یه با ئه‌وانه (کافر و بێ دین) تۆبه به‌که‌ن و بگه‌ڕێنه‌وه بۆ لای خواو ڕوو بکه‌نه مزگه‌وت و هه‌روه‌ها نوێژ بکه‌ن و زه‌کات بده‌ن و به‌ڵکو خوا ڕه‌جه‌یان قه‌بوڵ بکات و عه‌فویان بکات).

زیکرو فیکرو (ئیعتیکاف) و دوعاو پاڕانەوە ئاوەدانی بکەیتەوە هەروەك خوای گەورە لە سورەتی النور دا ئەفەرموێت ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴾ سوورەتی/ النور: ٣٦) واتەبەڕاستی نووری ئایینی خودا لەمزگەوتەکاندا دەردەکەوێت کە خودا فەرمانی داوە دروست بکرێن تاناوی پاکی خودا بە بەرزی وبڵندی تیایاندا ڕابگیرێت وە بەیانیان و ئێواران لە کاتی نوێژەکاندا خودایان تیادا دەپەرسترێت ، جا خوای گەورە/ دەفەرموێت ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوۡمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلۡقُلُوبُ وَٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ سوورەتی/ النور: ٣٧) واتە ئەو خوا پەرستیە لەلایەن پیاوانێکی خواناسی وەها ئەکرێت کە هیچ کاتێك بازرگانی و کڕین و فرۆشتن لەلای خوداو بەبەرز ناوهێنانی (غافلّ) وبیّ ئاگایان ناکات هەروەها لە ئەنجامدانی نوێژ بە دلێکی زیندوو و بێدارەوە وە لە بەخشینی زەکات دوایان ناخات وە سستی تیادا ناکەن ئەوانە لە هاتننی ڕۆژێك دەترسن کە تیایدا هەموو دلێك لەو ڕۆژە دەپەشۆکێت وهەموو چاوێك ئەبلەق دەبێت .

(لە فەزلّ و گەورەیی مزگەوت چەندفەرموودەیەکی حەزرەت ئەخەینە بەرچاو)

١) ئیمامی بوخاری و مسلم (ڕیوایەتیان) کردووە کە پێشەوا عوسمان فەرمویەتی گوێم لەپێغەمبەر بوو (ﷺ) دەیفەرموو (مَنْ بَنى لله مَسْجِداً يَبْتَغي بِهِ وَجْهَ الله بَنَى الله لَهُ مِثْلَهُ في الجَنّة) واتە: هەرکەسیّ بۆ خوا مزگەوتێکی دروست کرد خوا لە بەهەشتدا خانوویەك یاقەصرێکی بۆ

درووست دەكات .

٢) ئیمام احمد و ابن حیان و البزار بە سەنەدێكی صحیحەوە/ لە (ئیبن و العەبباسەوە (خوایان لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە كەوا حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت: (مَنْ بَنَى للهِ مَسْجِداً وَلَوْ كَمَفْحَصِ قَطَاةٍ لِبَيْضِها بَنىَ اللهُ لَهُ بَيْتاً في الجَنَّةِ) واتە: هەر كەسێك بۆ ڕەزای خوا مزگەوتێك درووست بكات با ئەوەندەی هێلانەی (قەتێیەك) بێت كە بۆ هێلكەكانی درووست ئەكات خوا خانوویەكی لە بەهەشتدا بۆ درووست ئەكات.

٣) ئەبو هورەیرە/ ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ غَدا إلى المَسْجِدِ ورَاحَ أعدّ اللهُ لَهُ الجَنّـةَ نُـزُلاً كُلّمَا غدا أوْراحَ) رواه أحمد في مسنده. واتە: (هەركەس بەزۆری بچێتە مزگەوت و بێتەوە خوا بەهەشتی بۆ ئامادە ئەكات كە تیایدا بحەسێتەوە هەر كاتێ ڕۆیشت و گەڕایەوە)، دیسان پێیشەوا (ئەحمەدو ئیبن و ماجەو ئیبن وخوزەیمە و (ترمذي) و حاكم كە بە (صحیح)یان داناوە) گێڕاویانەتەوە لە ئەبو سەعیدەوەكە پێغەمبەر فەرموویەتی: (إذا رَأيْتُم الرَجُل يَعْتَادُ المَسْجِدَ فأشْهَدوا لَهُ بالإيمانِ) واتە: كاتێ بینیتان پیاوێك زۆر هاتووچۆی مزگەوتی كرد شایەتی ئیمانداری بۆ بدەن كەئەو ئەهلی ئیمانە و چوونكە لە ئایەتەكەی پێشوو خوای گەورەفەرموی (بەڕاستی كەسانێك مزگەوتەكان ئاوەدان دەكەنەوە كە باوەڕیان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە) .

٤) دیسان ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕیتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ تَطَهّرَ في بَيْتِهِ ثُمّ مَشَى إلى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتَ اللهِ لِيَقْضي فَريضةً مِنْ فَرائِض اللهِ كَانَتْ خطواتِهِ إحْداها تَحطّ خَطيئَتَهُ والأخْرى

تُرفَعُ دَرَجَتُـهُ) رواه مـسلم، واتـه هەركەسـێ لـه مـاڵی خۆیـدا دەسـت نوێـژ هەڵگرێ وە خۆی خاوێن بکات وە لە پاشان بڕوات بۆ ماڵی خوا (مسگەوت) بـۆ ئـەوەی فـەرزێك لـە فـەرزەکانی خـوا بـەجێ بگەیـەنێ هـەر یـەکێ لـەو هەنگاوانەی ئـەینێت گونـاهو تـاوانێکی پـێ ئەسـڕێتەوە وە ئـەوەی تریـان پلەی پێ بەرز ئەبێتەوە.

٥) هـەروەها لەئـەبو دەرداوە ئەگێڕنـەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) کـەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەموویەتی: (المَسْجِدُ بَيْتٌ لِكُلِّ تَقِـيٍّ وتَكَفَـلَ اللهُ لِمَـنْ كَـانَ المَسْجِدُ بَيْتَهُ بِالرُوحِ والرَحْمَةِ والجَوازِ عَلى الصراطِ ألى رِضْوانِ اللهِ إلى الجَنَّةِ) رواه الطبراني والبزار/ واتـه مزگەوت مـاڵی هـەموو لـەخوا ترسـێکه وە خـوا کەفیلی ئەو کەسانەیه به ڕەحم و بەزەیی خـۆی و پەڕاندنـەوەی لـه پـردی سیرات و بەرەو ڕەزامەندی خواو بەرەو بەهەشتی دەبات.

## (تێبینیەکی گرنگ)

بەڕێز مامۆستا (مەلا محمدی شەلماشی) لەهەندێ ووتـارو ئامۆژگـاری[1] دائەفەرموێت بەڕاستی مزگەوت ماڵی خوایه نوێـژ کـەریش میـوانی خوایـه، دیاره خاوەنماڵ ڕێزو (حورمەتی) میوانی لایه، وە دەبێ به شتێك دڵخۆشی بکـا باشـترین و گـەورەترین بینـا لـە(ئـەجر) و سـەوابدا بینـای مزگەوتـه پێغەمبەری ئیسلام (صەلات و سەلامی خوای لێبێت) که له شـاری مەککـه کۆچـی کـرد هـات بـۆ مەدینـه/ یەکـەم هـەنگاوێك/ کـه ببینـای مزگـەوتی/

---

(1) بڕوانه/ پەرتوکی (ووتاری ڕەمەزان) لەنووسینی مامۆستا (مەلا محمدی شەڵماشی)، لاپەڕە/ ١٦٦/ لەگەڵ دەستکاری و کورت کردنەوە.

درووست کرد بەدەستی (موبارەکی) خۆلو بەردی ئەکێشا وە ئیشی تێدا ئەکرد بۆ ئەوەی دینی ئیسلام بەهۆی مزگەوت و ماڵی خواوە پەرە بستێنێ چوونکە بێگومان ئەو خزمەتەی مزگەوت بەموسڵمانانی دەکات هیچ دانیشتگاو (مەدرەسە) و خەستەخانەیەك ناتوانێ بیکا مزگەوت شوێنی تاعەت و عیبادەت و خواپەرستیە جێی نوێژ کردنە، جێگای (دوعاو پاڕانەوەیە) لەبەر خوای گەورە، دانیشتنگایەکی گشتی یە بۆ هەموو ئینسانێکی موسڵمان هەروەها کارت و ئیجازەو شەهادەی ناوێ بۆ (فەقیرو) دەوڵەمەند گەنج و پیر شاو گەدا وەك یەکە (مەدرەسەی) ئەخلاق و خوڕەوشتی بەرزە ئەو خزمەتەی مزگەوت بە ئادەمیزادی ئەکات کام دانیشتگاو خەستەخانە توانیویانە یا دەتوانێ بیکە؟ لە کام جێگادا ڕۆژێ پێنج جار بانگی حەزرەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) بەئاشکرا دەگوترێ وە دەنگی (الله أكبر) بە گوێی موسڵمانان ڕادەگا لە مزگەوت نەبێ؟ کام دانیشتگا و (مەکتەب) و خەستەخانە وەك مزگەوت شەوو ڕۆژ دەرگای لەسەر پشتە بۆ هەموو کەس؟ مزگەوت مستەشفاو خەستەخانەی دڵ و دەروون و نەفسی ئادەمیزادە، مەدرەسەی فێربوونی قورئانە، دەرسی (ئەدەب) و حورمەت و سەبرو کەرامەت لەمزگەوتا دەگوترێتەوە ، ئەو هەموو مەکتەب و مەدرەسانە (حکومەت) درووستیان ئەکات ئەو هەموو مەسرەفەیان تێدائەکات هەربۆ کۆمەڵێکی تایبەتیە بەڵام کێ هەیە کاری بە مزگەوت نەبێ ، خۆ ئەگەر موسڵمانی ڕاستەقینەش نەبێ کارە سەر ئاوو خواردنەوەو چاوشوشتنی بەمزگەوت هەر هەیە ئەگەر هیچ نەبێ کە مرد تەرم و جەنازەکەی دەبەنەمزگەوت ، ئینجا مادام مزگەوت ئەو دەورە دەبینێ ئەو خزمەتە بە تەواوی کۆمەڵ دەکا با ئێمەش هەمومان چاومان

له مزگەوت بێ با خزمەتی بکەین و نەهێڵین پیس بێ پاك و خاوێنی بپارێزێ له ماڵی خوا دڵی کەس ئەزیەت نەدەین با نەبینە (مانیعی) خەڵك ئامان سەد ئامان دەخیل سەد دەخیل قەت مەبنە هۆی خراپ کردنی مزگەوت بۆئەوەی خواپەرستی تێدا نەکرێ؟ هەروەها خوای گەورە لە سوورەتی (البقره) دا ئەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ﴾واتە : کێ لەو کەسە زاڵم ترە کە (مەنعی) مزگەوت بکا لە خەڵك و نەهێڵی یادو زیکری خواو نوێژی تێدا بکرێ و هەوڵبدا بۆ خراپ کردنی مزگەوت واتە کەس لەو کەسە (زاڵم تر نیە) کە دەبێتە هۆی وێران کردنی مزگەوت و هیچ زوڵمێکیش لە وێران کردنی مزگەوت گەورەتر نییە).

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ سوورەتی/ البقرة: ١١٤) واتە: (ئەوکەسانەی هەوڵ دەدەن بۆ (خراپ کردن) و (وێران کردنی) مزگەوت بە ترسەوە نەبێ ناتوانن بچنە مزگەوت لە دونیادا خوا زەلیلیان دەکاو لە قیامەتیشدا تووشی سزاو عەزابی زۆر گەورەو سەخت دەبن) پەنا بەخوا؟ خوێنەوارە ئازیزەکان ئیمانداران مزگەوت ماڵی خودایە خاوەنی ماڵی خوا خۆیەتی دەبێ ئێمەش بەپاك و خاوێنی و حورمەتەوە تەماشای بکەین و بچینە مزگەوت هەروەها دەست نوێژ هەڵگرین و جلێ و بەرگی خاوێن و پاك لەبەر بکەین ئینجا کە چووینە مزگەوت ئەبێ بە ترسوو لەرزو بەئەدەبەوە بێت وە دوو ڕکعات نوێژی تەحیەتی (مەسجد) بکەین چوونکە سونەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) ،خوای گەورە بە بەنی ئادەم ئەفەرموێت

﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ ﴾ سـوورەتی الأعـراف: ٣١، واتـە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم هەر کە دەچنە مزگەوت بۆ نوێژو هەر خواپەرستیەکی تر جل و بەرگی جوان وپـاك و خـاوێن لەبەربکـەن، ئـەوجا هـەروەها بـزانن خوای گەورە بۆ فەرموویەتی کە چوونەمزگەوت و ماڵی خوا خۆتـان ڕێـك و پێك بکەن و پیس و چڵکن مەبن وەسوننەتە بۆنی خۆش لەخۆت بـدەی وە جل و بەرگت خاوێن بن پۆشاکی جوان لەبەر بکەن، جا برای خاوەن ئیمان ئەگەر تۆ کە بـچیتە لای پیـاوێکی گـەورەی دونیـایی هـەتا بـۆت ئـەکرێ و دەسـتت ئـەڕوات خـۆت دەخـەملێنی و ئەڕازێنیتـەوە ئـەدی بـۆ ئـەوەی تەنەفورت لێ نەکاو توورە نەبێ وڕێزت بگرێ، ئـەی خـۆ مزگـەوت بارەگـای خوایە وە خاوەن بارەگا کە خوا خۆی خاوەنیـەتی و تـۆش دەچیتە مـاڵی خوا بۆ نوێژو خوا پەرستی کە گفتوگۆیە لەحزوری خوادا دەکەی.

دووەم) هەروەها پیسو چڵکنی هەم دەبێتە هۆی نارەحـەتی و ئەزیـەت دانی فریشتەکان و موسڵمانان بەتایبەتی ئەگەر (سیر) و (تورت) خـواردبێ وە یـا بۆنـت نـاخۆش بێـت وە شـەرعەن (حەرامیـشە) مەلائیکـەت و بـەنی ئادەم ئەزیەت بدەی .

**( پاشکۆ )**

لەئەبو بوردەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پیاوێك لە مزگەوتدا هـاواری بۆ شتێکی گووم بووی خـۆی ئـەکرد (هەنـدێك لـەزانایان ئـەڵێن، ووشـترێك بـووە پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی(لاَ رادَّكَ اللهُ إنمَّـا بُنِيْـت المَـسَاجِدَ لَمـا بُنَيْتُ لَهُ) رواه الإمام البخاري، واتە: یا خوا نەیدۆزیتەوە یاخوا نەکەوێتەوە دەستت ئەی مەگـەر نـازانی مزگـەوت تـەنیا بـۆ خواپەرستی بینـا کـراوە،

وەهەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) لەفەرمودەیەکا ئەفەرمویّت: (إذا مَرّ أحَدٌ بِسهامٍ أنْ يَقْبَض عَلى نِضالِها لِئَلاّ يؤذيَ النّاس) واتە: هەرکەسێك بیەوێ بەناو مزگەوتا تێپەڕێ با بمینێتەوە (سیلاحی) پی ٚ بوو (وەك تیرو شمشێر و یا تفەنگ وە چەکیشی پێ بوو دەبا باش بزانێ تیرەکەی (مەحکوم) بکا مەترسی دەرچوونی نەهێلێت تا خەڵکی ئازار نەدات). دیسانەکە لەبارەی پیس بوونی مزگەوتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (البَزاقُ في المَسْجِد خَطيئَةٌ وكفّارَتُهَا دَفْنُهَا) رواه الإمام االبخاري، واتە: (تف وبەڵغەم ڕووکردن لەناو مزگەوت گوناهە شاردنەوەی و نەهێڵانی تفەکەش گوناهەکە دەسڕێتەوە) کەواتە با تا لەتوانامانداییە کاتێ چووینە مزگەوت پاکو خاوێن بین و جگە لەمەش قسەو قسەلۆکی دونیای لەناو نەکەین وە هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:

(سَيَكُونُ في آخرِ الزّمانِ قَوْمٌ يَكُونُ حَديثُهُمْ في مَساجِدِهِمْ لَيْسَ لله فِيهُمْ حَاجَة، رواه إبن حِبان في (صحيحه) واتە لە ئاخر زەماندا خەڵکێك پەیدا ئەبن قسەو باسی دونیایان لەناو مزگەوتەکاندا دەکەن خوای گەورە تەمای پێیان نییە چوونکە خێریان پێوە نییە). خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت و پێغەمبەرەکەت عەفومان بکەی/ خوایە بۆ شەرەف و حورمەتی مزگەوت عەفومان بکەی/ خوایی تاعەت و عیبادەتمان قەبوڵ بکەی/ خوایە لەبەڵاو موسیبەتی دونیاو قیامەت بمان پارێزی ئامین) أعوذُ باالله من الشيطانِ الرجيم يا أيها الذين آمَنوا إتَقوا الله وَلا تَموتُنَ إلا وَأنتُمْ مُسْلِمُونَ).

(نَبهَني الله وإيّاكُمْ مِنْ نَومَـة الغَافلين وَحَشَرَني وإيّاكُمْ تَحْتَ لِواء سَيِّد المُرْسَلِينْ وبَعد أعُوذُ بِالله مِنّ الشَيّطان الرّجيم رَبَنّا آتِينا في الدُّنيا حَسَنَة وفي الأخرة حَسَنَة وقِنّا عَذَاب النّار أُدْعوا الله وأنتم مُوقِنونَ بالإجابَة).

# ئامۆژگاری شەست و سێ

## باسی ناوبژیکردن لە نێوانیانداو وە عەفو کردن و لێبوردن ئەکات

الحَمْدُ للهِ الذّي جعَلَ البِّر مَجْمَعاً للْخِصالِ الحَميدةَ والإصلاحِ بَيْنَ النّاس جَلْباً للألْفَة والمَحّبَةِ نَحْمَدهُ سُبْحانَه وتعالى ونَشْكُره على التوفيق والهداية ونَسْتَغْفِرهُ ونَتُوبَ إليهِ مِنْ كلّ ذنُوبِنّا الصَغيْرةَ ومِنْها الكَبِيرةَ ونَشْهَدُ أنْ لاَ إلهَ إلاّ الله عَالِم الغَيْبِ والشّهادة أمَر بالأحسانِ والصُّلح والعفوَ عِنْدَ المَقْدِرَةَ ونَشْهد ان سَيّدنَا مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُولهُ وَسَيّدْ البّرِيةْ والصّلاة والسلامُ على سَيّدنا مُحَمّد يحبّ الوفَاقَ ولاَ يَرضى بالنّزاع والنِّفَاق والشّقاق، أمّا بَعْد أيّها المُسْلُمون أوْصِيكُمْ عِبَادَ اللهِ بتَقْوا اللهِ وطَاعَته، واتە: لە دوای هەندێ ئەی موسڵمانەکان وەسیەتتان لێ دەکەم ئەی عەبدەکانی خودا بەردەوام بن لە پەیڕەوکدرنی خودای گەورە/ وە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودای گەورەو مەزن، هەروەها ئیماندارەبەڕێزەکان لەم ووتاروەو ئامۆژگاری ئێستاکە باسی (سوڵح وئاشتی وناوبژی و لێبوردنتان بۆ دەکەم کە چەند (خێرە) تا بزانی کە سولح و ئاشتی و عەفو کردن چەند خێرەو هەروەها شەڕو کێشەو هەرواو هۆریا چەند خەراپە، ئینجا خوای گەورە لە سورەتی (الانفال) دا فەرموویەتی: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ سوورەتی/ الأنفال: ١ ) واتە: (لەبەینی خۆتاندا (سولّح) و ئاشتی بکەن وە لە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا دەرنەچن ئەگەر موسڵمانن وەخۆتان بە خاوەن ئیمان دەزانن) .

**(ئەگەر دوو کۆمەڵ لە موسڵمانان ناکۆك بوون(صلح) لە بەینیان بکەن و ئاشتیان بکەنەوە)**

خــوای گەورەلــە قورئانــدا ئەفــەرموێت: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ﴾سوورەتی/ الحجرات/ ٩) واتــە: ئەگــەر دوولایــەن یان دوو دەوڵەت یان دوو هۆز لە ئیمانداران ناخۆشــی کەوتــە نێوانیــان وە لەگەڵ یەکتریدا بەشەڕ هاتن ئەوا ئێوە بکەونە نێوانیان وە هەوڵ بـدەن بـە ئامۆژگاری لەگەڵ یەك ئاشتیان بکەنەوە.

**(هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە)** (١)

یەکەم) مارُوِيَ البخاري ومسلم في الصحيحين من حديث، (أنس بن مَالك) (رضي الله عنه) قَالَ قِيلَ يَا رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) لَوْ أَتَيْتُ عَبدالله بنْ أبي إبْن سلول) فَرَكَبَ حِمَاراً وأنْطَلَقَ مَعَهُ المُسْلِمُونَ يَمْشُون فَلَّما أتَاهُ النَبّي (صلى الله عليه وسلم)قالَ إليْكَ عَني فوَالله لَقَدْ آذاني نَتْنُ حِمَارِكَ فَقَال رَجلٌ مِنْ الأنْصَار والله لَحِمارُ رَسُول الله أطيَبَ رَيحاً مِنْكَ فغضَبَ لِعبدالله رَجلٌ مِنْ قومه وَغَضَبَ لِكلّ واحدٍ منْهُمَا أصْحَابُهُ فَكانَ بَيْنَهُم ضَرَبُ بالجريدِ والأيدي والنّعال فَبَلَغَنا أنَهُ أنْزلَتْ فِيهُم ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ ﴾واتـە: (بوخـاری و موسلیم) لە ئەنەسەوە (خوا لێی ڕازی بێـت) ئەگێڕنـەوە: پێغەمبـەر (ﷺ) بەسواری گوێ درێژێك لەگەڵ کۆمەڵێ موسڵمانەکان تەشریف دێنێت بۆلای (عبدالله ی کوڕی ئبن و ئەبی سەڵوڵ) جا کاتێ (عبدالله) چاوی بە پێغەمبەر

---

(١) بڕوانە (زاد الميسر في علم التفسير) دانورای (أبي الفرج عبدالرحمن بن علي إبن الجوزي) تحقيق عبدالرزاق المهدي، بەرگی/ ٤ /لاپەڕە/ ١٤٧.

(ﷺ) کەوت پێی ووت لێم دوور کەوە سوێند بەخوا بۆگەنی (کەرەکەت) ناڕەحەتی کردووم لەم لایشەوە پیاوێکی (ئەنسار) واتە یارمەتیدەر وەڵامی دایەوەو فەرمووی (واللە لَحِمَارُ رَسُول اللە أطْیَبُ ریحاً مِنْكَ) واتە: سوێند بەخوا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لە بۆنی تۆ خۆشترە لەو لاشەوە پیاوێکی خزمی (عبداللە)ی کوڕی ئوبەی لە پیاوە یارمەتیدەرەکە تووڕە بوو دەرەنجام بە پێڵاوو تاکە نەعل ومستەکۆڵە هاتن بە یەکاو خەریك بوو شتەکە گەورە بێت ، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ ﴾ی ناردە خوارەوە.

دووەم) لە (ڕیوایەتێکی) تر دەڵێت ئەو ئایەتە سەبارەت بە جەنگ و ئاژاوەی نێوان (ئەوس) و (خەزرەج) هاتووە جا شیاوی باسە ئەویش دەگەیەنێ جا هەروەها بێگومان خوا لە قورئاندا لە گەلێك جێگادا ناوی سولح وئاشتی هێناوەولەم جێگایەشدا ئەفەرموێت ﴿ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ ﴾ سوورەتی النساء: ١٢٨ واتە: دیارە ئاشت بونەوەو ڕێك کەوتن زۆر خێرەو هەروەکو پێغەمبەریش (ﷺ) ئەفەرموێت (الصّلْحُ سَیدُ الأحْکامِ) [١] واتە: سوڵح و ئاشتی گەورەی هەموو یاسا و حوکمێکە).

## (ئاگاداربیەك)

جا پێویستە بزانین تا ناکۆکی لەبەینی خۆمان لانەبەین ناتوانین سولح

---

(١) بڕوانە پەڕتوکی (تیسیر الوصول إلى أمثال وَحِكَم الرَسُول (ﷺ) لە نووسینی ( محمد عبدالرحیم الدمشقی) لاپەڕە/٢٨٣، هەروەها (ربیع بن حبیب ) لە موسنەدا هێناویەتی بەم شێوەیە (الصلحُ خَیرُ الأحکام) بڕوانە (المسند) بەرگی/٢، لاپەڕە /٤٧.

وئاشتی لەبەینی خەڵکدا بکەین جا بێگومان لە (ئاخری) ئایەتەکەی پێشووداخوا ئەفەرموێت (ئەگەر هاتوو یەکێکیانبە قسەی نەکردن زوڵم لەوەی تریان کرد ئێوە بەگژیدا بچن و مەهێڵن زوڵم بکات تا دەگەڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاساتی خودا، جا ئەگەر دەستی هەلگرت و گەڕایەوە ئەوا ئێوە بەدادگەری سولح و ئاشتیان لەبەین دابکەن چوونکە موسڵمان هەموویان برای یەکن ودەبێ برایانە بژین لەگەڵ یەکدا .

(عن أم كلثوم) (رَضي الله عنها) قَالَتْ سَمِعتُ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) يَقُول لَيْس الكَذّاب الذّي يُصْلِح بَيْنَ النّاس فَيَنْمي خيراً وَيَقُول خَيْراً) متفق عليه، واتە: ئەم کەلسوم (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەیفەرموو بەو کەسە ناگوترێ درۆزن کە خەڵك ئاشت دەکاو ڕێکیان دەخاتەوە وە قسەی باش لەنێوانیاندا دێنێ و دەبا ئەو قسەیەش کە دەیکا لەوبەینەدا خۆی درووستی بکا (وعَنْ عَائِشَة (رَضي الله عنها) قَالَتْ سَمِعَ رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) صَوْتَ خَصُوم بِالبَاب عَالِيةٌ أصْواتِهُمَا إذْ أحدهما يَسْتَوضِح الآخر ويَسْتَرفقه في شيءٍ وَهُوَ يَقُول (والله لا أفْعَلَ) فَخَرَجَ عليْهُمَا رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) فقال أيْنَ المُتالِيَ (على الله) لا يَفْعَلُ المعروف؟ فَقَالَ أنَا يَا رَسُول الله فَلَهُ أي ذلك أحب) متفق عليه ، واتە خاتوو عائشە (خوا لێی ڕازی بێت) .

فەرمووی حەزرەت (ﷺ) گوێی لە قرە قرێ بوو لە پشت دەرگاکەوە هاوداواکان کردبویان بە هەراو هۆریا ئینجا قەرزارەکە داوای لە خاوەن قەرزەکە دەکرد کە دڵی بەحاڵی بسوتێ هەندێ لە قەرزەکەی سەری بۆ ڕابکێشێ ئەویش دەیگوت بەخودا نایکەم ، حەزرەتیش (ﷺ) تەشریفی دەرچوو بۆلایان و فەرمووی ئەوەکێیەبەخوا سوێند دەخواو دەیکا بە

بەلگەو بیانوو بۆ ئەوەی کەچاکە/ نەکات ؟ خاوەنی قەرزەکەش ئەوە منم ئەی پێغەمبەری خوا کەوا هاورێکەم چۆن حەزدەکا با وابێ چەندم لە قەرزەکەم دەداتەوەکەیفی خۆیەتی .

## (سەرنجێکی گرنگ)

(خولاصە) شەڕو ئاژاوە لە بەینی هەر دەستەو تاقم و کۆمەڵێك دابێ زەرەو زیانی ئەبێ هەروەها قەت سوودو قازانجی نییە جا شەڕو ئاژاوە لەبەینی هەر دستەو تاقمێك کۆمەڵێك دابێ زەرەو زیانی ئەبێ هەروەها قەت سوودو قازانجی نییە جا هەروەها بەڕاستی ژیان بە شەڕوعەداوەت بۆکەس خۆش نییە چوونکە براله برا جوودا ئەکاتەوە و کات بە فیڕۆدان وماڵ وێرانی و خەم و خەفەت و سوێند بەدرۆو زوڵم کردن وماڵی یەکتر بەناهەق خواردن، ماڵ سوتن و تەنانەت پیاو کوشتنی تێدایە چوونکەبەڕاستی ئینسانی خاوەن دووژمن شەوێك بە ئاسودەیی ناخەوێ لەخۆی ئەمین نییە، جا لەبەر ئەو هەموو هۆیانەیە کە خوای گەورە لەچەند ئایەتدا وە حەزرەت لەچەند (حەدیسدا) ئەمریان پێ کردووین کە نەك هەر لە بەینی خۆماندا شەڕو ئاژاوە نەهێڵین بەڵکو دەبێ ئەگەر زانیمان برای موسڵمانیشمان یا دوو (تائیفە) لە موسڵمانان بوو بە شەڕو (نیزاعیان) بەهەرجۆرێ بێ سوڵح و ئاشتیان بخەنە بەینەوە وەئاشتیان بکەنەوە واتە هەموو بەخۆشی ژیان بەرنە سەرو لەجێگای خراپە چاکە لەگەڵ یەکتریدا بکەن و وولات ئاوەدان کەین، بتوانین باشتر خواپەرستی بکەین ، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرموویەتی (گەورەترین خێرو سەدەقە

ئاشتی لەبەینی خەڵکی دایە سولح و ئاشتی و سەواب وپاداشتی قیامەتیشی زۆرە) چوونکە خوای گەورە لە سورەتی (ئالی عمراندا) مەدحی ئەو کەسانەی کردووەکە ڕقی خۆیان دەخۆنەوە لە خەڵك خۆش دەبن و (عەفویان) دەکەن وەکو ئەفەرموێ ﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ﴾ سوورەتی/ آل عمران: ١٣٤) ئەو کەسانە تەقوای خوا ئەکەن خوا لێیان ڕازی یە کە لە کاتێ دەست ڕۆیشتندا ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە وە لە ناحەزو دوژمنانیان خۆش ئەبن، جا بێگومان عەفو و لێخۆش بوون دەبێتە مایەی سولح و ئاشتی و سەواب و پادشاتی دوارۆژیش/ چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە (حەدیسدا) فەرموویەتی: (مَنْ كَظم غَيْظاً وَهُوَ قَادرٌ عَلى أنْ يَنْفَذَهُ دَعاه الله عَلى رُؤوس الخَلائِق يَوْمَ القيامَةَ حَتّى يُخَيرُ مِنْ أي الحورِ شَاءَ)، رواه البيهقي، واتە: هەر یەکێك شەڕو (نیزاعی) لەگەڵ یەکێك بوو دەستی بەسەردا ئەڕۆیشت کە ڕقی خۆی پێ بڕێژێ بەڵام ڕەکەی بخواتەوەو سوڵحی لەگەڵ دا بکاتەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت لەپێش چاوی خەڵك بانگی ئەکات پێ دەڵێت لە پاداشتی ڕق خواردنەوەکەت و ئاشتیت لەگەڵ فلان کەس دا بە ئارەزووی خۆت لەو حۆرییانە هەڵبژێرە .

**( پاشكۆ )**

**(العَفْوُ عِنْدَ المقْدِرَةَ) :**

واتە لێبوردن لەکاتی دەسەڵات، جا هەروەها دەگێڕنەوە جارێك سێ گەنجی مەردانە لەبەر دادگایی پێشەوا حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای

لێبێت) ڕاگرتبوو، داوایان دەکرد ئـەو پیـاوە باوکمـانی کوشـتوە کـابراش دانی بەو تاوانەی خۆی هێنابوو کە ئەڵێ ڕاستە کوشـتومە بـەڵام پێویـستم بە یارمەتی سێ ڕۆژ مۆڵەت هەیە چوونکە هەندێ ماڵی شاراوەم هەیە کەس نازانێ لەکوێم شاردۆتەوە ، جا ئەگەر مۆڵەتم بدەن و بـڕۆم شـوێنەکەی بـە منداڵـەکانم بڵـێم وپێیـان ئاشـنا بکـەم بـۆ ئـەو مەبەسـتە جـا (ئـەبو زەڕی غەفاریش) خوا لێی ڕازی بێت) بـوو بـە (کـەفیل) و تـا دەگەڕێتـەوە بـەڵام لەدوای سێ ڕۆژەکە کابرا دیارنەبوو بۆیەخەریك بوون تۆڵەی ئەو پیـاوە لـە (ئەبو زەڕ) بکەنەوە کە بووبووە (کەفیلی) و ئینجا لـەکاتی کوشـتنی ئـەبو زەڕ ئەو پیاوە گەڕایەوەو ئامـادەبوو بـە جـل و بـەرگێکی تـۆزو خـۆڵاوی و ئـەوجائیمامی عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) پرسـیاری لێکـرد چـۆن بـوو لەوکاتەدا گەڕایەوە کـە دەتزانـی دەتکـوژین و توانـای ڕاکردنیـشت هـەبوو کابرا گووتی (خَوْفَـاً مِـنْ أنْ يُقَـالَ ذَهَـبَ أهْـلُ الوَفَـاءِ بِالوَعِيـدْ) واتـە: لـەوە ترسام بڵێن پیـاوانی پـەیمان و بـەڵێن بردنـە سـەر نـەماون ئینجـا ئیمـامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) ئەمجارە بە (ئەبو) زەڕی فەرموو ئـەتۆ چـۆن بویە کەفیلی ئەو پیاوە خۆتۆ نەتدەناسی؟ ئەبو زەڕ گووتی (خَوْفاً مِـنْ أنْ يُقَـالَ ذَهَـبَ أهْـلُ المُـرُوءَةِ والكَـرَمِ) واتـە: دەترسـام بڵـێن پیـاوی خـاوەن (هیممەت) و ڕێزو کەرەم نـەماون، ئینجـا لـە دواییـدا هـەموو کـوڕانی بـاوك کوژراوەکەش کابرایان (عەفوو) کرد و گووتیان (ونَحْنُ عَفَوْنَا وسَامَحْنَا حَتَّى لايُقَال ذَهَبَ أهْل العَفْوُ عِنْدَ المَقْدِرَةَ) واتە: بۆئەوە دەیبەخشین هـەتا نـەڵێن پیاوانی بەخشندە لەکاتی تواناو دەسەڵاتدا نەماون).

**(كەس هێندەی پێغەمبەر (ﷺ) عەفوو لێبردنی نەبووە ؟)**

(ئەهلی سیرە) دەگێڕنەوە (عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل) لەپێشدا کەباوکی لەشەڕی بەدر کوژرا ئینجا عەکرەمە دوژمنارییەکی گەورەی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد (ﷺ) تاچەند هاوەڵی پێغەمەری (شەهید) کرد زۆر نارەحەت بوو پێی ئەوجا کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) مەککەی گرت ئەولە ترسی پێغەمبەر (ﷺ) ڕای کردو هەلأت بۆ سەر(دەریا) و تا وولأتی (عیجان) بەجێ بێلێ جا ژنەکەی کچی (حارسی کوڕی هیشام) بوو لەپێش (فەتحی شاری مەککە) دا بەدزی ئەو موسڵمان بوو جا چووە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەمانی بۆ هێناو خواست ، کەپێغەمبەر (ﷺ) ئەمانی دا ژنەکەی چوو هێنایە خزمەت پێغەمبەری ئیسلام کە پێغەمبەر(ﷺ) چاوی پێکەوت (زۆی پێ ناحۆش بووبەلأم هەر عەفووی کرد ئینجا (عیکرەمە) کەوای زان یەکسەر موسڵمان بوو وە لەکۆتاییدا بوو بە یەکێك لە پاڵەوانەکانی ئیسلام تا لە غەزای (یەرموك)دا شەهیدکرا، جا خاوەن باوەڕان خوای گەورە لەسورەتی (الشُّوری) دا ئەفەرموێ ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴾سوورەتی/ الشوری: ٤٠) واتە هەرکەسێك ئەو کەسە (عەفوو) بکا کە غەدر و ستەمی لێکراوە جا لەگەڵی ئاشتەوەبێ و سوڵحی لەگەڵدا بکە ئەوا خوای گەورە زیاتر لەحەقەکەی خۆی پادشاتی ئەداتەوە جا بۆ نموونە خوا بەرامبەر بە بکوژی دەستەئەنقەست (قیصاص)ی داناوە کەچی لەم ئایەتدا هەڵی دەنێت بۆ لێبرودن و عەفولێی) .

(خوایە بەگەورەیی خۆت عەفومان بکەی خوایە سولح و ئاشتی

بخەیتەناو دڵی موسڵمانانەوە ، خوایە لە شەڕو ئاژاوە بەدوورمان خەی ، وە لەبەڵاو موسیبەت بمانپارێزی ئامین).أعوذُ باللهِ من الشيطان الرجيم/ إنَّ في هَذا لَبلاغاً لِقَومٍ عابدين أقُولُ قَولِي هَذا وَأسْتَغْفِرُ الله لِيَ ولَكُمْ ولِسائرِ المُسْلمِين، نَبّهَني اللهُ وإيّاكُم من نَومَةِ الغَافلِينْ وَحَشَرَني وايّاكُمْ تحْتَ لِواءِ سَيِّد المُرْسَلينْ، اللّهُمَ اغفرْ لَنَا آمِين).

# ئامۆژگاری شەست و چوار
## باسی ئەهلی تەصەوف و ئەهلی طەریقەت ئەکات

الحَمْدُ لله الذّي حَبّبَ لَنَا الإيمانَ وكَرّهَ إلَينَا الكُفْرَ وَالفُسوقَ والعِصْيانَ نَحْمَدُهُ سُبْحَانَهُ وتَعَالى ونَشْكُرُهُ علی جَزيل أنعامه وَنَسْتَمِدُّ منْهُ العَوْنَ للقيام بمَا يَليقُ بِرُبوبيّته والصّلاةُ والسَلامُ عَلَى سَيِّدنَا مُحَمّد إمَام الأولين والآخرينَ عَلّمَهُ رَبّهُ فأتْقَنَ تَعْليمَهُ وَأدَ به فَأحْسَنَ تأديْبهُ وَطَهرَ بنَفَحاته القُدْسيَة قَلْبُه وزَكَى بأنواره الرّبَانية رُوحَهُ أرْسَلَهُ بالهُدَى ودين الحَق فَبَلّغَ الرسَالةَ وَأدّى الأمَانَةَ ثُمّ قَيّضَ اللهُ سُبْحَانَهُ وتَعَالى مَنْ يَحْفَظَ أُمّتَهُ منْ بَعْده فرَزَقَهُ منْ عَطَائه أكْرَمَ ذُرِّيَةَ وَطَهّرَهُمْ من الرِّجْسِ تَطهيراً جعَلَ منْهُم ومن أصْحَابه أعْظَمَ أئمَةَ في هذه الأُمّةَ ليُقْتَدي بهُمْ مَنْ أرَادَ أنْ يَتَخذَ إلى رَبِّه سَبيلاً فَكَانُوا ولأزالُوا رَواداً للْحَق ورَائدين للْسَالكينَ حَتّى يَبْقَى نُورُ الإيمانِ وضَاءَ في القلُوبِ وأئمَةَ الهُدَى هؤُلاءِ أهْلُ سَعادةَ أبديّة في سَوابقِ الأزلِ (أحَبّهُم اللهُ فَأحَبُّوُهُ) وآثَرهُمْ وآثَرُوُهُ ونَصَرُوُه فَنَصَرَهُمْ أولائكَ (حزْبُ الله ألاَ إنّ حزْبَ الله هُمْ المُفْلحُون) مَنْ يُطع اللهَ وَرَسُولَهُ فقَدْ رَشَدَ وَاهْتَدى وَمَنْ يَعْصَى اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ غَوىَ وأعْتَدَى). أمَا بَعْد فيَا أيّها المؤمنون يَقُول سُبْحَانَهُ وَتَعَالى في القُرآن الكَريم:

واتە لەدوای هەندێ ئیماندار موسڵمانەکان خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ﴾سوورەتی/ الكهف: ٢٨) واتە: دان بەخۆتا بگرە (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ ئەوانەی کە بەیانیان و ئێواران لە

پــــەروەردگاریان دەپارێنـــەوە وە دەی پەرســـتن و تـــەنیا ڕەزامەنـــدی ئەویشیان دەوێ (تُشير عبّاد الله هذه الآيةِ الكَريمة ألى عِبـاد الله الـصالِحين الذّين يَعْبُدُون الله عبادةً طاهِرةً) واتە: ئەم ئایتە ئاماژە بۆ ئـەوە ئـەكات كـە ئەو بەندە (صالحانە) خواپەرستی ئەكەن بە خواپەرستیەكی پاك و خاوێن.

**(سەرنجێكی گرنگ)**

جا هەروەها بێگومان ئەو كەسـە كـە قورئـانی پـیرۆز بخوێنێـتەوە بـە فیكرێكی تیژ بڕوانێ بۆ دینی ئیسلام باش حاڵی ئەبێ كە دیـن (عیبارەتـە) لە پەیوەندی و عیلاقەیەكی ڕاست لەگەڵ پەروەردگاری عالەمەدا، مەشغول بوونە بە زیكرو طاعەت و پاك كردنەوەی (نەفس) لە سـیفاتی ناهـەموار بـۆ ئەوەی بتوانێ عیبادەتی (خالص) و بێگەرد لە هەوا بكا بۆ خـودای تـەعالا وە لەگەڵ ئەم ئایەتـەدا ئـەم مەوزوعـە بـەیان كـراوە، مـەنعی غەفلـەت لـە ئینـسان كـراوە، جـا هـەروەها ئەفەرموێـت ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ الشمس: ٩ — ١٠ واتە بەڕاستی ڕزگـاربووەو دەبـێ ئـەو كەسەی (نەفسی خۆی پاك كردۆتەوەلە ڕەزائیل وە مـەحروم و بـێ بـەهرە بووە لە پیرۆزی كەسێ كەوا (نەفسی) خۆی بە پیسی هێشتبێتەوە.

(ئـەم چـەند ئایەتانـەی خـوارەوە دەلیـل و بەڵگـەن لەسـەر ئـەهلی تەصەوف و ئەهلی طەریقەت)

جا هەروەها خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴾ســوورەتی/ الأعلـی: ١٤ — ١٥)وە فەرموویـەتی بـە حـەزرەت

(ﷺ): ﴿ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾ سووره‌تی/الأعراف:٢٠٥)وه فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾ سووره‌تی/ الأنعام:٥٢) وه فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ سووره‌تی/ الكهف: ٢٨ )وه فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ سووره‌تی العنكبوت: ٦٩ وه فه‌رموویه‌تی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ سووره‌تی/ التوبة: ١١٩) وه فه‌رموویه‌تی: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ سووره‌تی/ البينة: ٥) وه هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی: ﴿ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴾ سووره‌تی/ آل عمران: ٧٤).

**( ئاگاداریيه‌كی گرنگ )**

وه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه ئوممه‌تی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) چاككترین ئوممه‌ته وه ئه‌صحابه‌كانی حه‌زره‌ت (ﷺ) باشترین ئینسان بوون له (جیهاندا) چه‌ند كه‌سێ له ئه‌صحابه‌كان له (عه‌هدی) حه‌زره‌تدا نه‌فسی خۆیان (مه‌شغولێ) كرد به زیاده ته‌قواو تاعه‌ته‌وه له‌سه‌ر ئه‌ساسی په‌یڕه‌وی كیتاب و سوننه‌ت و خوداش به فه‌زڵی خۆی دڵی ئه‌وانه‌ی (نوورانی) كرد به‌نه‌وعێ بوو به ئاوێنه‌ی دڵی حه‌زره‌ت (ﷺ) وه له‌وه‌و ئه‌نوارو به‌ره‌كاته له قه‌لبی موباره‌كی ئه‌ودابوون وه به‌شداربوون و ئیمانیان ته‌ره‌قی كرد به نه‌وعێ

بـوون بـه چـرای (تـﻪنویر) بـۆ گـﻪڵی رەفیقـان و بەتایبـﻪت حـﻪزرەتی (ئەبوبەکری صدیق و ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالـب) لـﻪم بابەتـﻪوە پـێش کەوتن هەتا (سەلمانی فارسی) لە ئـﻪبو بـﻪکری صـدیقەوە قـاسمی کـوڕی (محمدی) کوڕی ئەبو بەکر ئەویش لە سەلمانەوە (جەعفـﻪری صـادق) یـش لە قاسمەوە (مننەوەر بوون) هەروەها حەسەنی بەصری لە حەزرەت عـﻪلی و (حەبیبی حەجەمی یش) لە حەسەن و هـﻪروەها (دادود طـائـی) یـش لـﻪ حـﻪبیبی حەجەمیـﻪوە شـێخ مـﻪعروفی کـﻪرخیش لـﻪ حەبیبـﻪوە هـﻪروەها (سرِی سقطی) یش/ لە مەعروف و ئیمام (جونەیدیش) لە سـﻪریەوە دڵیـان نـوورانی بـووە ...هتـد). وە ئـاداب و یاسـای ئەوانـﻪ پـﻪیڕەوی قورئـان و حەدیس و دەوامی تاعەت و زیکرو عیبادەت و خواپەرستی بوون [1]

١) وەهـﻪروەها هـﻪرکام لـﻪو زاتانـﻪ ئـادابێکی تایبـﻪتی یـان بـوو لـﻪ عیبادەت و (طاعەت) و (تەصفیە) ی دڵدا ناو ئەبرا بە (تەریقەت) واتە ڕێگە فـلان کـﻪس لـﻪ عیبـادەت دا وە ئـﻪم زاتانـﻪ لـﻪ ئەوەڵـﻪوە وە لـﻪ قـﻪڕنی یەکەمدابوون جا (تابعییەکان) کەوتنە قەرنی دووەم و قەڕنی سێ یـﻪم کـﻪ لەلایەنی حەزرەتەوە (صلی الله علیـه وسلم) شـﻪهادەت دراوە بـﻪ وان کـﻪ ئەوانە باشترین (ئەهلی قەڕنـﻪکانن) چـوونکە بێگومـان ئـﻪم زاتانـﻪ هـﻪموو ئەهلی قورئانن (حەدیسی و فیقهی) ئیسلام بوون .

٢) لەبەر ئەو (حەدیسە) شەریفەی/ کە حەزرەتی (عومەر رەزای خوای

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (نوری ئیسلام)، دانراوی خوالێخۆش بوو (مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس) لاپەڕە ١٢٣ وە بڕوانە پەرتووکی (مصباح القلوب ومفرج الکروب) دانراوی (عبدالرحمن مەلاّ طه عبدالعزین)، بەرگی دووەم، لاپەڕە ٣٧.

لێبێت) له پێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (إن منْ عِبّاد الله لأنَاساً ما هُمْ بأنبياءٍ ولا شُهَداءٍ يَغْبُطُهُمْ الأنْبِياءُ والشّهداءُ يَومَ القِّيَامَة بِمَكانِهُم مِن الله عزّ وَجَل) واته بەڕاستی لەناو عەبدو بەندەکانی خوادا کۆمەڵێك هەن نە پێغەمبەرن و نەشەهید بەلاّم لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر لە پێغەمبەران (غیبتەیان) واتە خۆزگەیان پێ دەخوازن بەهۆی ئەو پلە و پایەوە/ کە خودا داویەتی بەوان، یەکێ لە هاوەڵانی حەرزی کرد قوربان ئەوانە کێن و کردەوەیان چی یە؟ تا بیان ناسین و خۆشمان بوێن؟ ئەوجا لەوەڵامدا فەرمووی ئەوانە چەند کەسانێك دەبن لە ئوممەتی من لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەوێ و ناوچەوانیان نووری لێ دەبارێ وە لەو ڕۆژەدا کە خەڵك زۆر لە (عەزابی) خوا دەترسن ئەوان هەچ خەفەتێکیان نییە کاتێك (عالم مەحزون) و غەمبارن ئەوان بێ غەم ئەبن ئینجا ئەو ئایەتەی (سورەتی یونس)ی خوێندەوە/ کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ سوورەتی / یونس: ٦٢ ) واتە ئاگاداربن کە (ئەولیای) خوا لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ ترسیان لەسەر نییە وە بەهیچ شتێکیش بەپەرۆش نین).

٣) جا هەروەها با بزانین کە (ئەولیای) خوا بە کێ دەڵێن؟ بەڵێ ئایەتی دوای ئەو ئایەتەی پێشوو خوای گەورە (ئیشارەیان) بۆ دەکات و دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ سوورەتی/ یونس: ٦٣) ئەولیا ئەو کەسانەن بەرهێز کارین و واتە/ خۆ بپارێزن/ لە خراپەیەك

وە لەگەڵ هەندیشدا ئیمانیان بەخواو پێغەمبەرو ڕۆژی (قیامەت) هێنابێ وە هەروەها (موخالفەی) ئەمرو فەرمانی خواو پێغەمبەر (ﷺ) نەکەن وە بەردوام بن لەسەر خواپەرستی هەزار ڕەحمەت لەم کەسە کە ئەفەرمووێت[1]

ئەوجا بێگومان خوای گەورە لە (مەدح) و سەنای ئەوان دەفەرموێت:

﴿ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ سوورەتی یونس: ٦٤ واتە: موژدەی خۆشی بۆ ئەو کەسانە لە ژیانی دونیادا کە بەهۆی پێغەمبەرو قورئانەوە دراوە بەو جۆرە کەسانەوە بە (کەشف و کەرامەت) و بەهۆی مەلائیکە کە لەکاتی سەرەمەرگدا جێگاو مەقامی خۆیان نیشان دەدەن کە دیارە کە خوای گەورە (ڕوتبە) و (مەقامێکی) دا بەکسێك تازە لێی پەشیمان نابێتەوە).

أَقُولُ قَوْلي هَذا وأَسْتَغْفِر الله لِي وَلَكُمْ ولِسَائِر المُسْلمِينْ نَبّهَني اللهُ وإِيّاكُمْ مِنْ نَومَةِ الغافلِين وَحَشَرني وإِيّاكُمْ تَحْتَ لِواءِ سَيِّد المُرسَلِين آمين).

---

(1) طەریقەی هەموو ئەولیا حەقە — ئادابیان لەگەڵ شەرع مووفیقە
کەرامەتیان عەدو شومار — ئایەتە بەشەرع دیسان بە ئاثار
هەرکەسێ کاری ناموافیقە — شەرعەن نەك وەلی بەگو فاسیقە

بۆ ئەم هۆنینەوەیە بڕوانە پەرتووکی (سەرچاوەی ئایینی) دانراوی مامۆستا مەلا(عبدالکریمی مدرس) لاپەڕە /٢٣.

# ئامۆژگاری شەست و پێنج

## باسی هەندێ ووتەو یادی خواو ئەورادی ئەولیایان ئەکا

الحَمْدُ للهِ الذّي جَعَلَ لِكُلِّ رسُول حَوارِيِّين ونُقباء وَمَنَح حَبِيبَهُ مُحَمّداً أصحاباً وأتباعاً نَجباء صوفيِّين[1] عَارفِين بِرَبِّهِمْ مَا شَاءَ مِنَ الأشياء مُخْلصِين مُتَوكِّلين عَلَيْه حُنَفَاءَ وَلَهُمْ مَراتِبٌ وَمَنَازِلَ عَاليةٌ تَعْلوُهَا دَرَجَةُ الغَوْثَانيةِ وَتَلِيها دَرجَة القُطْبَانيةِ البَسيطةِ فَالأَوْتَادُ والأبدالُ وَالنّجباءُ والنّقباءُ ذَو الهِمَمِ العَاليّة نَحْمُدُهُ سُبْحَانَهُ وتَعَالى وَنَشْكُرهُ عَلى جَزِيل أَنْعَامِه عَلَى هَذهِ الأُمّةَ وعَلَى فَيْظَه العَظِيمْ لِمَنْ اتّقاه واتّبَعَ سَبِيلَهُ وَنَسْتَدهيُه وَنَتُوبَ إليْه مِنْ كُلِّ صَغيرةَ وكَبِيرةَ وَنَشْهدُ أَنْ لاَ إلهَ إلاّ الله عالِمُ الغَيْبِ والشّهادةَ وَنَشْهَد أَنّ سَيِّدَنا مُحَمّداً صَاحِب المَنْقَبة العَاليةَ الذّي لَمْ يَدرك فيها سَابق ولاَ لاَحَقَ وعَلى آلهِ وأصْحَابِه ذُو الفَهْمَ والتّحقيق، مَنْ يُطِيعَ اللهُ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ وأهْتَدى وَمَنْ يَعْصِي اللهَ وَرَسُولهُ فَقَدْ غَوَى وإعْتَدى).

(أمّا بَعْد أيّها المُسْلِمُون أوْصِيكُمْ بِتَقْوا اللهِ وطَاعَته) واته لەپاش هەندێ

---

(1) شێخ حەسەنی بەصری (رەحمەتی خوای لێ بێت) ناسراوە بە ( زاهد الأمة) ئەم زاتە موبارەکە لە ساڵی (٢١- بۆ -١١٠ ی ھ) ژیاوە کە یەکێکە لە گەورە پیاوانی (تابعین) و رێبازی (تەصەووف) لەباسی سەرگوزشتەی خۆیا ئەفەرموێت (رأيتُ صوفياً في الطواف فأعطيته شيئاً فَلَم يأخذهُ - وَقالَ مَعي أربَعة دوانيق فَيَكفيني ما مَعي ) واتە: لە کاتی تەوافی کەعبەدا چاوم کەوت بە (سۆفی )یێك جا شتێکم دایێ لێی وەرنەگرتم و گوتی خۆم پێنج (دراوم) پێ یە وە ئەوەی کە پێمە بەشم دەکات ) بروانە پەرتووکی (عوارف المعارف) لە دانانی ( الشيخ عبدالقادر عبدالله السهروردى).

موسڵمانان وەصیەتتان لێ دەکەم بە لەخوا ترسان و تەقوای خوای گەورە و پەیڕوی کردنی لە هەموو کات و ساتێکدا و، چوونکە هەموومان دەگەڕێنەوە بن (حوکمی) ئەو.

## (باسێك لە پێناسەی وەلی)

جا هەروەها پێناسەی (وەلی) واتە دۆستی نزیك لە خوا ئەو ئیمانداره‌یە بەردەوام لە خوا بترسێ و فەرمانی جێ بەجێ بکات وە قەدەغەی نەشکێنێ هەروەها زۆریش سوونەت و زیکرو یادی خوا بکا خوای گەورەش لە قورئان ئەفەرموێت: ﴿إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سوورەتی/ الأنفال: ٣٤) واتە: دۆستەکانی خوا تەنها لەخوا ترسەکانن جا هەورەها خوای گەورە لە حەدیسێکی (قودسی) دا ئەفەرموێت ﴿مَنْ عَادى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرب﴾ رواه البخاري، واتە هەر کەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکا (چوونکە دۆستی منە) بەڕاستی ئاگاداری ئەکەمەوە کە خۆم جەنگی لەگەڵ ئەکەم/ هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ سوورەتی/الحج: ٣٨) واتە خوای گەورە بەرگری ئەکا لەو کەسانەی (ئیمانیان) هێناوە جا هەروەها هەندێ لە زانایانی ئیسلام ئەفەرموون (وەلی) واتە دۆستی خوا چوونکە (وەلی) بەهۆی خواپەرستی و لە خواترسان خوای گەورەی کردوویە دۆستی خۆی، خوای گەورەش بەهۆی پاراستن و یارمەتی دان ئەیکاتە دۆستی خۆی/ هەندێکی تر لە زانایان ئەفەرموون (الأوْلِياء جَمْعُ وَلي مِن الوَلاءِ وَهُوَ

(العِزّ وَالنّصرُ)، سَمّوا بِذَلِك لأنّهُمْ هُمْ المَنْصُوُرُونَ بِاللهِ المُعَزَّزُونَ بِهِ لاَ يَطْمَعُون فِي شيءٍ سِوىَ القُرْبِ مِنْهُ)[1] .

جا هەروەها ئەو ئەولیایانە ژمارەیان یەك جار زۆرن لەهەموو ولآتێکی ئیسلام بلآو بووینەوە وە هەر دەشمێنن وە لەهەمو (عەسرو زەمانێکدا) ئەگەر تاقمێکیش (وەفات) بکەن تاقمێکی تر دێنە جێگایان ئەرز خالّی نابیّ لێیان وەك (حەدیسی قودسی) لە شأنیان دا ئەفەرموێت (إنْ خُلِيَتْ قُلِبَتْ) واتە (ئەگەر ئەوان نەمان لەسەر زەوی خواش دونیا کاولّ ئەکاو وێران ئەکا) هەندیّ لە زانایانیش ئەفەرموون ژمارەیان بە ئەندازەی پێغەمبەرەکانن و (سەلآت و سەلامی خوایان لەسەر بێت) جا نەقلّ ئەکا لە پەرتوکی (الفتوحات المكيّه) داو ئەلّێت (وَقَالَ الكَامِلَ المُحَقّق الفَاضِل المُدَقِق الشّيخ مُحي الدّين (قُدِسَ سِرهُ) إنّ عَلَى قدم كُلّ نَبِي وَلِيّاً وَارِثَاً لَهُ فَما زَادَ فَلابُد أنْ يَكُونَ فِي كُلّ عَصْرٍ (مَائَة ألف وَلِي وَأرْبَعَة وَ عِشْرُون ألفا وَلِيّ عَلَى عَدَدِ الأنْبِيَاءِ وَيَزِيدُونَ وَلا يَنْقُصُونَ وَهُمْ عَلَى رَأس العُلَمَاء العَامِلِين وَأبْطال المُجَاهِدِين المُخْلِصِين).

## (ئاگاداریەکی گرنگ)

جا هەروەها بێگومان هەموو (ئەولیاکانی) خوا لایەنگیری (شەریعەتی) خواو پێغەمبەر بوونە وە لەهەمو کات و ساتێکدا خەلّکیان هانداوە کەوا لە (شەریعەتی) خواو پێغەمبەر (ﷺ) دەرنەچن ئەگەرنا تووشی (ضەلآلەت)

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (الإشراقات الرّوحانيّة في الخُطب المِنْبرية والعظات الدينية) دانراوی مامۆستا (عبدالسلام العمرانی الخالدی)، لاپەڕە/ ٣٠٢.

و گـومڕایی ئـەبن جـا مـادەم وابـێ باباش گـوێ شـلکەین لەهەنـدێ لـەو فەرمودانەی کە ئـەو زاتانـە باسـیان کـردووە وە بۆمـەیان ڕوونکردۆتـەوە، هەروەها شێخ (عبـدالقادری گـەیلانی) (قـُدِسَ سِـرەُ) ئەفـەرموێت: (إنّ کُـلّ حَقِيقَة لاَ تَشْهَدُ لَهَا الشّريعةُ فَهِي زَنْدَقَةٌ)، واتـە هـەر شـتێ خـەڵکی بەڕاسـتی بزانێ و ئەگەر (شەریعەت) شایەتی نەدا بۆی ئەوە کافرو زیندیقیە.

وقـال (الـسيّد الـشيخ (أحمَـدْ الرفـاعي) قُـدّسَ سِـرُهُ) لِمُريْـدِه وَفُقَرائـه (وأبْعَدُوا عَـنْ الحَـرَامِ وَراعـوا الأدب علـى مُقْتَـضى أوامـر اللهِ الخـالِقُ العَظِـيم وَأمْشَوا عَلى مَنْهَج الشّرِيعَةَ والطَرِيـق المُسْتَقِيم)، واتـە: بەڕاسـتی فـەرمانی ئـەکرد بـە (مریـدو دەروێـشەکانی) خۆتـان دوور بگـرن لـە (حـەرام) وە چـاودێری ئـەدەب و ڕەوشـتی بـاش بـن وە لەسـەر فەرمانـەکانی خـودای وەدیهێنـەر وە بـڕۆن لەسـەر بەرنامـەی (شـەریعەت) و ڕێگـەی ڕاسـت، وە هەروەها ئەیفەرموو (وإذَا رَأيْتَ الرّجلَ يَطِيرُ فِي الهَواءِ فَلا تَعْتَبِرُهُ حتّـى تَـزِنَ أقْوالَهُ وأفْعَالُهُ بِمِيزانِ الشّرع)، وەئەگەر کەسێکت بینی بە ئاسماندا دەفڕی بڕوای پێ مەکە تا کردارو گوفتاری بەتـەرازووی (شـەرع) دەپێویـت، وَقـالَ الشيخ (ابراهيم الدسوقي) (قُدِسَ سِرهُ): (مَنْ لَمْ يَكُنْ مُتَشرّعَاً مُتَحَقِّقاً نَظِيفَـاً عَفِيفَاً شَـرِيْفاً فَلَـيْسَ مِـنْ أوْلادِي لَوْكـانَ إبْنِـي لِـصُلْبِي)[1] واتـە: ئەفـەرموێ هەرکەسێ لەسەر (شەریعەت) نەبێ وە بەڕاستی و درووستی وبە خاوێنی و بەپاکی ئەوە کوڕی من نییە ئەگەرچی ئەولادی پشتیشم بێت) وە هەروەها شـێخی گـەیلانی وسـەید ئەحمـەدی بـەدەوی (قَـدّس اللهُ سِـرُهُمّا العَزِيـز)

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (مصباح القلوب ومفرج الكروب) لەنوسینی و کۆکردنەوەی (عبدالرحمن مەلا طه عبدالعزيز) بەرگی دووەم/ لاپەڕە/ ١٩٤.

فەرمویانە (هەموو ئەولیاکانی خوا هیچ شتێ وەرناگرن لە فەرمودەی خواو پێغەمبەرەوەنــەبێ (ﷺ) شــیخ جونەیــدی بەغــدادی (قُــدِسَ سِــرهُ) ئەفـەرموێت: (عِلْمُنَـا هَـذا التَـصَّوف مقّيدٌ بالكتَـاب والسُنَّة فَمَنْ لَـمْ يَـسْمَعَ الحَديثَ وَيَجْلسَ ويَأخُذَ أدَبَـهُ مـنْ الُمتَـأدّبين أفْـسَدَ مَنْ إتَبّعَـهُ) واتـە: عـیلم وزانستی ئێمە بە تەصەوفەوە بەستراوە بەقورئان و حەدیسەوە، وە ئەگەر گوێی بۆ نەگری و کاری پێ نـەکاو ئـەوە دەبـێ لێـی وەرنـەگیرێ هـەروەها لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی شوێن کەوتووی نەبێ و بەهیلاك ئەچێ ڕێی بزر ئەکا .

هـەروەها (سـەڕی سـەقەتیش (قـدس سـرە) ئەفـەرموێت (هـەر کـەس ئیدیعای عیلمێکی (باطنی) بکات کە دژی زاهیری (شەرع) بێـت ئـەو کەسـە هەڵەو سەر لێشێواوەو ڕێی بزرکەرە).

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا بێگومان مامۆستای خوالێخۆش بوو مـەلا (عبـدالکریمی مـدرس) لـە پەرتوکی (ئەساسی سەعادەت)دا[1] لە پرسیارو وەڵامەکەیدا ئەفەرموێت :

س: طەریقەی ئەولیا چی یە ؟

ج: طەریقەی ئەولیا (عیبارەتە) لەو جۆرە (ئاداب و عیبادەتەی) لەسەر ئەو منهەج و تعلیمی (طاڵبانی دین) ئەکەن وەئەم ئادابە سەراسەر مـوافقی ئادابی شەریعەتە چوونکە بەعزێ لەئەشرافی ئەولیا وەکو حەزرەتی شێخ (عبدالقادری گەیلانی) وشاهی و نەقشبەند (قُدّسَ سِرّهُمَا) فەمویانـە (هـەر

(1) بروانە/ پەرتوکی (ئەساسی سەعادەت) دانراوی/ مەلا عبدالکریم مدرس) لاپەڕە/ ٦٦.

طەریقەی (موخالیفی) ئادابی (شەریعەت) بێ ئەوە بێگومان (بەتاڵە بەتاڵە بەتاڵە)، بناءً علیه/ هەر کەسێکتان چاو پێکەوت (ئیدیعای) ویلایەتی کردووە حاڵی خۆی (موخایفی) ئادابی (شەریعەت) بوو/ ئەو کەسە لە ئەهلی فسق وبیدعەتە) و هەروەها عاقیبەتی خۆی و ئەتباعی شرو گومراهی و ضەلاڵەتە چوونکە شەریعەت (قانون و یاسایەکی) خواییە بەسەر هەموو موکەڵەفێك دا جاریە هەتا هەتایێ .

## (هەندێ لە پاڕانەوەو صەڵەواتی ئەولیاکان)[1]

١) اللّهُمَ صَل عَلى رُوُح سَيّدنَا مُحَمّد في الأرْوَاح وَعَلَى جَسَده في الأجساد وعلى قبره في القبور[2].

٢) اللّهُمَ صَلَ عَلَى سَيِّدنَا مُحَمّد طِبِ القُلُوبَ ودَوائِها وَعَافية الأبدان وشِفائِها وَنُور الأبْصَارِ وَضيائِها وعَلَى آله وصَحبه وَسَلَم تَسْليماً كَثِيراً.

٣) اللّهُم صَل عَلَى مُحَمّد وعَلَى آلِ مُحَمّد فِي الأولِين والآخَرين وفِي المَلاءِ الأعْلَى إلى يَومِ الدّين) پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت حەزرەتی جوبرائیل (سەلامی خوای لێبێت ئەو صەڵاواتەی لێداوم).

٤) بِسْمِ اللهِ الرّحْمَن الرّحِيم، اللّهُمَ صلَي عَلى سَيِّدنا مُحَمّد النَبّيَ الأُمِّي القُرَيْشِي بَحْر أنْوارِكَ وَمَعْدَنَ أسْرَارِكَ وَتَمُنَ عنايَتِك ولِسَان حُجّتك وخَيْر خَلْقكَ وأحبُ الخَلْق إليْكَ، وَعَبدُكَ وَنَبّيُك الذّي خَتَمتْ بِهِ الأنْبِياءُ والمُرْسَلِين وَعَلى

---

(1) بڕوانە کیتابی (جواهر الاسنی في الصلوات المشتملة على أسماء الله الحسنى) دانراوی (الشيخ معروف النوديهي البرزنجي)، مخطوطة لاپەڕە/ ٣٨٣.

(2) بڕوانە هەمان سەرچاوە .

آله وَصَحبه وسَلَمْ سُبحانَ رَبك رَبّ العِزّة عمّا يَصفُوْن وسَـلامُ عَلـى المُرْسَـلين والحَمْدُ لله ربّ العَالمين، راجع كتاب (سعادةُ الدّارين) .

## (هەندێ ئەدعیەو ئەورادی جۆراجۆر) [1]

١) جـا هـەروەها بێگومـان (ڕیوایـەت) کـراوە کـەوا حـەزرەتی ئـادەم ئەوکاتـەی کـەوا دابـەزیوە لـە ئاسمـان بـۆ زەوی ئینجـا پـاڕاوە لـە خـوای پـەروەردگار و گـووتی ئـەیخوای مـەزن فێـری کـاروە کاسـبیم بکـە وە دوعایەکی ئەوتۆم فێر بکە کە هەمووجۆرە (حەمدو سوپاس و شـوکرانەی) تۆی تێدابێت ئینجا خوا نیگای بۆ ڕەوانە کردو فـەرمووی هـەموو بـەیانیان وئێـواران ئـەم زیکـرە بکـەو ڕۆژێ سـێ جـار (الحَمْدُ لله حمْـداً يُـوافي نِعَمـكَ ويكافئُ مزيدَكَ)[2] .

٢) جــا هــەروەها موعــاذي کــوڕی جەبــەڵ (خــوا لێــی ڕازیبێــت) لەپێغەمبــەرەو (ﷺ) ئەیگێڕێتــەوە بــە (مــەرفوعی) ئــەڵێ ئەوکاتــەی حـەزرەتی نـوح (عليـه الـسلام) کـە هـات وەفـات بکـات و بەرلـەوەفاتی

---

(1) ئەو سەرچاوانە ئەوانەی لێ وەرگیراوە ئەمانەن (سعادة الدارين للنبهاني) (الأدعية والأوردة المختارة للشيخ البرزنجى) (جواهر الاسنى والصلوات المشتملة على اسماء الحسنى للشيخ معروف النودهي) (جامع الخيرات في الأذكار والعبادات (الاستاذ جمعة محمود الكركوكي).

(2) ئەم سەرچاوانەی ئەوانەی لێ وەرگیراون ئەمانەن : (سعادة الدارين للنبهاني) ، الأدعية والأوردة المختارة للشيخ البرزنجي) ، (جواهر الأسنى في الصلوات المشتملة على أسماء الحسنى للشيخ معروف النوديهي) (جامع الخيرات في الأذكار والعبادات) الاستاذ (جمعة محمد محمود الكركوكي)

ئامۆژگاری کوڕەکەی کرد بەم چوار ووشە پیرۆزە (سبحان الله، وَبِحَمْدِهِ، ولاَ إلهَ إلاّ الله والله أكبَر) وە هەورەها حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی سوێند بە خوا (فَمَنْ قَامَ بِها كَانَ مِنْ الأولياء) واتە : هەر کەسێ ئەم وێردانە بکە و پێیان هەڵسێ ئەوە لە (ئەولیا) حیسێب ئەکرێ .

٣) دیسان ئەفەرموێ لە (حەدیسدا) هاتووەلە ڕۆژی قیامەتدا بە هەزاران هەوڵ و(شەدائید)و ناخۆشی تێدا هەیەو هەر کەسێ ئەیەوێ (قوتار)و ڕزگار بێت لەم (هەولانەدا) با ئەم دە ووتانە بەکاربێنێت هەر یەکێ لە جێگای خۆی ئەم وێردانە بەکاربێنێ وەك حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (قُلْ أعددتَ لِكُلِّ هَوْلِ القاهُ فِي الدّنيا والأخرة (لا إلهَ إلاّ الله) ولِكلِّ هَمٍ وغَمٍ (ماشاءالله) ولِكُلِّ نِعْمَةٍ (الحَمْدُ لله) ولِكُلِّ رُخاءٍ وَشِدةٍ (الشُّكر لله) ولِكُل أعْجُوبَةٍ (سُبْحانَ الله) ولِكُلِ ذَنْبٍ (أسْتَغْفر الله) وَلِكُلِ مُصيبَةٍ (إنّا لله وإنّا إليهِ راجِعُون) وَلِكُلِ ضَيْقٍ وَشِدَةٍ (حَسْبي الله) ولِكُلِ قَضاءٍ وقَدَرٍ (تَوكّلْتُ عَلى الله) وَلِكُلِّ طَاعَةٍ وَمَعْصيةٍ (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَةَ إلاّ بِالله)[1]

٤) ئیمامی شافعی (ڕەحمەتی خوای لێبێ) ئەم دوو صەلاّواتەی کردووە بە وێردی خۆی ١) اللهم صَلي عَلى مُحَمّد بِعَدَدْ مِنْ صَلّى عَليهِ وَصَلّي عَلى مُحَمّدٍ بِعَدَدِ مِنْ لَمْ يُصَلي عَلَيْهِ وَصَلِّ عَلى مُحَمّد كَمَا تَنْبَغي الصّلاة عَلَيْهِ وصَلّى على مُحَمّد كَما تحبُّ أنْ يُصَلّى عَلَيْه وصلّ على مُحَمّدٍ كَمّا تَنْبَغي الصّلاة عَلَيْهِ و صلى الله على نَبِينا مُحَمّدٍ كُلّمَا ذَكَرَهُ الذّاكِرُون وَغَفَلَ عَنْ ذكره الغَافِلُون) [2].

---

(1) بڕوانە هەمان سەرچاوە .

(2) بڕوانە/ (جامع الخيرات في الأذكار والعبادات) لە نووسینی طالب العلوم (جمعه محمدمحمودالجامعي) لاپەرە/ ٨٤.

٥) سەيد ئەحمەدی بەدەوی (خوا نهێنی پیرۆز بکات) ئەمزاتە یەکێ بووە لە (أقطاب الأربعة) ئەم سەلاواتە ویردی ئەو بووە (اللّهُمَ صَلّي عَلى نُورِ الأنْوارِ وَسّرِ الأسرارِ وتريَاقُ الأغْيَارِ وَمِفتَاح بَاب اليَسَارِ سَيّدنَا مُحَمّدٍ المُخْتَارِ وآله الأطْهار وأصْحَابِه الأخْيَار وَعَدَدنعم اللهِ وأفْضاله).

٦) عَنْ ابراهيم بنْ الأدْهَم (رضي الله عنه) في بَعْض الأبْدال مَنْ قَالَهُ مَائَة مَرّةً هَذا التَسْبيح لَمْ يَمُتْ حَتّى يَري مَقْعدُهُ من الجنّة وَيَرى لَهُ وَهُوَ هَذا (سُبْحَان اللهُ العَليّ الدّيان/ سُبْحَانَ الله الشّديد الأرْكَان/ سُبْحان الله منْ يَذْهَب باللّيْل ويَأتي بالنّهار/ سُبْحَان مَنْ لا يَشغلهُ شَأنٌ عَن شأنٍ سُبْحَان الله الحَنّان المنّان/ سُبْحانَ الله المَسْبَحُ في كلّ مَكَان) واتە: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێت لە (ئەولیاو ئەبدالّم) وەرگرتووە هەر کەسێ (١٠٠) جار ئەم (تەسبیحاتە) بکات پێش ئەوەی بمرێ جێی خۆی لەبەهەشتدا ئەبینێت/ دوعایەکەش ئەوەیە کە نووسراوە و (تەجروبە کراوە) .

٧) وذَكَرالإمَام القُرْطبي (رحمة اللهِ عليهِ) إنّ تَسبيحَ مَلائكَةُ السّمَاء الخَامسةِ هُوَ (سُبْحَانَ مَنْ جمَعَ بَيْنَ الثّلج والنّار) وإنَ مَنْ قَالَهَا مّرَةَ واحدَةَ كَانَ لَهُ مثْل ثَوابِهُم) واتە پێشەوا (قورطبی) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەڵێ بەڕاستی زیکرو تەسبیحاتی فریشتەکانی ئاسمانی پێنجەم ئەوەیە پاکە و خاوێنی بۆ خودایەك کەوا کۆی کردۆتەوەو لە بەینی بەفرو ئاگردا).

جا لە (ڕیوایەتێکی) تردا ئەفەرمێت (لَثَلْجُ يُطفأُ النّارَ وَللنّارَ يُطْفأُ الثّلْجَ) واتە: نە بەفرەکە ئاگرەکە ئەکوژێنێتەوە وە نەئاگرەکەش بەفرەکە ئەتاوێنێتەوە یانی هەروەکو گوتراوە ئاوو ئاگر زێدی یەکن و بەلام

گەورەیی بۆ خوای خاوەن دەسەڵاتە .

٨) جا هەروەها یەکێکی تر لە(ئەورادو ئەزکارەکانی) ئیمام ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەفەرموێت لە خەوا/ ٩٩/ جار خوای گەورەم بینی وە ئینجا گوتم ئەگەر ئەم جارە بە خزمەتی بگەم پرسیاری ئەوەی لێ دەکەم ئەو خەڵکە بە چ ڕزگارونەجاتی ئەبێ لەڕۆژی قیامەتدا جا ئەفەرموێت (فَرَأَیْتُه تَمَامُ المَائَةِ) واتەلەخەودا سەد جارەکەم تەواو بینی ئەوجا پرسیارم لێکرد پەروەردگارا بەچ ئەم خەڵکە (نەجات) ئەبێ لە ڕۆژی قیامەت/ لەسەر زاری تۆ، فەرمووی ئەم دوعاو وێردانە ئێوارەو بەیانیان بخوێنی (سُبْحانَ الأبدِ الأبدي، سُبْحَانَ الَواحِد الأحَد، سُبْحَانَ الفَّردِ الصَّمد، سُبْحَان رَافِعْ السَّماء بِغَير عَمَد سُبْحَانَ مَنْ بَسَطَ الأرضَ علَى المَّاء فَجَمَد، سُبْحانَ مَنْ خَلَقَ الخَلْقْ فَأحْصَّاهُمْ عَدَد، سُبْحَانَ مَنْ قَسَّمَ الأرْزَّاق ولَمْ يَنْسَى أحَد سُبْحَانَ الذّي لَم يَتَخِذ صَاحِبةً ولاَ وَلَدَ الذّي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أحَدْ).

٩) دوعاکردن بۆ کەسێك کە (غەیبەتت) کردبێت: عن النّبیّ (ﷺ): (إنّ كَفارةِ الغَيْبَةِ أنْ تَسْتَغْفرَ لِمَنْ أغْتَبَتْهُ تَقُول (اللّهُمَ إغْفر لَنَا ولَهُ)) رواه البيهقي، واتە: دەگێڕنەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە کەفارەتی (غەیبەت) ئەوەیە داوای لێخۆش بوون بکەیت بۆ ئەوەی کە (غەیبەتت) کردووە بڵێی (خوایە لە ئێمەو لەو خۆش بە).

١٠) ئەم دوعایە بۆ کەسێکە کە کارێکی لەسەر سەخت و گران و ناخۆش و ئاڵوزبێت، دوعایەکەش ئەمەیە هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (اللّهُمَ لاَ سَهْلَ إلاّ مَا جَعلْتَهُ سَهْلاً وأنْتَ تَجْعَلِ الحُزْن إذا شِئْتَ

سَهْلاً) رواه مسلم، واته: خوایه گیان هیچ کاروبارێك سوك و ئاسان نییه لەسەرسەری ئینسان مەگەر کارێك کە تۆ سووك و ئاسان و دەستەبەرت کردووه/ ئەگەر تۆ بتەوێت هەمموو کارێکی گران و سەخت زۆر سووکو ئاسان دەکەیت وەهەموو خەموو پەژارەیەك لەسەر ئینسان لائەدەی).

خوایه عەفومان بکەی/ خوایه لەبەر خاتری خۆشەویستەکەت ئیمانمان بەنسیب بکەی/ خوایه حەشرمان بکەی/ لەگەڵ ئەولیاو پیاو چاکاندا هەروەها بەبەر دوعای وانمان بخەیت (أَقُولُ قَوْلِي هَذا وأَسْتَغْفِر الله لِي ولَكُمْ ولِسَائِر المُسْلِمِين آمين/ نَبَهَني اللهُ وإِيّاكُمْ منْ نَوْمَةِ الغَافلِين وَحَشَرَني وإِيّاكُم تَحْتَ لِواءِ سَيِّدِ المُرْسَلِينْ اللّهُمَ اغفِر لَنَا آمين).

# ئامۆژگاری شەست و شەش

## باسی ( صلاە قیام اللیل ) واتە شەونوێژ ئەکات

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمِين أمَرَ عِبَادَهُ بِالتَّزَود بِدار الآخِرَةِ بِالأعْمَالَ الصَالحة مِنْ فَرَائِضْ وَنَوافِل مَثل صَلاة التَهَجُدِ وَقِيام اللّيل وَنَهَاهُم عَنْ الغَفْلَة والإعراضِ والإنْشِغال بِالدّنيا عَنْ الدّينِ وأشْهَد أنْ لاَ إلهَ إلاّ الله وحْدَهُ لاَشريك لَهُ السعيدُ مَنْ إطَاعَهُ وأتْقَاهُ والشقي مِن خَالَفَ أمْرَه وَعَصَاهُ وَأشْهَد أنْ سَيّدنَا مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُولَهُ نَبّيَ غَفَرَ اللهُ مَا تَقَدمَ مِنْ ذَنْبِه وَمَا تَأخّر ومَعَ ذَلك كَانَ يَقُومُ مِنّ اللّيْل حَتّى تَفَطّرَتْ قَدَمَاهُ والصّلاةُ والسّلامُ عَلَيْهِ وَعَلى آله وَأصْحَابِهِ الذّين أتبَعُوهُ وأقْتَدوُا بِهِ فِي فعلِ الطاعاتِ وَسَلّم تَسْلِيماً كَثِيراً، أمّا بَعْد أيّها المُسْلِمُوْنَ أوْصِيكُمْ عِبادَ الله بِتَقْوا اللهِ وطَاعَتِه) واتە لەدوای هەندێ ئەی موسڵمانەکان وەسیەتتان لێ دەکەم ئەی بەندەکانی خوا بەتەقوای خواو گوێڕایەڵی بۆ فرەمانەکانی خوا وەهەروەها بزانن لەو ووتارەدا باسی شەونوێژتان بۆ دەکەم چوونکە بێگومان ئەبێ بزانن هەرکەسێك کە شەونوێژ دەکات ئەوا پاداشتێکی زۆری هەیە لەلای خوای گەورە فەزڵ و گەورەیی شەونوێژ یەکجار زۆرە چوونکە خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) شەونوێژ بکات وئەفەرموێت:﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴾ سوورەتی/ الإسراء: ٧٩) واتە: وە لە شەودا نوێژ بکە خوا بەزیاد بۆتی ئەنوسێ بەئومێدی ئەوەی پەروەردگارت بتنێرێتە شوێن و جێگایەکی پەسەندو بەرێزەوە (مەقام

المحمود) پێشینان و پاشینانیش سوپاست بکەن ئەو جێگایەش پێی دەڵێن (الشَفاعَةَ العظمی) لەوێ تکا بۆ هەموو موسڵمانان بە گشتی دەکرێت) لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەپرسن پاش نوێژە فەرزەکان چ نوێژێ گەورەتەر ؟ فەرمووی (صَلاةُ الليلِ) رواه مسلم.

**( چەند ئایەتێك دابەزیوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی شەو نوێژ )**

جا بێگومان خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە لەقورئاندا ئەوانەی بەردەوامن لەسەر شەونوێژ وچاکەکەرانن و شایستەی خێرو میهەربانی پەروەردگارن وەك ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ سوورەتی/ الذاریات: ١٥ – ١٨) واتە: (لەخوا ترسەکان لەڕۆژی دواییدا لە بەهەشتەکان و سەرچاوەکاندان ئەو بەهەشت و سەرچاوەیەی خوا پێیان ئەبەخشێت وەری ئەگرن چوونکە ئەمان لە دونیادا چاکە کاربوون کەم لە شەودا ئەخەوتن وشەونوێژیان ئەکرد وەلەبەرەبەیان و (سەحەردا) داوای لێبوردنیان لە خوای خۆیان ئەکردو ئەپاڕانەوە لێی) هەروەها لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە (مەدحی) ئەوانەی کردووە هەروەکو ئەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ سوورەتی/السجدة: ١٦) واتە: ئیماندارو ڕاستگۆیانە بەشەوان لاشەیان لەناو جێگاکانیاندا ناحەوێتەوەو خۆیان پێ ناگیرێت و هەڵدەستنەوە بۆ ئەوەی شەونوێژ بکەن

جا بە دڵێکی پڕ ترس لەسزادانی خودای پەروەردگاریان و پرش ئومێـدیش بەلێبوردەیی و ڕەحمەتـە فراوانەکـەی ڕووی تـێ دەکـەن و داوای لوتـف و بەزەیی لێ دەکەن وە لەو مـاڵ و سـامانەی کـە پێمـان بەخـشیون دەسـتی یارمـەتی بـۆ هاوکـاری کردنـی هـەموو کـارێکی خێـری نـاو کۆمەڵگـە درێـژ دەکەن).

جا هەروەها خوای گەورە لەم چەند ئایەتەدا فەرمان بەپێغەمبەر ئەکاو ئەفەرموێت ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ ﴾ واتە ئەی ئەو کەسەی خـۆت داپۆشـیوە ﴿ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ ﴾ واتە: ئەی محمد (صـلی الله علیـه وسـلم) هەسـتە کاتی حەسانەوە نییـە شـەونوێژ بکـە بەشـی زۆری شـەو هەسـتە جگـە لـە کـەمێکی نـەبێ ﴿ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ ﴾ واتـە: نیـوەی بێـت یـا کـەمێك لـە نیـوەی کـەمتر بێـت یـاخود لـە نیـوەی زیـاتر هەڵبـستەوە بـە شـەونوێژو یـادی خـوا بیبـەرە سـەر ﴿ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾ واتــە : بەهێـدی و هێمنـی قورئـان بخوێنـە نـەك بەهەڵـەو خێـرا بـە خوێندنەوەیەك بخوێنە کە ببێتە مایەی ڕووناکی بۆ دڵت ﴿ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ ﴾ سـوورەتی/ المزمـل:١– ٥ ) واتـە : بەراسـتی ئێمـە فەرموودەو گووتـارێکی گـەورەو گـران دەخەینـە سەرشـانت وقورئانـت بـۆ دەنێـرین، وە داوای ئەنجامـدانی کـارێکی قورسـت لێ دەکـەین ئەوکارەپێویست بەصەبرو هێزو توانای دڵ هەیە کـە ئەویشبەدڵبەستنەوە بە خوداو بە شەونوێژ پەیدا نـەبێ ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴾

سووره‌تی/ المزمل/ ٦) واته بێگومان شه‌و هه‌ستان و شه‌و نوێژ كردن (قورستره) له نوێژكردن له كاتی ڕۆژدا به‌لاَم به كاریگه‌رتره بۆ به‌هێزكردن دڵ و توانا به‌خش تره بۆبه‌جێ هێنان فه‌رمانه‌كانی خوا)

**( چه‌ند فه‌رموده‌یه‌كی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌رباره‌ی شه‌ونوێژ )**

(یه‌كه‌م) جا هه‌روه‌ها (ڕیوایه‌ت) كراوه له عبدالله ی كوڕی سه‌لام (خوا لێی ڕازی بێت) ئه‌ڵێت یه‌كه‌م جار كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هاته (مه‌دینه) خه‌ڵك به په‌ڵه چوون به پیریه‌وه منیش له‌و كه‌سانه بووم (كه هێشتا ئیمانم نه‌هێنابوو) كاتێ كه باش سه‌رنجم لێدا بۆم ده‌ركه‌وت ئه‌و ڕوخساره شیرینه جوانه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ڕوخساری (درۆزن) نییه جا بێگومان یه‌كه‌م ووشه كه لێم بیست ئه‌وه‌بوو فه‌رمووی (أيهّا النّاس أفْشَوا السّلام وأطْعَمُوا الطَعامَ وصلّوا الأرْحَام وَصلّوا بِاللّيلِ والنّاس نِيام تَدخلوا الجنّة بِسَلام) رواه الحاكم وإبن ماجة والترمذي وقال حديث حسن صحيح، واته: ئه‌ی خه‌ڵكینه كاتێ گه‌یشتن به‌یه‌ك سلاَوبكه‌ن و ده‌ستی هه‌ژاران بگرن و(صیله‌ی ڕه‌حم) به‌جێ بگه‌یه‌نن و شه‌ونوێژ بكه‌ن كاتێ خه‌ڵك له خه‌ودان و نووستون (ئه‌گه‌ر وابكه‌ن ئه‌وا ئه‌چنه به‌هه‌شته‌وه به سه‌لاَمه‌تی).

دووه‌م) هه‌روه‌ها سه‌ڵمانی فارسی (ڕه‌زای خوای لێبێت) ئه‌ڵێ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموی: (عَلَيْكم بِقِيَام الليْل فإنَهُ دأبُ الصّالحِين قَبْلَكم ومَقْرَبَةٌ لَكُمْ إلى ربّكُمْ وَمكفرة للْسَيِئاتِ وَمْنهاةٌ عَنْ الإثم وَمُطردةٌ للداءِ عَنْ الجَسَد) رواه ابن خزيمة والحاكم عَن إبن أمامة (رضي الله عنه)، واته: شه‌ونوێژ بكه‌ن چوونكه شه‌و نوێژ پیشه‌ی پیاو چاكان پێش ئێوه بووه وه به هۆیه‌وه له

پەروەدگارتانــەوە نزیـك ئەبنـەوە وە ئەبێتـە كـەفارەتی گوناهــەكانتان وە بەربەستی خراپـە كردنتـان و نەخۆشـی لـە لەشـدا دەرئـەكاو تەندرووسـت ئەبن).

(سێ هەم) (وَقَال سَهْل بن سَعْد جاءَ جِبْرِيلُ إلى النَبِّيَ (صلّى الله عليـه وسلمْ) فَقالَ يَا مُحَمّد عِشْ مَا شِئْتْ فَإنّكَ مَيْتٌ وأعْمَل مَا شِئْت فَإنّكَ مُجزيٍ بِه واجِبْتَ مَنْ شِئْت فإنّكَ مُفَارِقَه وأعْلَم أنّ شَرفَ المُؤمِنْ قِيَام اللّيـل وَعَزهُ اسْتِغْنَاوُهُ عَنْ النّاس) رواه الطبراني وأبو نعيم والحاكم وصحح اسناده[1] .

لە سەهلی كوڕی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێت حەزرەتی جوبرائل هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو ئەی (مُحَمَد صلی الله علیە وسلم) هەرچۆن حەز ئەكەی بژی پاشان هـەر ئـەمریت وەهـەركارێك پێـت خۆشە بیكە پاشان دوای هەر بەوە پاداشـت ئەدرێیتـەوە وە هـەر كەسـێ ئارزووت لێیە خۆشت بوێ لـە پاشـان هـەر جیادەبیتـەوە لێـی وەهـەروەها باش بزانە كە (شەرەفی) بـڕوادار شـەونوێژە وە (عیزەتـی) سـەربەخۆی و پێویستیەتی لەخەڵك واتە چاوت لەدەستی خەڵك نەبێ .

(چوارەم) لە ئیمامی عـەلی یـەوە (ڕزای خـوای لێبێـت) ڕیوایـەت كـراوە كـەوا پێغەمبـەر (ﷺ) شـەوێكیان لـە دەرگـای دان وە هـەورەها خـۆی و (فاطمە) بوون فەرمووی هەڵناستن شەو نوێژ بكەن ؟ ئینجا خاتوو (فاطمە) ووتی : ئەی نێرراوی خوا گیانمان بەدەست خوایـە ئەگـەر بیـەوێ ئاگامـان بكاتەوە ئەیكاتەوە، كاتێ ئەوەی گووت پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی ڕۆیشت

---

(1) بڕوانەپەرتوكی: (كشف الخفاء) دانراوی (الشیخ اسماعیل بن محمد العجلونی الجراحی) بەرگی/ دووەم/ لاپەڕە/ ٧٧.

و له پاشان گويّم لىّ بوو كه لەرێگا ئەڕۆيشت لەبەر خۆ ئەم ئايەتەى ئەخوێنــــــدەوە و ئەيفــــــەرموو: ﴿ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ﴾ سوورەتى/ الكهف: ٥٤) واتە ئينسان زياتر لە هەموو درووست كراوەكان بەربەرەكانىّ و موجادەلە ئەكات .

(پێنجەم) هەروەها سوننەتە ئەگەر (ئيمكان) بىّ خێزان و كەس وكارى بەئاگابكاتــەوە وەك ئــەبى هــورەيرە دەگێڕێتــەوە كــە حــەزرەت (ﷺ) فەرموويەتى: (رَحِمَ الله إمْرَأةً قامَتْ مِنّ اللّيل فَصَلّى وأيقظَ إمرأتهُ فإن أبتْ نَضخ في وَجْهِهَا المَاءَ، رَحِمَ الله إمرأةً قَامَتْ مِنّ اللّيْلِ فَصلّتْ وأيْقَظَتْ زَوْجَها فإنْ أبَى نَضَخَتْ في وجهه الماء) رواه أبوداود وغيره بإسناد صحيح ، واتە: (رەحمەتى خوا لەو كەسە بێت كەوا هەڵئەسىّ بۆ شەونوێژ و خێزانەكەشى هەڵێنەستێنىّ ئەگەر هەڵنەستاوە بـا ئـاو لەسەروچاوى بپرژێنێت (رەحمەتى) خوا لەو ژنە بێت هەڵئەستىّ بۆ شەو نوێژو مێردەكەشى ئاگادار دەكاتەوە ئەگەر هەڵنەستاو ئاو ئەپرژێنێتە سەرو چاويدا .

(شەشەم) هەروەها (عبدالله) ى كوڕى عومەر (خوايان لىّ ڕازى بێت) ئەڵىّ پێغەمبەر (ﷺ) پێى فەرمووم (يَا عَبْدَالله لاَ تَكُنْ مِثْلَ فُلاَنٍ كَانَ يَقُومُ مِنّ اللّيْلِ فَتَرِكَ قِيَامَ اللّيل) متفق عليه/ واتە ئەى (عبدالله) تۆ وەك فلان كەس مەبە لەوەوپێش شەو نوێژى دەكرد وە ئێستا وازى لىّ هێناوە).

جا هەوەها بێگومان (ئيمام موسليم) لە خاتوو عائيشەوە (ڕەزاى خــواى لێبێــت) ئــەڵێت: بەڕاســتى كردەوەكــانى پێغەمبــەر (ﷺ) بــە بەردەوامى بوو ئەگەر كارێكى بكردبايە لەسەر خۆى ئەچەسپاند و (ئيستيقامەى) لەسەر هەبوو .

(حەوتەم) هەروەها ئیمامی (بوخاری و موسلیم) لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە ئەگێڕنەوە ئەڵێ لەلای پێغەمبەر بووم (ﷺ) باسی پیاوێکیان ئەکرد ئەیان ووت هەتا بەیانی ئەخەوێ هەندێ جار نوێژی بەیانیش ناکات ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ذلك رَجُلٌ بَالَ الشَّيْطانَ في أُذنَيْهِ) واتە: ئەو پیاوە شەیتان میزی کردووە بە گوێچکەکانی .

**(تێبینیەکی گرنگ)**

خاوەنی إعانه [1] لە هەندێ پیاوچاکانەوە (نەقلْ) ئەکا و ئەڵێ: (وأعْلَمْ أنّ قِيَام اللّيْلِ مِنْ أثْقَل شَيءٍ عَلَى النَفْس ولأسِيَما بعدَ النّوم وإنّما يَصيرُ خَفيفاً بالإعتِيادِ والمُداوَمة والصّبْر عَلى المَشَقَةَ والمُجاهَدةِ في أوّلِ الأمْر ثُمّ بعْدَ ذلكَ يَنْفَتِحُ بَابُ الأنسَ بالله تعالى وَحَلاَوَةِ المُنَاجَاةِ وَلَذَة الخَلْوة بِهِ عَزّ وَجلّ وَعِنْدَ ذَلكَ لاَ يَشْبَعُ الإنْسَان مِنْ القيامِ ...) واتە: (بزانە بەڕاستی هەڵسانەوەی شەو، واتە شەونوێژ زۆر (قورس) و گرانە لەسەر نەفسی ئینساندا بەتایبەتی لە دوای نوستندا بەڵام لە دواییدا بەرە بەرە سووك ئەبێ لەسەر ئەو کەسەی بەردەوام بێ لەسەر ئەو ماندوو بوونە بە خۆڕاگری و تێکۆشان لەیەکەم جار ئینجا لە دواییدا هۆگری ئەبێ بەخوای تەعالاو لەبەر ئەو (لەزەت) و شیرینەی (بەئیخلاص) و بێگەردی بۆ خوای گەورە ئەنجامی داوە ، جا هەروەها ئەگەر ئادەمیزاد خووی پێوە گرت قەت تێر نابێ لە شەو نوێژ).

---

(1) بروانە/پەرتوکی (إعانة الطالبين على حل الفاظ فتح المبين) دانراوی/ الشيخ ابى بكر المشهور بالسيدالبكري إبن السيد محمد شطا الدمياطي) بەرگی/ ١/ لاپەرە/ ٣٠٨.

هەورەها لەهەمان سەرچاوەی ناوبراودا لەسەر زاری پیاوچاکێکی تردا ئەڵێ (مُنْذُ أرْبَعِينَ سَنَة مَا أحْزَنَني شَئٌ سِوى طُلُوعِ الفَجرِ) واتە: ماوەی چل ساڵە هیچ شتێك منی غەمناك نەكردووە هەڵهاتنی ڕۆژ نەبێت هەروەها یەكێ لە پیاو چاكان ئەڵێ: (لَوْلاَ قِيامُ اللّيلِ وَملاَقَاةِ الإخْوانِ في الله مَا أحْبَبْتُ البَقَاءَ فِي الدّنيا) واتە: ئەگەر لەبەر شەونوێژ نەبوایە دیدەنی دۆست و برادەران نەبێ لەبەر ڕاهی خوداو هەروەها پێم خۆش نەبوو بمابوومایەوە لەم دونیایە.

(وأخْبَارُهُمْ فِي ذلِكَ كَثِيرةٌ مَشْهُورَةٌ وَقَدْ صَلّى خَلائِق مِنْهُم الفَجْرَ بِوضُوءِ العِشَاء) (رضي الله عَنْهم) واتە هەواڵیان لەم بارەیەوە یەكجار زۆرە ومەشهورەو ڕۆن و ئاشكرایە وە بەڕاستی هەندێ لەو پیاو چاكانە بەدەست نوێژی بەیانی نوێژی عیشاو خەوتنیان پێی كردووە (خوا لێیان ڕازی بێت)[1] .

**( پاشكۆ )**

هەندێ لە زانایان دەگێڕنەوە كە (ڕباحی كوڕی قەیس) ژنێكی مارەكرد وگواستیەوە كە شەو هات ڕەباح نوست بۆ ئەوەی تاقی بكاتەوە ژنەكە ئەوەلی شەو هەڵسایەوە و ووتی ئەی (ڕەباح) هەڵسەشەو نوێژ بكە هەڵنەستا نیوە شەو هات و ووتی هەڵسە ئەی (ڕەباح) هەڵنەستاو ئینجا سێ بەشی شەو ڕۆیشت و ووتی ئەی (ڕەباح) هەڵسە ئەوجا ووتی ئەی

---

(1) هەندێ لەو پیاوچاكانە بە دەستنوێژی بەیانی نوێژی (عیشا و خەوتنانیان) پێ كرد و ئیمامی (أعْظَم) واتە (ابو حەنیفە) و ئیمام شافعی و شێخ (عبدالقادر گەیلانی). و وێنەی ئەمانە.

(ڕەباح) شەو ڕۆیشت خواناسان لە خواپەرستین و تۆ هەر نوستیوت ئینجا وتی: (هاوار لە خۆم ڕوو نازانم کێ منی هەڵخەڵەتاند بۆتۆ) خوایە گیان عەفومان بکەی/ خوایە ئیمانمان بە نسیب بکەی/ خوایە یارمەتیمان بدەی بۆ شەونوێژ و سوننەتەکان و خواپەرستن/ خوایە لەتەنگاوەی ڕۆژی دوایی قوتارمان بکەی/ خوایە لەخێرو پاداشتی شەونوێژمان بێ بەش نەکەی ئامین) جا هەروەها خوای گەورە ئەفەرمووێت لەبارەی ئەوانەی کە شەو نوێــــژ ئەکـــــەن: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ سوورەتی/ الذاريات: ١٧ – ١٨) واتە: ئەو بەڕێزانە لە شەوگاردا کەم دەخەوتن یاخود کەم شەو هەبوو کە تێیدا هەڵنەسن و بە سۆزەوە شەونوێژ و خواپەرستی نەکەن.

جا هەروەها لە بەرەبەیانەکانیشدا داوای لێخۆش بوونیان لە پەروەردگاریان ئەکەن تا لێیان خۆش بێت چونکە لەناخەوە هەستیان دەکرد، کە وەك پێویست پەروەردگاری خۆیان نەپەرستوە و هەقی بەندایەتیان بە تەواوەتی ئەنجام نەداوە. أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾ سوورەتی/ الأعراف: ٥٢)

(ربّنا آتنا في الدّنيا حَسَنَةً وَفي الآخرة حَسَنةً وقنّا عذاب النّار، اللّهُمَ اغفر لَنا آمين) أقولُ قَولي هَذا وَأستَغفِر اللهَ ليَ وَلَكُمْ وَلِسائرِ المُسلمينَ نَبهني اللهُ وَإياكُم مِن نَومةِ الغافلين وَحَشَرَني وَإياكُم تَحْتَ لِواءِ سَيد المُرسَلين) آمين

# ئامۆژگاری شەست و حەوت

## باسی ( عیلم و عالیمەکان ) و زانا و زانیاری و زانست ئەکات

الحَمْدُ لله الذّي خَلَقَ الإنْسَانَ فَضّلَهُ وَكَرّمَهُ وزَيّنَهُ وَعَلّمَهُ البَيّان، والذّي عَلّمَ بالقَلَم علّمَ الإنْسَانَ مَالَمْ يعْلَمْ (سُبْحَانَ مَنْ جَعَلَ العِلْمَ للنْفُوُس طَهَارةَ ولِلْبَصَائِر نُوراً وهِدايةً فِي الدّنيا فَضِيلة وَمَكْرَمَة جَعَلَ ثَوَابهُ الجَنّة وَرضَائُهُ فِي الآخرة وأشْهَدأن لاَ إله إلا الله وأشْهَد أنّ سَيّدنَا مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُوله، وصلّي الله عَلَى سَيِّدنَا مُحَمّدٍ فَخْرَ الأنْبِياء الذّي قَالَ(مَنْ يُردالله بِهِ خَيراً يُفقهُهُ فِي الّدين) والصّلاة والسَلام على سَيِّدنا مُحَمّدٍالذّي رَغبَ فِي التَعْلِيم النّاس العِلم والحِكْمَة وآي الذكر الحَكيم فَفَازَ من إهْتدى بهَديه القويم وَخَابَ مْن عدل عَنْ طَرِيَقه المُسْتقيم ثُمّ الرَضَا عَنْ آله وأصْحَابه حَاملي مشعل العِلْم والحكمة إلى الأنام) (أمّا بَعْد فيا عِبَاد الله إتقوا الله تَعالى وأطْلُبُوا العِلْمَ وأسْتَرشدوا بِنُوره فإنّ العِلَم نورٌ والجَهْلَ ظَلامٌ) واتە: (لە دوای هەندێ ئەی بەندەکانی خوا (تەقوای) خوا بەکەن وە دوای عیلم و زانست بکەون وە هەروەها بگەڕێن بەدوای ڕووناکی عیلم وزانست چونکە زانین ڕووناکیە وە نەزانینیش تاریکیە[1] .

---

(1) هەر زانیاریەك ئینسان فێری بوو (عیلمە) زانیاری ئایینی بێ زانیاری کشتوکاڵی بێ زانیاری ئابووری بێ و (دکتۆری) بێ دارتاشی بێ،وەستایی بێ ئاسنگەری بێ، پیشەسازی بێ ... بەڵام زانستی (دین و فقه و شەریعەت) پلەو پایەی لە هەمووان گەورەترە .

خوای گەورە بە مەزناتی خۆی لە قورئاندا فـەزڵی زانـا و زانـستی بـاس کردووە هەروەها پلەو پایەو ڕێزی زانایـانی لـەزۆر ئایەتـدا بـاس کـردووە ، هەر لەبەر ئەم هۆیە کە عیلم وزانیاری ئەوەندە گەورەیە خـوای گـەورە بـە پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێ : ﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾ سوورەتی/ طـه/ ١١٤ ) ئەی مُحَمَد تۆ داوای هیچ مەکە لە دونیادا لە ماڵی دونیا لە خـوا بـەڵام هـەر داوای زانیاری و عیلم بکە و بڵـێ ئـەی خـوای مـن زانـام بکـەو عـیلمم زیـاد بکە).

وەهەروەها لە ئایـەتێکی تـردا ئەفـەرموێت: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾سوورەتی/ الزمر/ ٩) واتە بڵێ ئایە ئەو کەسانەی زانـان و شارەزان لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە نەزان و نە شارەزان یەکسانن؟! دیارە هـەرگیز یەکـسان نـین، جـا هـەروەها خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ﴾ سوورەتی/فـاطر/ ٢٨) واتە بەڕاستی لە بەندەکانەی خوادا هەر زاناکانن/ لە خوائەترسن و/ سەری نەوارشی بۆ دائەنوێنن/ چـوونکە هـەر ئـەوان دەزانـن ئـەو زاتـە چ خـاوەن دەسەلاتێکە/ دیسان خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ﴾ سـوورەتی/ المجادلـة/ ١١) واتـە خـوا لـە ڕۆژی دواییدا پلەو پایەی ئەوانەتان کە (ئیماندارن) و ئەوانەیـشتان کـە لـە زانست و زانیاریدا بەشـیان دراوە بەچـەندین پلـە بەرزدەکاتـەوە) چـوونکە ڕێزو شەرەفمەندی لای خوا تەنهابە باوەڕو زانستەوەیە ...).

جا هەروەها بێگومان خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ ﴾ سوورەتی/ آل عمران/ ١٨ ) واتە: خوا شایەتی داوە لەسەر تاك و تنەنهایی خۆی ئەمیش بە بەدیهێنانی ئەم گەردوونە بەربلاوە کە سەرنجی هەر لایەکی بدەیت و لێی ووردبیتەوە گەورەترین (شاهیدە) لەسەر تاکو تەنهایی ئەو پەروەردگارە بالادەستە ....هەورووەها فریشتەکانیش شایەتن لەسەر هەمان ڕاستی شایەتی دانەکەشیان، بەجێهێانی فەرمانەکانی خوداو بەندایەتیکردنە بۆی ، هەروەها زانایانی شارەزا وکاملێش بەئیمان هێنانیان ئەو حەقیقەتەیان لا ئاشکراو ڕوونە وە شاهێدن لەسەری).

**( ئاگاداری )**

بوخاری و موسلیم (ڕیوایەتیان) کردووە لە معاویەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت گوێم لێ بووە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لاَتَزالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَتِي قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللهِ لاَ يَضرّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ أَوْ خَالَفَهُمْ حَتّى يَأتِي أمْرُ اللهِ وَهُمْ عَلى ذلِكَ) واتە: بێگومان دەبێ کۆمەڵێ ڕزگاربوو بمێنن و بەردەوام ڕێنمایی خەڵکی بکەن بۆ ئەوەی ڕاستی ڕوون بکەنەوە وەبەڵگەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) بەڵام لە (ڕیوایەتی (ترمذی و أبو داود و موسلیم) بەم شێوەیە/ هاتووەلە (ثوبان) (خوا لێی ڕازی بێت) وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ (لا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَتي عَلى الحَقِ ظَاهِرِينَ لاَ يَضُرُهُمْ مَنْ يَخْذُلُهُمْ حَتّى يَأتي أمْر اللهِ) واتە: کۆمەڵێك لە (ئوممەتی) من هەمیشە لەسەر

ڕاستی و حەق بەردەوامن وە لەخەتی ئیسلامەتی لانادەن وەئەو کەسانەشی کە هەوڵ ئەدەن ئازاریان بدەن وە یا ئەیانەوێ لە ڕێگا لایان دەن ئەوانە ناتوانن بەهیچ شێوەیەك زیانیان پێ بگەیەنن ، وە ئەوانە لەسەر حەق و ڕاست ئەمێننەوە هەتا ڕۆژی قیامەت[1] .

## ( إكرام العُلَمَاء واجبٌ ) واتە ڕێزگرتنی زانایان پێویستە )

(كانَ صَحَابةَ رَسُولَ الله (ﷺ)أشَدُ حِرْصَاً عَلى مَعْرِفَةِ أمُورِ دِينِهِمْ فَكَانُوا يَقْبَلُونَ عَلى طَلَبِ العِلْمِ ويُواظِبُونَ عَلى حُضُورِ مَجَالِس العِلْمِ وقَدْ علّمَهُم رَسُولُ الله (ﷺ) أنّ إحْتِرامَ العُلَماءِ وَاجِبٌ عَلى كُلّ مُسْلِم ومُسْلِمة) واتە: هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر هەوڵیان دەدا فێری کاروباری دینەکەیان بن ئامادەی کۆڕی زانایان دەبوون و زانستیان وەردەگرت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری دەکردن کە ڕێزلێگرتنی زانا پێویستە لەسەرهەموو موسڵمانێك پیاو یان ژن)، (وَفِي يَوْمٍ مِنْ الأيَامِ صَلّى زَيْدُ بنْ ثابتٍ (رضي الله عنه) علَى جَنَازَةٍ ثُمّ أحْضَرُوا لهُ بَغْلَتُهُ لِيَرْكَبَها، فَلَمَا رَأى الصَحَابي الجَلِيل

---

(1) ئەم حەدیسەبەلای هەموو زاناکانەوە ئەبڕێ بەسەر (مامۆستاو ملاکانی ئایینی چوونکە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لەناو ئایینی ئیسلامدا) ئەوجا بێگومان ئەگەر مێژووی ئیسلام بخوێنینەوە بۆمان دەرئەکەوێ کەمامۆستای ئاین چۆن ئیسلامەتیان ڕاگرتووە وەلەسەر حەق ماوەتەوە لەهەمو چەرخێکدا دونیایان پڕکردووە لەزانین و زانیاری و تێکۆشاون بۆ بلاوکردنەوەی ڕاستی و (عدالەت) وسەربەستی دونیاو قیامەت) بڕوانە/ پەرتوکی (باساکانی ئیسلام لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) لە وەرگێڕانی/ خوالێخۆش بوو /(مەلا محمد عبدالكريم) لاپەڕە/ ٣٥٤، لەتەلاق دەست کاری .

عَبْدالله بن عَباس (رَضيَ الله عَنهُما) ذَلكَ أَسْرَع وأَمْسَك رِكاب البَغْلَة حَتّى يَرْكَبَها زَيدٌ فَلَما رَأى زَيدٌ كَذَلك قَالَ أُتركهُ يا بْنَ عَمِّ رَسُول الله (ﷺ) فقال إبنُ عَبَاس هَكذا نَفعَل بِالعُلَماء والكبراء) واته: جارێکیان زەیدی کوڕی ثابت (خوا لێی ڕازی بێت) نوێژی کرد لەسەر مردوویەك دوایی ولآخەکەیان بۆ هێناو ئامادەکرد تا سواربێت و بڕوات ئینجا کاتێك (عبدالله) ی کوڕی عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێت) بینی بەپەلە ڕۆیشت وجەلەوی ڕەشە ولآخەکەی بۆ گرت کاتێك وای کردو ئەمەی ئەنجامدا ئینجا زەید (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی واز بێنە ئەی کوڕی مامی پێغەمبەر (ﷺ) (عبدالله) فەرمووی ئێمە وارێز لە زاناو گەورەکانمان دەگرین) ئەوجا (فَقَبَل زَيْدُ بنْ ثَابِتٍ يَد إبنِ عباس وَقَالَ هَكَذا نَفْعَلُ بأَهْلِ بَيْت نَبِيّنا (صلى الله عليه وسلم) رواه الحاكم والطبراني) واتە: (زەید) دەستی ماچ کردو فەرمووی ئێمەش ئاوا دەبین لەخزمەتی ئال و بەیتی پێغەمبەردا (ﷺ) .

**(تنبيه)**

(وَيجِبْ عَلَى المُسْلِم أَنْ يَحْتَرِم مُعَلمَهُ ويُوَقرهُ ولَقَدْ قَالُوا قَديماً (مَنْ عَلَمَني حَرفاً صِرْتُ لَهُ عَبْداً، ويَجُوز لِلْمُسْلِمِ تَقْبِيلُ يَدِ العُلَماءِ والصّالحِينَ).

**(تێبینی)**

واتە پێویستە لەسەر موسڵمان ڕێز لە مامۆستاکەی بگرێت هەروەها بە گەورەیی بۆی بڕوانێت چوونکە لە زووەوە گووتراوە (هەرکەسێ پیتێکم فێربکات ئەوا دەبمە بەندەی) درووستە موسڵمان دەستی زانایان و مامۆستایان و پیاوچاکان ماچ بکات).

## العلم والتقوى ، واته زانست و پارێزگاری )

جا هەروەها بێگومان ئایە دەبێت هیچ کەسێك هەبێ لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) زاناتر بێت ؟ نەخێر هیچ کەسێك لەوە زاناتر نییە کەچی لۆمەو سەرزەنشتی لێ گیرا کاتێك گوتی سبەینێ وەڵامتان دەدەمەوە ، چوونکە کارەکەی پەیوەست نەکرد بە ویستی خواوە ، بۆیە لەو پێناوەدا خوای گەورە قورئانی بۆ ناردو پێی فەرموو ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ۝٢٣ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ ئینجا/ الكهف: ٢٣ — ٢٤) واتە هەرگیز لەبارەی هیچ شتێکەوە بە دڵنیاییەوە مەڵێ من بەیانی ئەو ئیش و کارە دەکەم بە ووشەی (إنشاء الله) وە نەبێت واتەکاتێك ئەتەوێ هەر شتێك بکەیت هەردەبێ بڵێیت (إنشاءالله) واتە ئەبێ خوا حەز بکات ، وە هەر کە لەبیرت چوو ئینجا وەبیرت هاتەوە هەر دەبێ إنشاء الله بکەیت و هەمیشەش یادی پەروەردگارت فەرامۆش نەکەیت)

## ( لا أدري نِصفَ العِلم ) [1]

ئائەوەتە (عبدالله) ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) لەعەصری (ئەصحابان) زانای زوهدو قورئان و سوننەت بووەو ئەوجا لەگەڵ هەندێشدا (ئیمام الزوهری) لە خالدی کوڕی ئەسلەمەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت (خَرَجْنَا مَع عَبْدالله بن عُمَر نَمْشي فَلَحَقْنَا أعرابي فقَال أنْتَ (عَبدالله بنْ عُمَر؟ قالَ نَعم، قَالَ سَألْتُ عَلَيْكَ فَدَلَّلْتُ عَلَيْكَ فَأخْبِرني أترث العَّمة؟ فقَال إبن عُمر

---

(1) لا أدري نِصفُ العِلمِ واتە/ نازانم نیوەی (عیلم و زانستە) و ئەوە لە زووەوە زۆر (مەشهورە) لەسەر زاری زانایانی (تەقواو پارێزگاری) .

لاَ أدْري فقَال أنْتَ عَبْدُالله بنْ عُمَر ولا تَدْري؟ وَقَالَ مَرةً أُخْرى أنْتَ لا تَدْري ولاَ نَدْري؟ قَالَ نَعم . إذْهَبْ إلى العُلَماء بِالمَدينَة فَسَلهُم، فَلَمَا أدبَر قَبّل إبنْ عُمر يَدَيُه فَقَالَ نَعم مَا قَالَ (أبو عبْدُالرّحمن يَسْأل عمّا لا يَدْري فَقَالَ لا أدْري) واته: لەگەڵ (عبدالله ی کوڕی عومەر)دا دەرچووین کابرایەکی دەشتەکی شوێنمان کەوت لە کاتێکدا ئێمە ڕێمان دەکرد گووتی تۆ (عبدالله ی کوڕی عومەری)؟ ئەویش گوتی بەڵێ، گووتی پرسیاری تۆم کردو تۆیان نیشان دام ئایا لە میراتدا (پوور) هیچ بەشێکی هەیە؟ (إبن عمر) گوتی نازانم، کابرا گوتی تۆ (أبن عومەر)یت و نازانیت؟ جارێکی تر گووتی تۆ نازانیت؟ و ئێمەش نازانین؟ گوتی .. بەڵێ، بڕۆ لای زانایانی (شاری مەدینە) و پرسیار لەوان بکە کاتێ کابرا ڕۆیشت (ئیبن و عومەر) دەستەکانی خۆی ماچ کرد و گوتی باشترین شت ئەوەبوو کە(أبو عبدالرحمن) پرسیاری لێکرا دەربارەی شتێك کە نازانێت گوتی نازانم .. بەڵێ (ئیبنو عومەر) دەڵێت نازانم، سوێند بەخوا بەڕاستی (جوانترین و خۆشترین و ڕازاوەترین ووشەیە).

## ( سەرنجێکی گرنگ )

(كَانَ الإمام الشَافِعي (رحِمَهُ الله) شَديدُ الذّكاء قوِيّ الحِفْظ وَيُحكى البَعضُ إنّهُ كَانَ إذا قرأ كِتَاباً خَبّأ الصّفْحة المَقابِلةَ بِيدِه حتّى لاَ يَخْتَلِطَ حفْظ الصَفْحَة اليمنى مَعَ الصفْحَةَ اليُسْرى فَكَانَ سَرِيع الحِفْظ قَويٌّ الذَاكرة) واته: پێشەوا شافعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) زۆر بەخێرایی زانست فێر دەبوو وە لەبیری نەدەچووە، ئەگەر بێت و پەرتوکێك بخوێندایەتەوە دەستی

دەخستە سەر لاپەڕەکەی تر تا نەبادە بیبینێ ئەویش لەبەری کات و لێی تێك بچێت لەبەر بەهێزی لەبەرکردن و بیرتیژی و(ذَاتَ يَوْمٍ ذَهَبَ الشَافعي إلى أسْتَاذِهِ وكيع وَشَكَا إلَيْهِ أنَّهُ لَمْ يَعُدّ يَحْفَظ العلْمَ جيداً كَمَا كَانَتْ عَادَتُهُ)، وفِي ذَلكَ قَالَ الشَافِعي (شَكَوْتُ إلى وكيعٍ سُوءَ حِفْظِي — فارشدني إلى تَرْكِ المَعاصي) (وأخبرني بأنّ العِلْمَ نورُ — ونُورُ اللهِ لاَ يُهْدى لِعاصي)[1]. واتە: ڕۆژێك چووە خزمەت مامۆستاکەی ئینجا پێی ووت کە وەك پێویست شتم بۆ لەبەر ناکرێ وەکو پێشان بیرتیژم نەماوە؟ ئەویش ووتی پێ دەچێ هۆی کردنی گوناهێك بێت چونکە سەر ئەنجام بیرت لاواز بووە بۆیە ئیمام شافیعیش ئەم هۆنراوەی فەرموو

**(سکاڵای خۆبردە لای مامۆستاکەم لە خراپی بیرم* ڕێنمایی کردم بۆ واز هێنان لە خراپە)**

**(پێی ووتم کە عڵم و زانست ڕووناکییە * وە ڕووناکی خوایی بۆ کەسێکی گوناهکار نابێ)**

(قالَ بَعْضُ العُلَماءِ (العِلْمُ فَضل وَرِزْقٌ يهُبه الله سُبْحَانَهُ وتعالى لِمَنْ يَشاءُ مِنْ عِبَادِهِ خاصَّةً الأ تْقياءَ قالَ تعالى ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ سوورەتی/ البقرة/ ٢٨٢) واتە: هەندێ لە زانایان ئەفەرموون (زانست ڕێزە و ڕۆزییە) جا بێگومان خوای گەورە دەیبەخشێ بە هەر کەسێ بیەوێت لە بەندەکانی لە خواترسان و پارێزگاری ئەکەن ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ

---

(١) ئەم دوو هۆندنەوەی ئیمامی (شافعی) لە پێشەوەش باسکراوە بەڵام بە (شیعر) تەرجومە کرابوو.

ٱللَّهُ ﴾ واتە: (لە خوا بترسن و خوای گەورە فێری زانست و کاروباری ئاینیتان ئەکات).

**(کورتە باسێك لە تەقوای ئیمامی شافیعی خوا لێی ڕازی بێت)**

جا هەروەها بێگومان ئیمامی (شافیعی) بەهۆی خواپەرستی (ئیخلاص) و تەقوایەوە خوای گەورە پایەی پێداو کردیە پێشەوای موسڵمانان تا زانستی ڕاستەقینەی قورئان و فەرمودەیان پێشکەش بکات چوونکە بەڕاستی زانست کاتێك بەکەلك دێت وە کاریگەری دەبێت کە خاوەنەکەی پێش هەموو کەس ڕەفتاری پێبکات و خۆی نموونەی ئیمانداری ڕەفتار جوان بێت، تەقواش بریتیە لەوەی کە ئیماندار واز لەو شتانە بینێت کەخۆی حەزیان لێ دەکات و جا هەورەها شوێنی ئەو کارنە بکەوێت کە (شەرع) پێیان باشەو لە موسڵمانیان داوادەکات

**(ورعی) (ئیمامی شافعی) (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای لێ بێت)**

جائیمام شافعی (رەحمەتی خوای لێبێت) هەورەك لە (ئیجتیهاد) وفقه دا/ پێشوەوا بوو هەورەها لە (ئیمان وتەقواو وەرع و خوا پەرستیشدا) پێشەوا بوو/ زانای بەناوبانگ (ربیع) ئەڵێت (عبدالله ی کوری عبدالحکم) کە لە مامۆستا پایەدارەکانی (مەزهەبی مالکی میسر) بووە بە (ئیمام شافعی) ئەڵێت ئەگەر دەتەوێ لەم ولاتەدا واتە (میسر) نیشتەجێ ببێت با خۆراکی ساڵێکت هەبێ و هاتووچۆی (مەجلیسی) سوڵتان بکە تا پێی دەسەلات دار بی ئینجا ئیمامی (شافعیش) فەرمووی (ئەبو محمد) هەرکەسێك بەتەقوا

دەسـەڵات دار نـەبێ هـەرگیز (دەسـەڵاتی) نـابێ (فـەرمووی مـن لـە غـەزە لـەدایك بـووم، هـەروەها لـەعیجازیش گـەورەكراوم و خـۆراكی شـەوێكمان نـەبووە وە هـەرگیز بـە برسـیتیش سـەرمان نەناوەتـەوە) یـەكێكی تـر لـە (زوهدی) ئیمامی (شافیعی) ئەوەبووە فێرە عیلم و زانست ببێ و لەو بەڵام (نیسبەت) نەدەنە لای ئەو كە لەو فێربوونەو دا هەروەها موسـڵمانی بـەڕێز ئەگەر باسی (ئیمامی شافعی) بكەین بە تەواوی بە (كتێبێك) و دوو (كتێب) كۆتیی نایەو (مەتح) و ستایشی ئەم زاتە ئا ئەوا ئیمـامی(مالیـك) ی كـوڕی (ئەنەس) ئەڵێ ئیمام شافعی ئەستێرەیەكی گەش بوون لە ئاسمانی زانست زانـایی دا دەدرەوشـێتەوەكە بـە (ئیمـام دار الهجـرة) ناسـراوە قوتابیـە ژیرەكەی كە (الـشافعی) یـە دەڵێـت بـە نـۆ ڕۆژ كتێبـی (موطـأ)ی ئیمـامی (مالك)ی هەموو لەبەركرد جا هەورووەها ئیمام (مالك) پێی ئەفەرموێت ئـەی (شافعی) من وا دەبینم كە خـوای گـەورە/ ڕووناكیـەكی خـستتۆتە دڵتـەوە تۆیش/ بە تاریكی سەرپێچی مەیكوژێنەوە/ ئیمـامی (شـافعی) ئەفـەرموێت هاوڕێیەتی (مالك)م كرد جارێكیان پرسیاری لێكرا دەربارەی (چل و هەشت مەسەلە) كەچی ئیمام ماڵك بە سی و دوو دانەی گووتی نازانم) جا هەروها دەگێڕنـەوە ئیمـامی شـافیعی مامۆسـتای (ئەحمـەد ی كـوڕی حەنبـەڵ) ە (ئیسحاق) ی كوڕی ڕەهەوی دەڵێت: ئیمام (ئەحمەد) بـەمنی گـووت ئـەی (ئیسحاق) وەرە با كەسـێكت پـێ نیـشان بـدەم لـە (مەككـە) كـە هـەرگیز چاوەكانت كەسی وایان نەبینیوە (ئیسحاق) ووتی جا (الشافعی) پێ نیشان دا منیش تێڕوانینم لەگەڵ دا كرد دەربارەی (فقە) و كەچـی هـیچ كەسـێكم وەك ئەو نەبینیوە دەربارەی (قورئان) تێڕوانینم لەگەڵ داكرد كەچـی هـیچ كەسێكم نەبینیوە لـەو زانـاتر بێـت جـا دەربـارەی (فـەرموودە) تێـڕوانینم

لەگەڵدا کرد کەچی هیچ کەسێکم نەبینیوە لەو زاناتر بێت لەگەڵ (شافیعی) دەربارەی زمان تیڕوانینم لەگەڵدا کرد کەچی هیچ کەسێکم نەبینیوە لەو زاناتر بێت وەك (شافیعی) جا هەروەها دەگێڕنەوە (ئیمامی الشافعی) لە مەجلیسە پڕ لە زانستەکەیدا دادەنیشێت کەسێك دێت و لە مەسەلەیەکدا پرسیارێکی لێ دەکات ئەویش بێدەنگ دەبێت کابرا دەڵێت ئایە بۆ وەڵام نادەیتەوە ؟ کەچی ئەو بێدنگە ئینجا کابرا دەڵێت ئایە وەڵام نادەیتەوە؟ خوا ڕەحمت پێبکات (فَقَالَ الشّافعِي إنْتَظر حَتّى أعلمَ هَل الفَضل في سكوتي أمْ في جوابي) [1].

واتە: ئیمامی شافیعی گوتی چاوەڕێ دەکەم تاوەکو بزانم ئایە فەزڵ و چاکە لە بێدەنگیم دایە یان لە قسە کردنمدا ؟ ئەی خودایە بەڕاستی ئێمە لەوپەڕی بوێری داین ئێستا ش گوێ بگرە لە هۆننەوەیداو کە دەڵێت (وَغيرَ تَقي يأمرُ الناسَ بالتُقى – طبيبٌ يداوي الناسَ والطبيب عَليلُ) وات : ئەوانەی کە لەخوا ترس نین فەرمان دەکەنە خەڵکی بە لەخوا ترسان پزیشکێك چارەسەری خەڵکی دەکات و کەچی پزیشکەکە خۆی نەخۆشە) دەڵێن ئیمام شافیعی ئەم (چەند شیعرەشی) گووتوە کە ئەفەرموێت:

إذا عَاشَ الفَتى ستّين حولاً — فَنصفُ العُمر تُمْحقهُ اليّالي
وَنَصفُ النّصِف يَمْضي ليسَ يَدْري — لَغفلَته يَميناً منْ شِمالِ
وَبَاقي العُمْر إسْقامٌ وَشَيبٌ — وآفات تَدلُ عَلَى الإنْتِقالِ
فَحَبُّ المَرْءِ لِلْحَيوانِ جَهْلٌ — وَقَسْمَتُه عَلى هذا التّوالي

---

(١) بڕوانە پەرتوکی (أحداث النهاية– ونهاية العالم) لە نووسینی (الشيخ محمد حسان) لاپەڕە ٤٢١ ، مكتبة فياض.

( **پاشکۆ** )

جا هەروەها (حەکیمێك) بە عەرەبی ئەڵێت (العِلْمُ بِالعَمَلْ وإلاّ فَارْتَحَل) واتە عیلم و زانیاری دەبێ عەمەلی پێبکرێ و هەروها کردەوەی لەگەڵ بێ ئەگەر نا نامێنێ و (رەحمەتی خواش لەشێخی سەعدی بێت) کە ئەڵێ:

(عیلم چەندا نکە پێشتر خوانی          چون عَمَل نَرْ تُونیسْت نادانی)

واتە: (هەرچەند شت زۆرتر بزانی و عیلم زیاتر بخوێنی کە عەمەلی پێنەکەی هەر نەزان و (جاهیلی) با تۆ بەئەندازەی (لوقمان ی حەکیم) زانابی لە (دکۆریدا ئەگەر وەك (لوقمان) خوانەناسی/ چ فائیدەی هەیە؟ (یارەبی خودایە روحم بە زانای نەزانمان بکە/ خوایە حەفومان بکەی/ خوایە تەرەقی بەدین و دونیامان بدەی/ خوایە لە بەلآو موسیبەت بمان پارێزی ئامین).

وبعد أعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ سوورەتی/ البقرة: ٣٢ ) (نَبهَني اللهُ وإيّاكمْ مِنْ نَوْمَةِ الغَافلين وَحَشَرَني وإيّاكُمْ تَحْتَ لِواءِ سَيِّدِ المُرْسَلين) اللهُم إغفر لَنا آمين).

# ئامۆژگاری شێست و هەشت
## باسی فیتنەی ئاخر زەمان بە حەدیس بۆمان ئەکا بەیان

الحَمْدُ للهِ الذّي انْزَلَ الفُرْقَـانَ عَلَـى عَبْـدِهِ لِيَكُـونَ لِلْعَـالَمِينَ نَظِـيراً وجَعَلَـهُ لِلْمُهْتَدِينَ سَرْجَاً وَقَمَراً مُنيراً وَبَشّرَ فيهِ المُؤمنين بِإنَ لَهُمْ مِنّ اللهِ فَضْلاً كَبِيراً نَحْمَدُهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى ونَـشْكُرُهُ عَلَـى نِعَمِـهِ التّـي عَمّتَ جَمِيـع الأنـام كَـبِيراً وَصَغيراً وَنَسْتَعينَهُ ونستَغْفِرَهُ وكَفى بِربّكَ بِذُنُوب عبادِهِ خَبِيراً بَصيراً وَنَشْهَدُ أنّهُ اللهُ الذّي خَلَقَ كُلّ شيءٍ فَقَـدّرّهُ تَقْـديراً ونَـشْهَد أنّ سَـيّدنا محمّـداً عَبْـدُهُ وَرَسُولَهُ وَشَفيعُ الحُصاةِ في يَوْمٍ كَانَ شَرّهُ مُسْتَطيراً والـصّلاة والسّلامُ وبَـارَكَ عَلَيْهِ وَعَلى آلهِ الـذّين أقـرَبّهِمْ دينَـهُ وكَـانَ لَـهُ وَلِيّـاً وَنَـصيراً ) أمّـا بَعْـد أيّهـا المُسْلِمُون أوْصيكُمْ عِبّادَ اللهِ بِتَقْوى اللهِ وطَاعَتِهِ في جميعِ أوْقاتِكُمْ)، واتە: لـە پاش هەنـدێ ئـەی موسـڵمانەکان وەسـیەتتان لێ دەکـەم ئـەی بەنـدەکانی خودا بەتـەقوای خوای گەورەو دەرنەچوون لە فەرمانەکانی لە هـەموو کـات وساتێکدا ئیماندارەکان خوای گـەورە لـە سـورەتی (روم) دا فەرموویـەتی:

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ سـوورەتی/ الـروم/ ٤١ ) واتــە : لەبـەر کـردەوەی خراپەی ئادەمیزاد فەساد و ناخۆشی لە زەوی و لـە دەریـادا دەرکـەوتووە وەك بڵاوبوونەوەی نەخۆشی و زۆربوونی (لافـاو و بوومەلـەرزەو ڕەشـەبای بەهێزو فەوتێنەر) خودا هەموو ئەمانەی درووست کردووە بۆ ئەوەی جەزای

هەندێك لە كردەوە خراپەكانیان بە خەڵكی بچێژێت بەڵكو لە خراپەكاری بگەڕێنەوەو بكەونە شوێن ڕێبازی ڕاست، هەندێك لە زانایان دەڵێن مەبەست لە (بر) ئەو شارو لادێیانەیە كە لە دەشتایی دان و مەبەست لە (بحریش) ئەو شارو لادێیانەیە كە لە كەناری دەریاو (ڕووبارە گەورەكاندان) هەندێكی تر لە زانایانی (تەفسیر) بەم شێوەیە تەفسیریان كردووە واتە: پەیدابوونی (فەساد) لە دەشت و بیاباندا و لە بەحرو دەریادا بەهۆی كردەوەی خراپی خەڵكەوە بوومە لەرزە زۆر دەبێت (جووت و گا بڕستی) نامینێ باران لەكاتی پێویستدا نابارێ یا لەهاویندا دەبارێ و كانیاو كەم دەژینەوە یا ئاو یان چك دەبێ و یان دەردە (حەیوان) پەیدا دەبێ هەروەها دەردو بەڵاو شەڕو ئاژاوە زۆر دەبێ لە (بەحرو دەریادا) تۆفان و لافاو هەڵدەستێ كەشتی زۆر غەرق دەبن خەڵك زۆر دەخنكێ و لەناو دەچێ كە خوورشەوشتی خەڵك (فاسید) بوو وەزعی خەڵك و ژیانی خەڵك بە تەواوی دەگۆڕێ ئەمانە هەمووی بەهۆی كردەوەی خراپی بەرەی ئادەمیزادەوەیە بۆ ئەوەی سزای هەندێك لە خراپەكانیان بچێژن بەڵكو دەست لە خراپەوفەسادو بەد ئەخلاقی هەڵگرن و بگەڕێنەوەبۆلای خوای خۆیان) جا هەروەها بێگومان خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗ ﴾سوورەتی/ الأنفال/ ٢٥) واتە: لەو فیتنەو بەڵایەش خۆبپارێزن و بترسن كە كاتی دێت تەنها دووچاری ئەوانەتان نابێت ناهەقیان كردووەو دەستیان تێیدایە بەڵكو یەخەی هەمووان گوناهبارو بێ گوناه(چاك و خراپ) دەگرێتەوە، یان وەك دەڵێن (تەڕو ووشك) پێكەوە دەسوتێت پاشان هەریەكەو بەپێی نیەت و

مەبەستەکەی خۆی زیندوو دەکرێتەوە جا خوای گەورە سزای خراپـەکاران دەدات و پاداشتی چاکە کاران دەداتەوە[1].

جا بێگومـان ئەگـەر ئێمـە تۆزێـك بـەووردی تەماشـای مێـژووی گـەلانی ڕابردوو بکەین و بەسەرهاتیان بخوێنینـەوەو دەبیـنین هـەر خراپەیـەك کـە بەسـەریان هـاتووە هـەر شکـست و زەلیلیـەك تووشـیان بـووە هـەر بـێ حورمەتیـەك کـە پێیـان کـراوە هـەمووی بـەهۆی لادان لـە فـەرمانی خـواو کردەوەی خراپی خۆیانەوە بـووە ، هـەروەکو خـوای گـەورە لـە سـورەتی (أنفـــال) دا دەفـــەرموێت: ﴿كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ﴾ سوورەتی/ الأنفال/ ٥٢) واتە: باوەڕیان بە (کلام) و فەرمایشتو ئایەتی خوا نەماو لەڕێگای ڕاست و کردەوەی چاك لایان دا بۆیە خـوای گـەورە بـەهۆی گوناهەکانییانـەوە (غـەزەبی) لێگـرتن و لەناوچـوون، جـا هـەروەها خـوای گەورە لـەم ئایەتـشدا دەفـەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ سـوورەتی/ البقـرة/ ٢٨١) واتە:خەڵکینە لە سزای ڕۆژێك بترسـن کـە هـەمووتان تێیـدا ئەهێنرێنـەوەو بۆلای خوا لەپاشان هەمووکەسێك پاداشتی کارو کردەوەی خۆی بەتەواوی دێتـەوەڕێ سـتەمیان لێ نـاکرێ (کـەم و کـورتی لـە چـاکەکانیاندا نـاکرێ زیادیش لە گوناهەکانیاندا نادرێ بە کۆڵیاندا) .

---

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (دوایین ڕوداەکان و کۆتایی جیهان) لە وەرگێڕانی (عبدالمجید عبدالحمید)لاپەڕە/ ١٧٧.

## ( چەند فەموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی فیتنەی ) [1] ئاخر زەمانە )

١) عَنْ أبي هُرَيْرَة (رَضي اللهُ عَنْهُ) قَـالَ قَـالَ رَسُـول الله (صـلّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسلم) واتـە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) ئـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (بَـادِرُوا بَالأعْمَـال فِتْنَـاً) واتـە: بـە کـردەوەی چـاکە پێشبڕکێ بکەن پێش ئەوە ی تاقیکردنەوە دابەزێتە سـەر هـەر یەکێکتانـدا (كَقَطِيع اللّيْلِ المُظْلِمِ يَصبْحُ الرّجُـل مُؤمِنـاً وَيمْـسي كَـافِراً أوْ يُمْـسَي مُؤمِنـاً وَيَـصْبَحُ كَـافِراً) واتـە: وەکـو پارچـەیەك لـە شـەوەزەنگی تاریـك کـە ڕۆژ دەبێتەوە کابرا ئیماندارەو کەچی ئێوارەی بەسەر دادێت (کافر) بـووە یـان کە ئێوارە دێت ئیماندارەو کاتێ ڕۆژ دەبێەوە (کافر) بـووە چـوونکە (يَبِيـعُ دِينـهُ بِعَـرْضٍ مِـنْ الـدّنيا) رواه مـسلم/ في صـحيحه/ واتـە دینەکـەی خـۆی دەفرۆشێت بەشتێکی بێ نرخی دونیا.

٢) جا هەروەها لەبارەی فیتنەوە حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت: (وَتَجيء فِتْنَة فيَرَقّقُ بَعْضَها بَعْضاً وتَجِـيء الفِتْنَـةُ فَيَقُـول المُـؤمِنْ هَـذِهِ مَهْلَكَـتي ثُـمّ تَنْكَشِفُ وتجيءُ الفِتْنَة وَيَقُول المُؤمِنُ هذه، هذه فَمَـن أحبَ أن يُزَحْـزَحُ مِـنَ النّار ويَدْخُلَ الجَنّة فَلتأته مَنّيتُه، وَهُوَ يؤمِنْ بِالله واليّوم الآخر وَلْيَـأت النّـاس الذّي يُحب أنْ يُؤتى إليهِ) واتە: (هەرفیتنەیەك دێت و ئەوەی پاش ئـەو لـەو خراپتروگـەورەترە) فیتنـە دێـت و کەسـی ئیمانـدار دەڵێـت بەڕاسـتی ئـەم (فیتنەیە بەهیلاکمان) دەبات ئەم جارە ئـەو فیتنەیـە لەسـەر لادەچێت و ئینجا فیتنەیەکی تر دێت وئیماندار دەڵێت ئەمە، ئەمە واتە ئەمە بەڕاستی

---

(1) ووشەی (الفتن) کۆی (فیتنە)یە ، مەبەست لە (فیتنە) (تاقیکردنەوەو ئەزموون دێت) بڕوانە هەمان سەرچاوە .

ئەوجارە بە هیلاکەتمان ئەباو جا هەرکەسێ دیەوێ لەئاگر ڕزگاری بێت و بچێتە بەهەشتەوە با کاتێ دەمرێت باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت و بڕوات بۆلای ئەو کەسانەی کە پێی خۆشە بچێت بۆلایان).

٣) وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودیەکی تردا ئەفەرموێت (وإنّ أُمَتكم هذه جَعَلَ عَافيَتُها في أوّلها وسيصيبُ آخرها بَلاءً أمُورٌ تَنْكرُونَها) واتە : ئەم ئوممەتەی ئێوە هێزو ڕەنگو بۆی لەسەرەتاکەیدایە و کۆتاییەکەی تووشی بەلاّ دەین و تووشی چەندەها کێشە دەبن ئینکاری لێ دەکەن.

٤) ئیمامی بوخار ی و موسلم ڕیوایەتیان کردووە لەفەرموودەیەکی ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (إنّ مِنْ أشراط السّاعَة أنْ يَرْفَع العِلْم ويَثْبت الجَهْلَ وَيشربُ الخَمْرَ ويَظْهَر الزِّنا) واتە: لە نیشانەکانی پێش ڕۆژی قیامەت زانست و زانیاری وون دەبێ واتە بزر ئەبێ و نامێنێ وە نەفامی جێگیرو دامەزراو ئەبێت وەمەی دەخورێتەوەو زینا بە ئاشکرا دەکرێ.

**(ئاگاداریەك)**

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە کە ناوی عەرەق دەگۆڕن لە ئاخری زەمان وەك ئەفەرموێت (يَشْرَبُ نَاسٌ مِنّا مِنْ أمّتي الخَمَرَ يسَمُونَها بِغَير إسْمِهَا) رواهُ ابنْ ماجة وابن حبان في صحيحه، واتە: (لە ئوممەتی من هەندێ کەس مەی دەخۆنەوە وەناوی دەگۆڕن بۆ ناوێکی تر) [1] وەکو

---

(١) بڕوانە/ پەرتوکی/ تاوانە گەورەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە / لەنووسین وئامادەکردنی عبدالرحمن ملا طه/ عبدالعزیز، لاپەڕە/١٠٢.

بیرەو وێنەی ئەوەوە، بەڵام بەداخەوە ئەوانەی ئەم سەردەمە پێی ناڵێن مەی بەڵام پێی دەڵێن (المشروبات الروّحيّة) بەناوی ترەوە ناویان لێ ناوە بەهۆی ئەوەی لەگەڵ ئەم سەردەمەی تیایدا دەژین بگونجێ.

هەزار ڕەحمەت لەو کەسە بێ کە فەرموویەتی:

إنْ قلتَ قَالَ الله قَالَ رَسُولَهُ — همزوك همز المُنْكَر المفْتال

أوْ قُلْتَ قَال الصّحَابَةُ والأولو — تبع لَهُمْ في القوْلِ والأعْمَال

أو قُلْتَ قال الشافعّي وأحْمَد — وأبُو حَنيفة والإمَام الغالِ

صَدّوا عَنْ وَحيِ الإله ودينه — واحتالوا علَ حرام الله بالإحلال

يا أُمَةً لَعبت بدين نَبِّيها — كتَلاعُب الصُّبْيانِ في الأوْحال

حاشا رَسُول اللهِ يحكم بِالهوى — تِلْكَ حكُومَةُ الضِلال

واتە: ئەگەر بڵێیت خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرمووی ئەوا چاوە پێت لێ ئەکەن وەکو کەسێکی بێ بڕوای لەخۆبایی بایی یا بڵێیت یارانی و هاوەڵانی فەموویانە گاڵتەیان پێ دێت ویان بڵێیت الشافعی و أحمد فەرمووی أبوحنیفە پێشەوای بەنرخ و گرانبەها مەبەستی (مالکە) بەرهەڵستی (وەحی) و خوداو دینەکەی دەکەن چوونکە فێڵ دەکەن لەوەی کە خوا (حەرامی) کردووەو حەڵاڵی دەکەن ئە ئەو ئوممەتەی کە بە دینی پێغەبمەرەکەی یاریان کردووە وەکو یاریکردنی منداڵ لەنێو قوڕاودا، حاشا بێت کە پێغەمبەر (حوکم) بە هەوەس وئارەزووی خۆی بکات بەڕاستی ئەوە حوکمێکی باطل و کوێرانەیە...).

٥) دیسان پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ (لاَ تَقُومُ السّاعَةُ حتّى يكْثر الهَرَج قَالوا وَمَا الهَرجُ يَا رَسُول الله؟ قَال القَتْل القتل) رواه مسلم عن

أبـوهريره(رضـي الله عنـهُ)، واتـه: قيامـەت هەڵناسـێ تـاوەکو (الهـرج) زۆر نـەبێت، هاوەڵـەکانی گووتیـان ئـەی پێغەمبـەر(ﷺ) هـەرەج چـییە ؟ فەرمووی کوشتن کوشتن) واتـە (الهـرج) بـە زوبـانی حەبەشـیەوە چـوونکە ئەگەر کوشتنی بەناحەق زۆربوو پێی دەڵێن (هەرەج) .

٦) وەهەروەها ئەفەرموێت : (والذّي نفسي بِيَدِهِ لاَ تَـذْهب الـدنيا حتّـى يأتي عَلَى النّاس يَوْمَ لاَ يَدري القَاتِل فيِمّ يقتـل ولا المقتـول فـيمَ قُتـل) رواه مسلم واتە : سوێند بەو کەسەی کـە گیـانی منـی بەدەسـتە ئـەم دونیایـە بەسەر ناچێت تا کو ڕۆژێك دێـت بەسـەر خەڵکیـدا کـەوا بکـوژ نازانێـت بـۆ دەکوژێت وە کوژراویش نازانێت بۆ کوژراوە .

٧) دیسان حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت: (بَيّن يَدي الـسّاعَة يَظهَـر الرِّبـا) رواه الطبراني/ عن عبدالله بن مَسْعود) واتە لەبەر دەستی قیامەتا زربوون و بلاوبوونەوەی سـوو خواردنـە مانـای(الظهـور) واتـە لێـرەدا زۆربـوون وبـلاو بوونەوەیە .

٨) پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەیەکی تردا دەفـەرموێت: (إذا ظَهَـر الزِنّـا والرِّبَا في قرْيةٍ فَقَدْ أحلّـوُا بِأنفُـسِهِم عَـذاَب اللهِ) رواه/ الحـاكم/ وغـيره) واتـە: ئەگەر بە ئاشکرا داوێن پیسی کراو سوو خورا لەهەر شـارو دێهاتێکـدا ئـەوا سزای خوایان لەسەر خۆیاندا سەپاندووە.

٩) جا هەروەها دیسان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی (لاَ تَقُـومُ الـسّاعة حتّى تَظْهَرَ االفِتن ويكثـر الكـذب) رواه أحمـد، واتـە: قیامـەت هەڵناسـێت و ڕوونادات تاوەکو فیتنە دەرنەکوێت و درۆ زۆر نەبێت .

١٠) دیسان حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی: (لاَ تَقُومُ السّاعَةُ حَتّى يَقْبَضُ

العلْـم وتَكثُـر الـزّلازل و يتقـارب الزمـان) رواه البخـارى، واتــه  قيامــەت هەڵناسـێت تـاوەکو زانیـاری هەڵنــەگیرێت وە بوومەلــەرزە زۆر نــەبێت وەڕۆژگـار نزیـك نەبێتــەوە، وە لــە ڕیوایــەتێکی تـردا هـاتووە ئەمــەش دەقەکەیەتی و پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت (يَتَقَاربُ الزّمان وَيَنقُصُ العَمَلُ ويلّقى الشُّح) واتـە: ڕۆژگارێك نزیك دەبێتـەوە و کـارکردن کـەم دەبێـت و چرووکی زۆر دەبێت).

## (ئاگادارییەکی گرنگ)

نیشانەی یەکـەم لـەم فەرموودەیـەدا (تَقـارب الزّمـان) ئایـا مانـای ئـەو فەرموودەیـە چـییە (حَتّــى يَتَقـاربَ الزّمـان) جـا زانایـان بـەم فـەرموودە (صحيحه) وەڵامیان داوەتەوە و وەك (ابو هريـره-ڕەزای خـوای لـێ بێـت) ئەگێڕێتەوە (لا تَقـوُمُ الـسّاعة حَتّـى يَتَقـاربُ الزّمـان فَتَكـونَ الـسّنة كالـشّهرِ ويَكونَ الشّهر كالجُمعَةِ وتَكونُ الجُمعةُ كاليَومِ ويَكوُنُ  اليْومُ  كالسّاعةِ وتَكونُ السّاعة كإحتراقِ السَعُفة الخوْصة) رواه أحمد وإبـن حبّـان فى صـحيحه وأبـو يعلى فى مسنده، واته: (قیامەت ڕوونادات تـاوەکو ڕۆژگـار نزیـك نەبێتـەوە، جـا سـاڵێك وەکـو مانگێـك دەبێـت و مانگێـك وەکـو هەفتەیـەك دەبێـت و هەفتەیـەك وەکـو ڕۆژێـك دەبێـت و ڕۆژێـك وەکـو کاتـژمێرێك دەبێـت وە کاتـژمێرێك  وەکـو سـووتانی پەڵکـە دارخورمایـەك دەبێت، جـا بێگومـان خۆشەویـستی خـودا حـەزرەتی پێغەمبـەر (ﷺ) ڕاسـتی فـەرمووە قـەت قسەی بە هەواو هەوسی خۆی نەکردووە) چـونکە ئـەم نیـشانیە هـەموویان ڕوویــان داوە و ئێمـــەش پــێش هەنــدێ ڕۆژێکــی کــەم ڕۆژووی مــانگی

ڕەمەزانمان دەگرت، ئاو ئەوەتا ئێستا چاوەڕوانی ڕەمەزانێکی تر دەکەین، هـەروەها سالێك وەکو مـانگێکی لـێ دێـت، خـاوەن کارێـك یـان خـاوەن پیشەیەك یان خاوەن نووسینگەیەك هەرکە دەردەچێت و دەچێتە سـەر کارەکەی گوێی لە بانگی نیوەڕۆ دەبێت هـەر کاغەزەکـەی ئـەودیو ئـەودیو دەکات و دەست بەکارەکە دەکـات ئـەبینێ کاتەکـەی تـەواو بـوو.....(الله أکبر) ئەمەش موعجیزەی پێغەمبەر (ﷺ) (*)

**( پاشکۆ )**

جـا هــەروەها بێگومــان ئــەوەی ڕاســتی بێــت ئیمــامی (ئەحمــەد) لەمـسندەکەیدا و ئیمـامی بوخـاری لـە (الأدب المفـرد) دا بـە سـەنەدێکی (صحیح لە عبدالله ی کوڕی مسعودەوە) ریواتیان کـردووە کەواپێغەمبـەری خـوا (ﷺ) فەرمویـەتی (إنَّ بَـيْنَ يَـدي الـسّاعة وظُهُـور القَلـم) واتـە لەبـەر دەستی قیامەت واتە لەپێش قیامەت دەرکەوتنی پێنووسەکانە جابەڕاستی لەم سەردەمەدا پێنووس دەرکەوتووە جا بێگومان نوسین و ڕۆژنامەگـەری بلاوبۆتەوە .

هــەروەها ڕۆژنامــەو گۆڤــار بەشــێوەیەکەی بەرچــاو بلاوبوونەتــەوە بەتایەبتی لەپاش ئەوەی ئامێری چاپی نـوێ پەیـدابووە کـە لەتـەنها یـەك خوولەکـدا هــەزاران بــەڵکو (مــەلایین) ووشــە چـاپ دەکـات جـا زانیـاری دەربارەی ئەم دونیایە بەردەوام لەزیاد بوون دایە وەهەر وەکو پێغەمبەری

---

* بڕوانە/ پەرتووکی (دوایی ڕووداوەکان و کۆتایی جیهان) لە نووسینی (محمد حسان) لە وەرگێڕانی/ بەڕێز (عبدالمجید عبدالحمید) لەگەڵ دەستکاری، لاپەڕە/ ٣٧١

ڕاستکۆ(ﷺ) فەرموویەتی لەکاتێکدا کە زانیاری دەربارەی قورئان وسوونەت کەم بۆتەوە و بەڵکو بەڕاستی نەفامی دەربارەی قورئان و سوننەت دەرکەوتووە[1] و کاریان پێ ناکرێ و خستوویانەتە پشتگوێ.

(خوایە بەگەورەی خۆت عەفوکمان بکەی/ خوایە لەسەر چاکە تەوفیقمان بدەی/ خوایە لە فتنەی ئاخرزەمان/ بەدوورمان بخەی/ خوایە دین و ئایینی ئیسلام بەهێز بکەی ئامین أعوذ بالله من الشيطان الرجيم / إن في هذا لبلاغاً لقومٍ عابدين (نَبهَني اللهُ وإيَّاكُمْ مِنْ نَوْمةالغَافلين وحَشَرَّني وايَّاكُمْ تَحْتَ لِواءِ سَيِّد المُرْسلِينْ اللَّهُمَ إغْفِر لَنَّا أمين).

---

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (نهاية العالم–أشراط الساعة الصغرى والكبرى) لە نوسینی (الأستاذ محمد حسان) تحقيق الدكتور (محمد بن عبدالرحمن العريفي) لاپەڕە/ ٧٤.

# ئامۆژگاری شەست ونۆ

## باسی ( إغتنام الفرصه ) واته لەدەست نەدانی فرسەت دەكات

الحَمْدُ لله ثُمّ الحَمْدُ لله مَا تَوْفيقي ولا إعتصامية عَلَيهِ تَوَكَّلتُ وإليه أنيب الحَمْدُالله الذّي جَعَل إغْتنَام الفُرصّة شعَارْ المُؤنين وأشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ الله الواحدُ القّهار العَزيزُ الغَفّار وأشْهَدُ أنّ سَيِّدَنا مُحَمّداً عَبْدُهُ ورَسُولَه المَبْحُوث إلى النّاسِ كَافةً بِالدَليل والبُرهانِ والصّلاةُ والسَلام على سَيِّدنَا مُحَمّد وعَلَى آلهِ وأصْحَابِهِ ومَنْ تَبعهم بِإحْسان إلى يَوم الدّين)

(أمّا بَعْد فَيَا إخْواني الكِرام أوْصيكُمْ عيبادَ الله بِتَقوا اللهِ وطَاعَتِه) واته: لەدوایی هەندێ ئەی برایانی بەڕێزم وەسیەتان لێ دەكەم ئەی بەندەكانی خودا بەتەقواو پەیڕەو كردنی خوای گەورەو وە دەرنەچوون لە فەرمانەكانی ئەو لە هەموو كات و ساتێكدا).

جا هەورەها خاوەن باوەڕان لە (خوتبەو ووتاری) ئەمڕۆكەماندا باسی لە دەست نەدانی فرسەت و كات لەدەستنەدانتان بۆ ئەكەم چوونكە بەڕاستی كات و سات زۆر گرنگە بۆ ئینسان ونابێ بە فیڕۆییان بدەین .

جا بێگومان خودای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾سوورەتی/ البقرة/ ١٤٨) واته لەكاری خێردا بەپێش یەكتر بكەون وە هەلْ لەدەست خۆ مەدەن و دوای مەخەن) وە هەروەها خوای گەورەلەئایەتێكی تردا ئەفەرموێت ﴿ وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾

سوورەتی/ آل عمران/ ١٣٣) واتـە پەلـە بكـەن لەوكارانـەدا كـە دەبنـەهۆی لێخۆش بوونتـان لەلایـەن خـواوە جـا هـەروەها بێگومـان خـوای گـەورە (ئەمری) كردووە بەئادەمیزاد كە هەوڵ بدات كـاری بـاش بكـات بـۆ خـۆش بەختی خۆی و قازانج گەیاندن بە بەرەی ئادەمیزاد خوای تەبارەك و تەعالا بۆیە عەقل و ژیرو هۆش و بیری داوە بە ئینسان كـە (فرسـەت) لـە دەسـت خۆی نەدات وەخت و كاتی بەفیڕۆ نەدات چوونكە ئەو عـومرەی ئەمانەتـەو ئەو نازو نیعمەتەو ئەوساغ و سەلامەتیە بەهـەڵ بزانـێ و ئامـادەبێ چـاكەو پیاوەتی پێبكە .

**( ئاگاداریەكی گرنگ )**

جا بێگومان لەكاتدا كات وەختی ئینسان زۆر گرنگە لەلای خوای گەورە سـوێندی پێئـەخوات و ئەفـەرموێت ﴿ وَٱلۡعَصۡرِ ﴾ واتـە سـوێند بـەكات و ڕۆژگار كە چەندە گرنگو بەنرخە هەر لەبەرئەمەشـە خـوای گـەورە سـوێندی پیێ ئەخوات چوونكە(كات) بۆ مرۆڤـە زیـرەك و وریاكـان مایـەی بـەختیاری وسەرفرازیان بووە وەهەوڵیانتیادا وە بۆ ئازادی و سەربەستی خۆیـان هـیچ پـشوویان تییـادا نـەداوە بـەڵام بـۆ گـەلانی تەمـەڵ و نـەزان بۆتـە مایـەی ژێردەستەیی و بەدبەختیان ئای چۆن چەندان ساڵ دێت وە دەڕوات گەلانی ژێر دەست هەر دەنـاڵێنن ؟ دەسا بـۆ ڕاسـت نابنـەوە لـە (عەسـر) سـوود وەرگـــرن وەك پێغەمبــەر (ﷺ) خۆشەویـــست ســـوودی لیێ ورگـــرت و درەئەنجام گەلەكەی خستە سەرفرازیەوە ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴾ واتـە بەڕاسـتی هەرچـی ئادەمزیـاد هەیـە بەتایبـەت ئەوانـەیان كـە (تـەكلیفیان)

لەسەرە لەزیانێکی گەورە دایە﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ﴾ واتـە جگـە ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە ﴿ وَعَمِلُوا ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتـە : وەکـارو چـاکەکانیان کردووە واتە هەرچی خێرو چاکە بۆ دیـن وووڵاتیـان هـەوڵی بـۆ ئـەدەن و ئەیکـەن ﴿ وَتَوَاصَوْا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: وە وەسـیەتیان بـۆ یـەکتر کـردەوە بەهەق کـە هەمیـشە پابەنـدی حـەق بـن و لەسـەر ڕاسـتی بـن ﴿ وَتَوَاصَوْا بِٱلصَّبْرِ ﴾ سوورەتی/ العصر/ ٣) وە وەسیەتیان بۆ یەکتر کردووە بەسەبرو خۆڕاگرری لەسەر هەق و ئایینی خوا واتە مرۆڤی موسڵمان دەبێ هیچ کـات ماندوو نەبێ و نەپسێ بەرامبەر ئەرکەکانی سەرشانی)

**( تێبینیەکی گرنگ )**

جا هەروەها لەبەر ئەوە کە کـات زۆر گرنگـە چـونکە بێگومـان هـەموو کاروکردەوەیـەکی ئێمـە لـە کاتـدا ڕوودەدەن ژیـانی ئێمـە لەژمارێـەك ڕۆژ پێکهاتووە هـەرڕۆژێك بـڕوات ئـەوا ڕۆژێـك لـە ژیـانی ئێمـە کـەم دەبێتـەوە کەواتە پێویستە بزانین لە ژیانی ڕۆژانەماندا چ کارێك ئەکەین و چ کارێك بۆ ڕۆڵەکانمان دادەنێین (عَن أبي هريرة (رضي الله عنـه) أنّ رَسُـول الله (صـلّى الله عليه وسَلم) قالَ: (بادِروا بالأعْمَالِ سَبْعاً هَلْ تَنْظُرُونَ إلاّ فَقْراً مَنْسياً أوْ غنىً مُطْغِياً أوْ مَرَضاً مُفْسِداً أوْ هَرَماً مُفْنِداً أوْ مَوْتـاً مُجْهِزاً أوْ الـدَّجّالُ فَـشَرُّ غَائب يُنْتَظَرُ أوْ السّاعَة والسَاعَة أدهى وأمرّ) رواه الترمذي[1] وقـال حـديث

(1) بڕوانە/ پەرتوکی (الترغيب والترهيب) من الحديث الشريف/ دانراوی (الحافظ زكي الدين عبدالقوي المنذري) ج٤، لاپەڕە /٢٥٠.

حسن .

له ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت)ئەڵێت بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (لەکاری خێردا پەلە بکەن لەپێش ئەوەی تووشی حەفت شت بن، تا فەقیر نەبوون و خواتان لەبیر نەچۆتەوە، تا زۆر دەوڵەمەند نەبوون و توغیانتان نەکردووە، تا نەخۆش نەکەوتوون و پەکتان نەکەوتووە، تاپیرنەبوون و عەقڵتان نەگۆڕاوە، تا مردن لەناکاونەگەیشتۆتە سەرتان، تا دەجاڵ نەهاتووەو دونیا خراپ نەبووە، تا ڕۆژی قیامەت و حیساب نەهاتووە کە لەهەمووان نارەحەترەو خراپترە، ئینسان دەبێ هەمیشە چاوەڕوانی ئەوانە بکا). جاهەروەها لەهەمان سەرچاوە ئەفەرموێ: (وَعَنْ إبن عبَاس (رَضي الله عنهما) قالَ قَالَ رَسوُل الله (صلّى الله عليه وسلم) لرجُل وَهُوَ يعظهُ (إغْتَنم خَمساً قَبْلَ خَمْسٍ شَبَابَك قبْل هرمِكَ وَصِحَتّكَ قَبْل سَقمِكَ وغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ وفرَاغكَ قَبْلَ شُغْلكَ وحَيَاتَكَ قَبْـل مَوْتـكَ) رواه الحـاكم وقـال صـحيح، علـى شـرطهما) واتە: لەئیبن و عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری پیاوێکی ئەکردو ئەیفەرموو پێنج شت هەن خێرا سوودیان لێ وەربگرە پێش ئەوەی پێنج شتی تریان بەسەر دابێ: ١) گەنجیەتیت پێش پیربوونت، ٢) تەندروستیت پێش نەخۆش کەوتن، ٣) دەوڵەمەندیت پێش هەژار بوونت، ٤) بێ ئیش و دەسەڵات بەتاڵیت پێش ئیشکردنت، ٥) ژیانەکەت پێش مردنت .

**(سەرنجێکی گرنگ)**

جا لەم فەرمودانەی پێشوو بۆمان دەرئەکەوێ کە ئادەمیزاد نابێ تەنانەت بۆماوەی چەند سەعاتێکی کەمیش بێ بەتەمای خۆی بێ نابێ هیچ کەسێ لە ئێمە بڵێ دەی نامرم (تا ئیختیار) ئەبم چوونکە مەرج نییە هەموو کەسێ بگاتە تەمەنی (ئیختیاری) ئینجا بمرێ؟ واتە مردن تەنها بۆ ئیختیاران نییە ئینجا کە (ئەجەل) ومردن هات ناپرسێ ئایە گەنجی یا منالی یا پیری، هەزار ڕەحمەت لە شێخی سەعدی کە لە گوڵستانەکەیدا ئەفەرموێت :

| | |
|---|---|
| هەردەم أز عُمرمی رود نفسی | چون نگه می کُنَمْ نمَاَندَ بسێ |
| ئەی کی پنجا رفت و درخوابی | مەگەر اینْ پنج رۆز دەریابێ |
| خَجَلْ أنْ کَسْ کَه رَفْتُ و کارَ نَساخَتْ | کُوس رِحْلَتْ زَدَ نْدُو بآرَنَساخَتْ |
| خوابِ نوشینی بامدادِ رحیل | بازدارد پیادە راز سبیل |
| هرکە أمد عمارتی نوساخت | رفت و منزل بەدیگری پرداخت |
| وان دگر بخت هم چنین هوسی | وین عمارت بسر نبرد کسی |

هەزار رەحمەتیش لە مامۆستا (سەفوەت) یش بێت کە وەریگێڕاوەتە سەر زوبانی کوردی کە ئەفەرموێت :

| | |
|---|---|
| هەردەم نەفەسێ لە ژین ئەبێ کەم | چی ماوەبەڕاستی سەیر کەم |
| پەنجا لە تەمەن چوو خەو لە چاوی | پێنج ڕۆژەکە ماوە گەر تۆ پیاوی |
| بێکارە ئەوەی ڕێ بوو خەجاڵەت | بار بەستی نەکرد بە تەپڵی ریحلەت |
| نووستنی پێش بەیانی بارکردن | دوا ئەخا پیادەکان لە ڕۆیشتن |

هەرکەسێ هات بینایێ تازەی کرد بۆ ماڵی یەکێکی تر ئەو مرد
ئەگەڕ ئەو یەکەس تیابە هەوەس لە جیهان نەیدی کامەرانی کەس

(ئاگادارییەك)

یەکێ لە حەکیمان ئەفەرموێت پێویستە لەسەر ئادەمیزای (عاقل) واتە ژیر لە چوارسەعات بێ ئاگا نەبێت (سەعاتێك) تیایدا لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە و هاواری لێ بکات ، (سەعاتێك) تیایدا لە خۆی بپرسێتەوە، (سەعاتێك) سەردانی ئەو دۆست و برادەرانەی بکات کە لە کەم و کوڕیەکانی بەڕاستگۆیی ئاگاداری دەکەنەوە وە بەتەواوی لە گەڵینەو (سەعاتێك) خۆی بەچێژو لەزەتە حەلاڵیەکانیەوە خەریك بکات ، کەئەو سەعاتە دەبێتە هۆی یارمەتی دانی سەعاتەکانی تر ئەو سەعاتەی کە بە خواردن و خواردنەوە بەسەری دەبات هەر ئیش کردنەو لە ئیشکردنە چاکەکانە ئەویش یادکردنەوەی خواو بیرکردنەوەیە لە نیعمەتە سەر سوڕهێنەرەکانی خوای پەروەردگار.

جا هەروەها بێگومان حەزرەت (ﷺ) بە یەکێ لە یارانی فەرموو (كُنْ فِي الدّنيا كأنّك غَريبٌ أوْ عابرٌ سبيلٌ) وكانَ إبن عُمَر (رضي الله عنهما) يَقُول إذا امْسَيْتَ فَلا تَنْتَظِر الصَبّاحَ وإذا أصْبَحتَ فَلا تَنْتَظِرُ المَسَاءَ وخُذْ مِنْ صِحَتّكَ لِمَرَضِكَ وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ) رواه البخاري، واتە: لە دونیا وەك نامۆ و غەریب یان وەك ڕێبوار بژی، وە هەروەها (ابن و عومەر) (ڕەزای خوای لێبێت) ئەیفەرموو ئەگەر ئێوارەت بەسەردا هات چاوەڕێی سبیانێ مەکە وە ئەگەر بەیانیت بەسەرداهات چاوەڕێی ئێوارە مەکە یان سوود لە لەش ساغی وەربگرە بۆکاتی نەخۆشیت و لە ژیانت بۆ مردنت .

**(باسێکی گرنگ)**

هەندێ لە زانایان ئەڵێن ڕۆژان پێنج جۆرن (یوم مفقود – یوم مشهود – ویم موردو – ویوم موعود – ویوم ممدود) :

١) یوم یوم مفقود/ واتە دوێنێکە کە لە ژیانت تێپەڕی لەگەڵ ئەو شتانەی کە کردووتە .

٢) یوم مشهود/ واتە ئەمرۆکەیە کە تیایدا دەژیت خوا پەرستی زۆری تیادا ئەنجدام بدە .

٣) یوم مورد / واتە سبەینێ یە کە نازانیت تیادا دەژیت یان نا ؟.

٤) یوم (موعود) واتە ئاخر ڕۆژی ژیانی دونیاتە با هەمیشە لەبەر چاوت بێ .

٥) یوم ممدود/ واتە ڕۆژی ئاخیرەتە / واتە ئەو ڕۆژەیە کە هەمیشەیی یەو تەواو نابێت گرنگی زۆر زۆری پێبدە چوونکە ئەو ڕۆژە یان خۆشی هەمیشەییە یان سزای هەمیشەیی (خوا ڕەحممان پێبکات) ئامین، (قَالَ الحُكَماءَ) (الوَقْتُ كالسَّيْفِ إنْ لَمْ تَقْطَعَهُ قَطَعَك)، واتە: کات وەکوە شمشێر وایە ئەگەر نەیبڕی دەتبڕێ[1].

هەروەها شێخ (حەسەنی بەصری) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەموێت هەموو ڕۆژێك کە خۆر هەڵدێت ئەو ڕۆژە بانگ دەکات ئەی مرۆڤ من ڕۆژێکی نوێم لەسەر کردەوەکانت (شاهیدم) سوودم لێ وەرگرە من ناگەڕێمەوە تا ڕۆژی قیامەت.

---

(1) ئەگەر/ بەو خێرو چاکە کردن نەیبڕێ ئەوا بە شەڕو خراپەکاری دەت بڕێ ، بڕوانە/ (گوڵزاری پیاو چاکان) ، لاپەڕە/ ٧٣.

( ئەی بنی ئادەم غافل مەبەو....؟ )

جا هەروەها بێگومان تەماشای (فیتنە) ی سامان بکەو هەروەها تەماشای فیتنەی (دونیا) بکە جا بێگومان سامان فیتنەیەکی زۆر (سەختە) جابیر لەم لەچەند ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوە/ جا یەکەم بیر بکەوە لە قورئان و لەم ئایەتە پیرۆزە کە چ فەرمانێکمان پێ ئەکات ئینجا خوای گەورە ئەفەرمووێت ﴿ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ ﴾ سوورەتی التغابن: ١٥) واتە بەراستی ماڵ و منداڵەکانتان بەڵانە بۆتان ، پێتان تاقی دەکرێنەوە تا دەرکەوێ کامتان گوێڕایەڵی دەکەن وە کامیشتان یاخی دەبن کەوابوو ( بێدارو هۆشیار ) بن و فریو نەخۆن چوونکە ئەمە تاقی کردنەوەیە بۆتۆ جا ماڵ و منداڵ (فیتنەیە) بەڵێ بەرپرسیاری دەربارەی ئەوان چوونکە ئەوان دەبنە هۆی تاقیکدرنەوەی تۆ جاری واهەیە خوای گەورە (خەیر) دەکاتە (فیتنە) هەروەکو چۆن لە (شەڕ) فیتنە هەیە وەك خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةًۖ ﴾ سوورەتی الأنبياء: ٣٥) واتە تاقیتان دەکەینەوە بە ناخۆشی و خۆشی و هەژاری دەوڵەمەندی لەش ساغی و دەردو نەخۆشی تا سابیرو ناشوکری دەرکەوێ وە ئیللا خوا بۆخۆی دەزانێ و بەمەش دەلیل و بەڵگەیان لەسەر دەهێنێتەوە تاکەس ( عوزر) و بیانوویان نەمێنێ) پێغەمبەریش (ﷺ) لەم بارەیەوە ئەفەرموێت: (وَاللهِ ما الفَقرُ أخشٰى عَلَيكُم ولَكني أخشى أن تَبسْطَ عَلَيكُم الدنيا كَما بسطت عَلى مَن قَبلكم فَتَنافَسَوها كَما تَنافَسُوها وتُهلِكَكُم كَما أهلَكتُم) متفق عليه، واتە سوێند بە خوا هەرگیز من لە هەژاری لێتان ناترسم بەلأم لەوە دەترسم کە نازز (نیعمەتەکانی) دونیاتان بەسەردا

بڕێژرێ هەروەکو چۆن بەسەر ئەوەی پێش ئێوەدا ڕژاو ئێوەش پێشبڕکێی تیادا بکەن و هەروەکو ئەوان کردیان ئەمجا بە (هیلاکەت) بچن و هەروەکو چۆن ئەوان بە (هیلاکەت) چوون.

**( پاشکۆ )**

شاعیریش ئەڵێت :

| | |
|---|---|
| (إذا مَا خَلَوْتَ الدَهرَ يَوماً فَلا تَقُلْ | خَلَوْتُ ولكن قُلْ عَلَيَ رَقيبُ |
| وَلا تَحسَبَنَ اللهَ يَغفلُ ساعَةً | وَلا أنْ ما تُخفي عليهِ يَغيبُ)(1) |

هەزار ڕەحمەت لە مامۆستا نامی کە ئەفەرموێت :

| | |
|---|---|
| **عومری ڕابردووی بێ سوودی ساڵان** | **ماڵی نەختت بوو ڕۆیی بەتاڵان** |
| **قەت زیان نادا تاڵان لە ئینسان** | **وێنە تاڵانی عومری بەتاڵان** |
| **کاتت کاتێکی زێڕین بەهایە** | **بۆ دین و دونیا بیکە بە مایە** |
| **گەنجی و لەش ساغی و فەراغەتی حاڵ** | **هەموو فرسەتن ئەڕۆن بە زایە** |
| **نوح تا هەزار ساڵ ئەزیەتی درا** | **خەلیل پاش ئاگر دوورەوەش خرا** |
| **زەکریا کوژرا یەحیا سەربڕا** | **مُحّمد چەند جار قەصدی کوشتنی کرا** |
| **ئیتر مەپرسە عومەرو عوسمان** | **عەلی و حسێن و باقی ئیمامان** |

---

(1) واتە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان بەتەنها بویتەوە مەڵێ بەتەنهام بەڵکو بڵێ چاودێرێك وا بەسەرمەوەیە هەرگیز وا مەزانە خوا تەنها ساتێك بێ ئاگا دەبێت پاشان شتێکی لێ بشاردرێتەوە، ئەو لێی بێ خەبەرە) بڕوانە: پەرتووکی ( دوایین ڕوداوەکان و کۆتایی جیهان) لەنووسینی محمد حسان لە وەرگێڕانی بەڕێز (عبدالمجید عبدالحمید) لاپەڕە/٢٧٥.

ئەتووش فەردێکی لە نەسڵی ئادەم ئەبێ وەرگری بەشی لەئەلەم

قەزا بەڕاستی کاری خۆی ئەکا لە خاوەن عیلماو لە خاوەن عەلەم(١)

أقول قولى هذا وأستغفر الله لي ولكم ولسائر المسلمين ، نبهني الله وأياكم من نومة الغافلين وحشرني وإيّاكم تحت لواء سيّدِ المُرسَلينَ أللّهم إغفر لنا آمين.

**( لە كۆتاييدا سەرنجێكی گرنگ ئەخەينە بەرچاوی خوێنەران )**

جا هەروەها سوپاس بۆ خوای گەورە خۆم بەختەوەر ئەزانم كە خوای گەورە يارمەتی دام كە هەردوو بەرگی ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان بكەمە يەك (كيتاب) و لە ناو دوو بەرگدا و كۆيی بكەمەوە و بينووسمەوە و بە چاپی بگەينم و چونكە پێشتر بەرگی يەكەمم چاپ كردبوو لە چاپخانەی (الحوادث) لە بەغدا و لە ڕێكەوتی سالآنی ١٩٨٦/٧/١ی زاينی بيست و دوو وەتارم نوسيبوەو بە چاپم گەياندبوو/ ئێستاكەش بە يارمەتی خوای مەزن/ پەنجا و هەشت/٥٨/ وەتاريتكەم نووسی كە (مجموعی) ئەكاتە /٧٠/ وەتاری تەواو بۆ (وەعظ) و ئامۆژگاری بۆ وەتاری هەينی بەلآم ئەوەش لە ياد نەكەين هەندێ وەتارەكان باسەكانيان زۆر درێژن و مانای ئەوە ناگەيەنێت كە (مەرجە) وەتاربێژ بەيەك جار و لە يەك وەتاردا هەمووی بخوێندرێتەوە)

بەڵكو هەندێ باس زۆر درێژە بۆ (سێ وەتار يا چوار) وەتار ئەبێ

---

(١) بروانە پەرتوكی : (بەهارو گوڵزار) لە دانراوەكانی خوالێخۆش بوو (مەلا عبدالكريمی مدرس) لاپەرە ٣١٩.

بخوێندرێتەوە (خطیب) واتە وەتاربێژ خۆی ئەبێ (تصرفاتی) تێدا بکات چونکە وەتاری کورت و پڕ مانا پێغەمبەریش (ﷺ) پەسندی کردووە و هەروەکو پەڵەپەندێکی (عەرەبیش) دا (حوکەمایان) ئاماژەیان بۆ کردووە و ئەفەرموون (خَيْرُ الكَلامِ ما قَلَّ مَا دَلّ) وە داواکاریشم لە تۆی خوێنەری بەڕێز لە دوعای خێر و باشە بێبەشمان نەکەیت و (والسَلامُ علَيْكُمْ وَرَحَمةُ اللهِ وبَرَكاتُهُ —واللهُ مِنْ وَراءِ القَصد—وهُوَ حَسبي ونِعمَ الوكِيل).

# ئامۆژگاری حەفتا

## باسی ڕەحم و بەزەیی و لوتفی خوای میهرەبان ئەکات

الحَمْدُ لله ثُمّ الحَمْدُ لله مَا تَوفيقي ولا إعتصاميةَ إلاّ بالله عَلَيْه تَوكّلتُ واليه أُنيبْ الحَمْدُ لله الذّي رَحْمَتُهُ وَسِعَتْ كُلّ شَيءٍ وأشْهَدُ أنْ لاَ إلـهَ إلاّ الله القَائـل ﴿ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴾ سـوورەتی/ الحجـر/ ٥٦) وأشْهَدُ أنّ مُحَمَداً عَبْدُهُ ورَسُولَهُ القَائلُ الرَحمونَ يَـرْحَمُهُم الـرّحْمَنْ، والـصّلاةُ والسَلامُ عليْهِ وعلَى آلهِ وأصْحَابهِ وأتْبَاعه وأُمتّهِ وَمَنْ تَبعَهُم بإحْسانْ إلى يَوم الدّين/ أمّا بَعْد فيَا عِبّادَ الله أوْصيكُمْ بتّقْوا الله وطَاعَتهِ ولُزُومِ أوامِرهِ)، واتـه: لەپاش هەندێ ئـەی بەنـدەکانی خـوا وەسـیەتان ئەکـەم بەتـەقوای خـوای گەورەوەو بەپەیڕەوکردنی فەرمانەکانی جا هەروەها لـەووتار و ئامۆژگـاری ئەوڕۆکەمانـدا باسـی داواکردنـی (ڕەحمـەتی) خـواو فراوانـی (ڕەحمـەتی) خواتان بۆ دەکەم چونکە بەڕاستی قورئانی پیرۆز خەڵکی هانداوە و بـانگی کردوون بۆ ئەوەی هەمیشە بە کەرەم و لوتف و مەرحەمەتی خـوا دڵخـۆش بن هەروەك خوای گەورە لە قورئانـدا ئەفـەرموێت: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ سـوورەتی/ یـونس/ ٥٨) واتـەتۆ بڵێ بە خەڵك ئەی پێغەمبەر ئەگەر بەکەرەم و (ڕەحمەتی) خوا دڵ خـۆش بن بۆئەوان باشترەو قازانجی زۆرترە لەوەی کە بەماڵی دونیا دڵخـۆش بـن، جا هەروەها زانایانی (تەفسیر) ئەفەرمون لە بن تیشکی ئەم ئایەتە پیرۆزە دا کردوویەتی سێبوری شیفای نەخۆشی دڵی هەزاران ئادەمیزادی بێ بەش لە ژیان و سەروت و سامانی ئەو دونیا فانیەی پێوەیە بەو ئومێدە چارەی

دەردی نەبوونی و هەژاری خۆیان دەکەن بە ڕزق و ڕۆزی و بەشی خۆیان ڕازی دەبن چوونکە کەسێك ئومێدی بە کەرەمی خوابوو چاوی لە رەحمی خوا بوو ئیمانی وا بوو کە (ڕەحمی) خوا لە ماڵ و سەروەت و سامانی دونیا باشترە تازە تەماشای لەخۆی بەرەوژوورتر ناکا و نەخۆشی (حەسادەتی) لە دڵدا نامێنێ ئینجا کە ئێمە خۆمان بە موسڵمان وئیماندار ئەزانین نابێ لە لوتف و کەرەم و ڕەحمی خوا نائومێد بین، جا هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (الزمردا) ئەفەرموێت : ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾، واتە ئەی مُحَمَّد (صلی الله علیە وسلم) لە منەوە بڵێ ئەی بەندەکانی من ئەی ئەوانەی ستەم و زیادەڕۆییتان لە خۆتان کردووە ئەوجا ئەفەرموێت ﴿لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾واتە : دەست لە ڕەحمەت و میهرەبانی خودا مەشۆن و نائومێد نەبن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ سوورەتی/ الزمر/ ٥٣) واتە : بێگومان خودا لە هەموو گوناهێك خۆش ئەبێت ئەگەر گەڕانەوەو/ تەوبەو پەشیمانی/ بەدوا دابێت ، چوونکە بەڕاستی هەر ئەو خودایەکی زۆر لێخۆشبوو ئێجگار خاوەن بەزەییە[1]

(١) ئیبن و عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێت هەندێ لەموشریك و هاوبەش دانەرەکان خەڵکێکی زۆریان کوشتبوو ، وەهەروەها زیناشیان کردبوو ، پاشان هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان ئەو قسەو باسە کە تۆ دەیڵێی شتێکی زۆر چاکە ئەی خۆزگە کە خاوەنی گوناحەکانمان بزانیبا ئینجا خوا ئەوئایەتەی دابەزاندو فەرمووی ئەگەر بگەڕێنەوەو تەوبەی بکەن خوا (عەفوتان) دەکات.

**( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )**

١) وكان أبو جعفر محمد بن علي (رحمة الله عليهم) يقول أنتم أهل العراق تقولون أرجى آية في كتاب اللهُ عزّوجلّ قولُه تعالى: ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾سوورەتی/ الزمر/ ٥٣) ونَحْن أهْلُ البَيت نَقُولُ أرجى آية في كتاب الله قوله تعالى ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾ سوورەتی/ الضحی/ ٥) إذا فَلاَ يَرْضَى مُحَمّد (صلّى الله عليه وسلم) وأحدٌ من أُمته في النار[1]، واتە: (محمدی) کوڕی جەعفەری کوڕی عەلی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەی فەرموو ئێوە ئەی (ئەهلی عێراق) ئەڵێن ڕەجاترین ئایەت کەدڵ ئیسنانی پێ خۆش ببێ لە قورئاندا ئەو ئایەتەیە کە نوسراوە و ڕاڤەو تەفسیر کراوە لە پێشەوە تێ پەڕەی، بەڵام ئێمە کە (ئەهل) و بەیتین و خزم و کەس وکاری پێغەمبەرین (ﷺ) ئەڵێین بەڕاستی جێگەی ڕەجا لە قورئاندا ئەو ئایەتەیە کە خوا ئەفەرموێ ﴿ وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ ﴾ واتە لەمەودوا واتە لە ڕۆژی قیامەتدا خوا دەرەجەو پلەوپایەی (شەفاعەتت) دەداتێ و ڕازیت ئەکا وە دیارە ڕەحمی خواو (ڕەحمی) پێغەمبەر (ﷺ) وای پێئەوێ کە (شەفاعەتی) تەواو بۆ ئوممەتەکەی خۆی بکات.

٢) لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ڕیوایەت کراوە کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپەروەردگاریەوە لە (حەدیسی قودسی)

---

(1) بڕوانە (تفسير البغوي ، المُسَمّى معَالم التنزيل) دانراوی (الحسين بن مسعود الفراء البغوي الشافعي) بەرگی/ ٤ /لاپەڕە/ ٤٦٦.

دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت ﴿ أُذْنِبَ عَبدٌ ذَنْباً ﴾ واتە بەندەیەك تاوانێكی لە تاوانەكان ئەنجام دا من و تۆ ئەو بەندە تاوانبارەین ، داوا لە خوا دەكەم كە لەهەموومان خۆش ببێت بۆ ئەوەی ئێمەش بگەڕێنینەوە بۆلای خۆی (فقَالَ اللّهُمَ إغْفِر لي ذنْبِي) واتە جا فەرمووی ئەی خوایە لە تاوانەكانم خۆش ببە)، ئەگینا كەسێك تاوانبارو ڕووڕەش و ڕیسوا بێ بۆكێ بڕوات ئیلا بۆ لای خوای بەخشندەو میهرەبان نەبێت وەكو ئەم خواناسە ئەڵێت:

یاربٌ إنْ عَظُمْتَ ذنوبي كَثْرة فَلَقَدْ عَلَمْتُ بأنّ عفْوكَ أعْظَمُ

إنْ كانَ لاَ يَرْجُوكَ إلاّ مُحْسِنُ فَمَنْ ذَا الذّي يَرْجُوا وَيَدْعُوا الآثم

واتە: پەروەردگارا ئەگەر تاوانەكانم زۆرو گەورەبوون ئەوا من باشی دەزانم كەوا لێبوردنی تۆ گەلێك گەورەترە ئەگەر تەنها چاكە كەران تكات لێ بكەن و داوات لێ بكەن ئەی كەسی تاوانبارو گوناهبار بۆ كێ بڕوات؟ ئایە كەسی تاوانبار بۆ كێ دەڕوات جگە بۆلای خوای بەخشندەومیهرەبان نەبێت ؟ كەسی هەژار بۆلا دەوڵەمەند نەبێ بۆكێ دەڕوات؟ كەسی زەلیل بۆلای خوای بە (عیزەت) نەبێت بۆكێ بڕوات ؟ ئایە هەڵاتنی بۆكێ یە؟ بۆ كوێ دەڕۆن؟ هیچ پەناگەیەك و ڕزگاریەك نییەو لە خوا ئیلا بۆلای خوا نەبێت چوونكە هەموو زەوی ئەوە وە هەموو موڵكەكان (موڵكی) ئەون جا بەڕاستی بەرزو پیرۆزی هەمووی بۆ ئەوە).

٣) ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أذْنبَ عَبْدي ذَنْباً فَقَالَ اللّهُمَ إغْفِر ليّ ذنْبَي فَقَالَ تَبّاركَ وتَعالى أذْنبَ عَبْدي ذنْباً فَعلِمَ أنّه لَهُ رَباً يَغفرُ الذّنبَ وَ يَأخُذَ بالذّنْب ثُمّ عَادَ فَأذنب) واتە: بەندەیەك تاوانێكی لە تاوانەكان ئەنجامدا جا فەرمووی ئەی خودایە لە

تاوانەکانم خۆش ببە ... خوای گەورە دەفەرموێت بەندەکەم تاوانێك لە تاوانەکانی ئەنجامداو جا فەرمووی ئەی خودایە لە تاوانەکەم خۆش بە .. خوای گەورە دەفەرموێت بەندەکەم تاوانێك لە تاوانەکانی ئەنجامدا پاشان زانی کەوا خوایەکی هەیە لە تاوانەکانی خۆش ببێت بەهۆی تاوانەوە ئەی بات بۆ دۆزەخ ئەگەرتۆبە نەکات بەڵام ئەمجارە گەڕایەوەو تەوبەی کرد ، پەروەردگار/ هەر پەوەردگارەو بەندەش هەر بەندەیە (فَقَال أي رَبِّي إغفِر لي ذَنْبي) واتە ووتی ئەی خودایە لە تاوانەکانم خۆش بە بۆ جاری دووەم بەڵێ ... بۆ جاری دووەم و جاری سێ یەم تاکو بەڕاستی بگەڕێتەوە بۆلای خوا وە پەشیمان ببێتەوە جا هەروەهابەردەوام لەم جێگایەدا نامێنێتەوە کە تاوانەکەی لێ ئەنجام داوە[1] ، ئەوجا خوای گەورە ئەفەرموێت ئەی (عەبدە) هەرکارێك دەکەیت بیکە چوونکە من لەتۆ خۆش بوومەو) مەبەست لەم فەرموودە(قدسیە)دا ڕەحم و بەزەیی خوا هێندە زۆرە بەرامبەر بەندەی خۆی لە (حیساب) نایەت.

٤) دیسان ئیمامی بوخاری و موسلیم لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ڕیوایەتیان کردووە/ کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (جَعَلَ اللهُ الرَّحْمة مَائَة جُزْءٍ فَأمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةَ وتِسْعِينَ جُزْءاً أوْ أنْزَلَ فِي الأرْضِ جُزْءاً وَاحِداً فَمَنْ ذلكَ الجُزء تَتَرَاحِمَ الخَلائق حتّى تَرْفَعُ الدّابَةُ حَافِرَهَا عَنْ ولدها خَشْيةَ أنْ تُصيبُه) رواه الشيخان، واتە: خوای گەورە بەخشندەیی کردۆتە سەد بەش وە (٩٩) بەشی لایخۆی هێشتۆتەوەتەنها یەکبەشی دابەزاندۆتە

(١) بڕوانە /پەرتووکی (دواین ڕووداوەکان و کۆتایی جیهان) لە وەرگێڕانی (عبدالمجید عبدالحمید) لەگەڵ دەست کاری /لاپەڕە/ ٢٦٢.

سەر زەوی جا تەنها لەو بەشەیە هەموو دروسست کراوەکان لەنێو خۆیاندا بە بەزەیین تەنانەت ئەو وولآخەی کە (سمی) بەرز ئەکاتەوەلە ترسی ئەوەی بەر بێچوەکەی نەکەوێت.

## (چەند ئاگاداریەکی گرنگ)

(یەکەم) جا بێگومان خوای گەورە تەنها یەك بەش لەو ڕەحمەتە مەزنەی داگرتووە بۆ سەر زەوی هەر لەو تەنها بەشەیە ڕەحمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەحمەتی دایك بەرامبەر منداڵەکەی ڕەحمەتی باوك بەرامبەر بە منداڵەکەی ڕەحمەتی پزیشك بەرامبەر بە نەخۆشەکەی وە دەوڵمەند بەرامبەر بە هەژاران ڕەحمەتی بەهێز بەرامبەر بە لاواز و بێ هێزەکان هەمووی لە شێوەو شێوازی ڕەحمەتە ناسك جوانەیە کە لەم بونەوەرەدا دەیبینی ئەمە تەنها بەشێکە لەسەد بەش لە (ڕەحمەتی) خوای بەخشندەو میهرەبان ئەوجا خاوەنی (کتێب) واتە پەرتووك: سوێند بە خوای گەورە دەخوات و کە هەرکەسێ خودای ناسی و ڕەحمەتەکەی ناسی ئەوا هەرگیز بێ ئومێدو بێ هیوا نابێت ، هەچەندە تاوانی گەورەی ئەنجام دابێت هەرچەندە سەرپێچی ئەنجام دابێت بەلاَم ئەوەی ڕاستی بێت دەبێت لەگەڵ خوای خۆی ڕاست بێت و پێچ و پەنای نەبێت واز لە هەموو خراپیەك بهێنێ و (تەوبەیەکی نەصوح) بکات هەروەها پەیمان بداتە خوای گەورە لەئیشی باش زیاتر هیچی تر نەکات ئەوا بێگومان خوای گەورە خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبەکەو گەڕانەوەکەی لەکاتێکدا خۆی دەوڵەمەندەو هەروەها پێویستی بە هیچ کەسێك نییە لەجیهاندا).

(دووەم) عَنْ عمُر بنْ الخطّاب (رَضّي اللهُ عَنْهُ) قَدَمَ عَلى رَسُول الله (صلّى الله عليه وسلم) بسبي فإذا إمرأةٍ منَ السبي تَبْتَغي إذا وَجْدَتْ صَبيَاً في السّبي أخذَتَهُ فألصقته ببَطْنِها وأرْضَعَتْهُ) واتە: لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕیوایەت) کراوە کەوا فەرموویەتی هەندێ دیلیان هێنا بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو دیلەکاندا ئافرەتێك هەبوو هەوڵی دەدا تاکو منداڵێکی لەنێو دیلەکاندا دۆزییەوە ئینجا توند نوساندی بەسینگی خۆیەوە لەبەر خۆشەویستی و هەم شیریشی پێدا ئەگەر منداڵێك لە دایکەکەی بزر بێت ئەوا عەقڵەکەی لەگەڵ منداڵەکەوە بزر دەبێت بەتەواوی عەقڵی وون دەبێت و ڕاستی لەدەست دەدات (خولاصەی وتە) پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوئافرەتە دەبینێ منداڵەکەی خستۆتە سەر سینگی وشیری پێ دەدات بۆیە پرسیار لە هاوەڵان دەکات و دەڵێت: (أتَرَوْنَ هذه المَرْأةَ طَارِحَةَ وَلَدِها في النّار؟ قَالُوا لاَ والله وهِيَ تَقْدِرُ عَلى أنْ لاَتَطْرَحُهُ فَقَال رَسُول الله (صلّى الله عليه وسلم) الله أرحَمُ بِعبّاده مِن هَذِهِ بِوَلَدِهَا) متفق عليه/ واتە ئایە وا دەبینن کەوا ئەو ئافرەتە منداڵەکەی خۆی فڕێبداتە ناو ئەو ئاگرەوە؟ فەرمویان نەخێر سوێند بە خوا لە کاتێکدا ئەو دەتوانێ فڕێی نەداتە ناو ئاگرەکەوە جا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی باش بزانن کەوا خوای گەورە زۆر بە بەزەیی ترە لەبەرامبەر بە بەندەکانی لە و ئافرەتە بەرامبەر بە منداڵەکەی).

جا بێگومان یەکێ لە ئەولیاو پیاوچاکان/ دەڵێت خودایە گیان تۆ باش دەزانیت کە دایکم لەهەموو خەڵکی زیاتر میهرەبانترە لە بەرامبەرم، منیش باش دەزانم تۆ لە دایکم میهرەبان تری لە بەرامبەر بە من .دایکم ڕازی

نابێت بەمن سزاو لەناو چوونم ئایە تۆ پێی ڕازی دەبیت لە کاتێکدا تۆ (أرْحَمُ الرّاحمينْ)ی؟)).

(سێ هەم) جا هەروەها ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێت) کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لَنْ يَدْخُلُ أحَدٌ منْكُمْ عَمَلَهُ الجَنّةَ، قَالُوا ولاَ أنْتَ يَا رَسُول الله؟ قَالَ ولاَ انَا إلاّ أنْ يَتَغَمدني اللهُ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ) رواه الشيخان، واتە هیچ کەسێك کردەوەکانی خۆی نایباتە بەهەشت ووتیان تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی تەنانەت منیش مەگەر خوا بە میهەربانی و فەزڵ و کەرەمی خۆی بمپۆشێت) جا ئێمە کار دەکەین فەرمانەکانی خوای خۆمان جێ بەجێ بکەین واز لە قەدەغەکراوەکانی دەهێنین لە سەر سنوورەکانی ڕادەوەستین و نایبەزێنین شوێنی خۆشەویستی خوا دەکەوین (ﷺ) خۆشەویستی ڕاستی ئەوەیە کە شوێنی خۆشەویستەکەت بکەویت چوونکە خوای گەورە ئەفەرمووێت:

﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ سوورەتی/ آل عمران/ ٣١) واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ ئەتانەوێ لێی نزیك ببنەوە دەبێ پەیڕەوی لە (شەریعەت) و بەرنامەکەی من بکەن ئەوا خواش ئێوەی خۆش دەوێ وە لە هەموو گوناهێکیشتان خۆش دەبێت چوونکە ئەو خوایە زۆر چاوپۆشیکارو زۆریش دلۆڤان و خاوەن بەزەیی و میهرەبانە).

(چوارەم) مامۆستا (مەلا محمدی شەلماشی) لە کۆڕی

ئامۆژگاریەکەیدا[1] ئەفەرموێت :

ئەوە بزانن کە (ڕەحمی) خوا ئەوەندە زۆرە کە مێروولەی وورد لە بن ئەرزدا کرم لەناو داری ڕەقدا ماسی لە قولآیی گۆمی شیندا منداڵ لەسکی دایکدا (کافر) و موسڵمان و (تەیرو تـوار) هەر هەموو گیان لەبەرێك لە (ڕەحمی) خوا بێ بەش نین بەلآم زۆر لەگەڵ ئەو هەموو نازو نیعمەتەو (ڕەحم) و شەفەقەتەشدا هێندێکیان لە دین لایان داوە و لادەدەن، ئەوە لە دونیادا (ڕەحمی) خوا بۆ هەموو کەسە بەلآم لە دوارۆژدا وەك دونیا نییە هەروەکو لە سورەی/ ئەعرافدا/ دەفەرموێ: ﴿ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَالَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴾ سوورەتی/ الأعراف/ ١٥٦) واتە: لەدوارۆژدا ڕەحمەتی مـن بـۆ ئەو کەسانەیە کە لە دونیادا خواپەرسیتان کردووە (زەکاتیان) داوە ئیمنانیان بەئایەتی قورئانی خوا بووە)هەروەها بۆ نموونە دەگێڕنەوە کەیەکێك لە گوناهباران لەلای دراوسێ و دەرو جیرانان زۆر خراپوئازاوەچی بوو هەتا دزی ئەکرد خەڵکەکە زۆر ڕق وقینیان لێی بوو، ئینجا ئەو پیاوە لە کاتی سەرەمەرگدا لە کردەوەی خۆی پەشیمان بۆوە ((وقَالَ لأُمِّهِ إجْعَلي قَبري فِي بَيْتِي لـئَلا أوْذي الأمْـوات كَمَا أذيْتُ الأحْيَاء)) زۆر بە غەمگینی یەوە گریاو بەدایکی ووت ئەی دایکی خۆشەویست و شیرینم توخوا وەسیەت بێ ئەگەر مردم چەند کەسێك بانگ بکەو بمشۆن و (کفنم) بکەن و هەر لە ژوورەکەی خۆمدا بمنێژن با هەروەکو لە دونیادا دڵی خەڵکم ناڕەحەت کردووە دڵی ئەوانەی لەگۆڕن

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (کۆڕی ئامۆژگاری) نووسینی مەلا (محمد ئیمام و خەتیبی مزگەوتی مەولانا خالید) لەگەڵ دەست کاری، لاپەڕە ١٤٣.

نارەحەت نەکەم دایکی وەسیەتەکەی بەجێهێناو شەوێ دایکەکەی لەخەودا چاوی پێکەوت کە کوڕەکەی لەناو باغ و گوڵزارێکی زۆر خۆش و دڵگیردا پیاسە دەکات لەناو چاوانی نووسراوە ((هَذا عَبْدٌ إعْتَرَفَ بِذنْبِه فَذَل فعَظَم عِنْدَ الله)) واتە: ئەوە بەندەیەکە لە (گوناحی) خۆی پەشیمان بۆتەوە خۆی بە گوناهبارو زەلیل داناوە بەڵام لای خوا بەهۆی تۆبە کردنیەوەو پەشیمان بوونیەوەو (ئیعترافی) بە گوناحی خۆی کردو ئینجا مەرتەبەی بەرز بوەو بۆ چونکە خوا عەفووی کردووە، ئەوجا دایکەکەی لە خەوەکەیدا گووتی ئەی کوڕی من بەهۆی چیەوە بەو ڕوتبەو (مەقامە) گەیشتی؟/ گووتی خوای تەعالا لە خزمەت خۆی ڕای گرتم و فەرمووی ئەی عەبدو بەندەی من یا خەڵك تۆیان بەدەر دەخست دووریان لەتۆ کردووە دەروازەو قاپی منیان لەسەر داخستی لایان وابوو کەڕەحمەتی من ئەوەندە کەمە بەشی خراپەی تۆ ناکات یان پێیان وایە خەزنەی موڵکی من (موحتاجی) چاکەو حەسەناتی تۆیە فەرمووی (قەسەم بەعیزەت) و گەورەیی خۆم ئەوا لەبەر فەقیری وحورمەتی تۆ لەتۆش و لەناوەش خۆش بووم کە لەناشتنی تۆدا ماندووبوون و جەنازەکەتیان هەڵگرتووە هەروەکو شاعیرێك لەم بارەیەوە بەفارسی ئەڵێت :

گەر جَانبِ حَقْ نگاه داری حَقْ نِیزْ تَرَا نگاه دآرَد

واتە ئەگەر تۆ ئاگاداری (حەق) و مافی خوا بکەی بەڕاستی خواش ئاگای لەتۆیە وە لەتەنگاوە بەهانات دێ، جابێگومان بەڕاستی (لطف) و کەرەم و ڕەحم و (شەفەقەتی) خواوەندی گەورە بۆ بەندەکانی ئەوەندە زۆرە لە (حیساب) نایەت تۆ بزانە ئەگەر بەندە گوناهێك بکات ئەوەشەرم

دەکاتەوە کە ئەو گوناهەی (ئەنجام داوە) هەروەکو شێخی (سەعدی) لە گوڵستاندا ئەفەرموێت :

کَرَمْ بین و لطفِ خداوندگار          گُنه بَنْدَه کردەست و اُوُشَرْمسار

بە کوردی :

تەماشاکە لەم لوتفە چۆن رەحم ئەکا          گوناه بەندە ئەیکات و ئەو شەرم ئەکا[1].

( پاشکۆی ئەم باسە )

موسڵمانینە هەرچەندە کەرەم و ڕەحم و (شەفەقەتی) خوای گەورە هێندە زۆرە لەئەندازە نایێ بەلأم نابێ ئینسان لە (غەزەبی) خواش ئەمین بێ و نەترسێ دەبێ لەبەینی (خەوف و ڕەجادا) بێ چوونکە نیشانەی ئیمان و موسڵمانیەتی و پیاوچاکی ئەوەیە کردەوەت باش بێ و نیەتت چاك بێ و زەرەرت بۆ موسڵمانان نەبێ و ئومێدت بە ڕەحمی خوا هەبێ تۆوی چاکە بچێنی و لە خراپە دوورکەویەوە، هەروەکو شاعیرێك بەفارسی ئەڵێت :

بدی مَکُنْ کە دُراین کشت زار روز زوالْ          بداس دَهر همان بُدروی کەمکاری

واتە: خراپە بەدی مەکە چوونکەلە کێڵگەی عەمەلدا ئەوە دەدوریەوە کە دەیچینی وە چاندوتە چاکە چاکەی لە دوایەو خراپە خراپە، مەگەر کەسێك تۆبە بکاو خوا (عەفوی) بکا ئەوجا هەروەها مەردی خودابن وچاکە بکەن و لەخراپە خۆتان بپارێزن ولە (ڕەحمەتی) خوا نائومێد مەبن.

---

(1) بڕوانە (گوڵستانی سەعدی) وەرگێڕانی بە کوردی لەلایەن خوالێخۆش بوو مامۆستا سەفوەتەوە، لاپەڕە/ ٢٠.

(پێنجەم) وأخرج الشيخان: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) (لمّا قَضَى اللهُ الخَلْقَ كَتَبَ كِتَاباً فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ عَرشِهِ إنَّ رَحْمَتي سَبَقَتْ غَضَبي)، واتە: (بوخاری و موسلیم) هێناویانە کەوا لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) فەمویەتی لەکاتێکدا کەخوا خەڵکی تەواو درووست کرد (کتێبێکی نووسی) لەخزمەت خۆی دانا لەژوور عەرشەوە وەکو (رەحمەتی) مـن وەپـێش ڕقـی من کەوتووە).

(رُويَ النسائي/ عَنْ عَامِر الرّامِ/ قَالَ بَيْنَما نَحْنُ عِنْدَ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) إذْ أَقْبَلَ رَجُلٌ عَلَيْهِ كَساءٌ وفي يَدِهِ شَيءٌ قَدْ التّف عليْهِ، فَقَال يَا رَسُول الله مَرَرْتُ بِغَيْضَةِ شَجرٍ فَسَمِعْتُ فِيهَا أَصْوَاتَ فَراخِ طَائِر فَأَخَذتهُنَ فَوَضعْتُهنَّ في كسائي فجاءت أُمهُن فأسْتَدَارَتْ عَلَى رَأسِي فَكَشَفْتُ لَهَا عَنْهَنّ فَوَقَعْتُ عَلَيْهُنّ فَلَفَفْتُهُنّ بِكَسَائِي فَهُنّ أَوْلاءِ مَعِي) واتـە: نسائی/ ریوایـەتی کـردووە/ لـە عـامیری رامـی دا و/ ئـەڵێ جارێك پیاوێك هـات بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ) شـتێکی لەدەسـت دابـوو پێـچابویەوە ئینجـا گـووتی یـا (رسُـولَ الله) واتـە ئـەی هـەنێردراوی خـوا ڕابـردوم بـەلای درەختێـك گـوێم لەدەنگی جووجکە باڵندەیـەك بـوو لای درەختەکـە ئـەی جروکانـدو ئینجـا منیش گرتم و جا دایکەکەیان هات بۆلام هەرچەندە بەربەرەکانێم کـرد هـەر لە دەورم ئەسوڕایەوە (هـاوار هـاوار جووکـە جـووك) ئینجا ئەویشم گـرت ئینجا پێچامنەوە ئەوانە هەون کە لەگەڵ منن (وَقَالَ ضَعْهُن فَوَضَعهُنَ وأبتْ أمُهُنّ إلاّ لزُومَهُنَ فَقالَ رَسُولَ الله (صلى الله عليـه وسـلم) أتَعْجَبُـونَ لـرحمِ أُمّ الفراخِ فِرَاخِها؟ فَوالذّي بَعَثني بِالحَق للهِ أرْحَمُ بعبَادهِ منّ أمّ الفـرَاخ بِفرَاخِهَـا فَأَرْجَع بِهُنّ حَتّى تَضَعَهُنّ من حيْثُ أخذتهنَ وأمهـن مَـنَعُهُنّ فَرجَـعَ بهُـن وفِي

روَايَة (مَـنْ لاَ يَـرْحَمْ لاَ يَرْحَمُـهُ الله) واتـه: فـەرمووی دایـان بنـێ جێگاکـەی خۆیـان – مەبەسـت هێلانەکـەی خۆیـان ئینجـا دام نـان دایکەکـەیان لـە جووجکەکـەیان جیـا نەئـەبۆوە، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی (عـەجائیبم ئەمێنێ لە (ڕەحمی) دایکی ئەم بێـچوانە بـۆ بێـچوەکانی خـۆی) ؟ سـوێند بەو کەسەی کە منـی کـردووە بـە پێغەمبـەر (ﷺ) خـوا بـە (ڕەحـم) تـرە دەرحەق بە بەندەی خۆی، دوایی فەرمووی بیان بەوە بۆ ئەو جێگایەی کە لەوێوە هێناوتن منیش بردمنەوە ئـەو جێگایـە، وە لـە (ڕیوایـەتێکی) تـردا فەرمووی (کەسێ ڕەحم و بەزەیی نەبێ خواش ڕەحم و بەزەیی پێ ناکا .

شەشەم) عَنْ أَنَسْ (رضـي الله عنـه) قـاَلَ سَمِعْتُ رَسُـول الله (صـلى الله عليه وسلم) يقول: (قَالَ الله تَعالى يَا إبْنَ آدَمْ[1] إنَّكَ مَا دَعَوْتَني ورَجَوْتني إلاّ غَفَرْتُ لَك علَى مَا كَانَ مِنْكَ ولا أُبَالي) واتـە: ئەنـەس (خـوا لێـی ڕازی بێـت) ئەڵێ گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ) ئەیفەرموو خوای گەورە لە (حەدیسێکی قودسیدا)ئەفەرموێ ئەی نەتەوەی ئادەمیزاد: ئەتۆ هەرکایتك داوام لێبکەی لە گوناهت خۆش بم تکـات لێکـردم داوایەکـەت لێ وەربگـرم چـوونکە ئـەت زانـی مـن خوایـەکی بـەڕەحم و بەدەسـەڵاتم منـیش لێـت خـۆش ئـەبم و گوناهەکانت دائەپۆشم و سزات نادەم هەرچەند گوناهیشت گـەورەو زۆربـن چوونکە من گوێ نادەمە گەورەیی و زۆری گوناهەکانت .

---

(1) حەزرەتی ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) باوکی هەموو ئینسانێکە و دایکە (حەوا) دایکی هەموویانە لەبەر ئەوەیە کە بە ئێمە دەوترێت (ئادەمیزاد)، قورئان ئەفەرموێت (باوکە ئادەمی لە قوڕ درووست کردووە ئینجا گیانی هێناوەتەبەر ، وە دایکە حەواش لە پەراسوی باوکە ئادەمی درووست کرد .هتد...).

(يَا إبْنَ آدَمْ لَوْ بَلَغْتَ ذُنُوبَكَ عَنَانَ السَمّاء ثُمّ إسْتَغْفَرْتَني غَفَرْتُ لَكَ يَا إبْـنَ آدَمْ لَوْ أتَيْتَني بِقُرَابِ الأرْضِ خطَايا ثُـمّ لَقَيْـتَني لاَ تُـشْرِكُ بـيّ شَـيْئاً لأتَيْتُـكَ بُقرابِهَا مَغْفِرةً) رواهُ الترمذي وَقَال حَدِيثٌ صَحِيح، واته: ئەی نـەوەی ئـادەم تاوان و گوناهت هێندە زۆر بێ بگاتە هـەوری ئاسمـان ئینجـا تۆبـەت كـردو تكات لێكردم لێت خۆش بم منیش لێت خۆش ئەبم هەرچـەندە گوناهیـشت زۆربێ ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر تۆ مـردی و هاتیـە لای مـن پـڕ بـە زەمـین گوناهت لەگەڵ خۆت هێناو دوایی كە گەیشتیە لای من و دەركەوت كە منت بە خوایەكی (تاك و تەنها) دانابوو هاوبشەت بۆ دانەنابووم (لـە خوایـەتی و لە پەرستنا) منیش پڕ بە زەوی لێخۆشبوونت بۆ دێنم وە لە ئـاگری دۆزەخ ڕزگارت ئەكەم .

(سەرنجێك)

رشەحمەتی خوا لەم شاعیرە كە ئەفەرمووێت :

إلهي لاَ تُعذبني فإني مُقرٌ بالذي قَدْ كانَ مني

فَكَم من ذلَةٍ لي فِي البرايا وَأنتَ عَليَ ذُو فَضْل وَمني

يظنُ الناس بي خيراً وإني لَشرُ الناس إن لَم تعفُ عَني

واته/ ئەی خودایە سزام مـەدە / چـوونكە مـن دان بـە هەڵـەكانی خـۆم دادەنێم / چەندەها جار هەڵەم دەكرد تۆ خاوەن فەزڵ و منـەتی بەسـەرمە چوونكە تۆ (پـەروەردگاری) منـی هـەروەها خـەڵكی گومـانی باشـی بـەمن دەبەن وە ئەڵێن ئینسانێكی باشەو گومانی چاكەم پێ ئەبـەن / بـەلاّم مـن خراپترین كەسم ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبی و كێ هەیە لێم ببـورێ و عـەفوم بكات...)

**( تێبینی )**

هەندێ لەزانایان ئەڵێن ئەم فەرموودەیە گەلێ ئیستنباطی لێ وەرئەگیرێ و هەروەها لەبارەی فـەزڵی (تەوحیـدە) واتـە بـەمانای تـەنها خواپەرستی دێت، هەوەرها لەبارەی فەزڵی ڕەحم و بەزەیی خوداش دێت کـە بەرامبـەر بەندەکانی چەندە (بەڕەحم) و میهرەبان و دلۆڤانە/ ئیمامی (عەلی خوا لێی ڕازی بێت) فەرموودەیەکی زۆر بە نرخی هەیە لەم بارەیەوە، دەفـەرموێت: (الفَقيه كُل الفقيه مَنْ لَمْ يقْنُط النّاسَ مِن رَحْمَة اللهِ ولَمْ يجرُهم على معصية اللهِ بالرِّجـاءِ)[1]، واتـە: بەڕاسـتی کەسـی زانـا ئـەو کەسـەیە/ کـە کـەس لەڕەحمـەتی خـوا بێئومێـد نـەکات ، وە (جورئـەتیش) بـە کـەس نـەدات لەسەرپێچی کردنی خوا بەوەی ڕەجایان لاواز بکات و باسی ترسی خوایـان بۆ بکات.

**( پاشکۆی هەموو باسەکان )**

جا بێگومان (فەخری عالەم) (درودی خوای لەسـەر بێـت) ئەفـەرموێت: (الدّنْيَا مَلْعُونةٌ مَلْعُونٌ ما فيها إلاّ ذَكَرَ اللهُ وَمَا والاهُ أوْ عَالِمـاً أوْ مُتَعَلِّمَـاً) رواه إبن ماجة والترمذي بسند صحيح، واتە: دونیـا نـەفرینی لێکراوە لەوەیـشی تێیدایە تەنها ئەوانە نەبن کە یادی خوا ئەکەن یان زانان وە یان دەیەوێـت شت فێربێت، بـەلأم مامۆسـتای خوالێخۆشـبوو مـەلا (عبـدالكريمی مـدرس) یادی بەخێر لە چل فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کـە (شـەرحی) لەسـەر

---

(١) بڕوانە / پەڕتووکی ( حلية الأولياء –وطبقات الأصفياء ) دانراوی (الحافظ أبي نعيم أحمد بن عبدالله الأصفهاني ) بەرگی (٧) لاپەڕە ١٢٧.

(حەدیسەکان) کردووە بەتایبەتی ئەم (حەدیسە) پیرۆزەی ئەفەرموێ (یەعنی) دونیاو هەرچی لە دونیا هەیە دوورن لە (ڕەحمەتی) خوا تەنها بیرو باوەڕی خوا نەبێ وەهەر شتێ بەشوێنی ئەوا بڕوا، وە کەسێکی (عالم) کە قازانج بگەیەنێ بە خەلق و کەسێ خەریکی فێربوونی ئەو (عیلمە) بێ جا لەگەڵ ئایەت و (حەدیسا) زەمی دونیاو مافیها کراوە وە لە زۆریشیاندا (تعریف و مەدحیان) کراوە[1]،

جا هەروەها شێخی سەعدی لەگوڵستانەکەیدا ئەڵێ (بر طاق أیوان فریدون نیشتەبود).

جیهان أی برادەرْ نَماند بەکَسْ     دَل اندرْ جهان آفرین بندوبس

مَکُنْ تکیە[2] برمُلکی دونیاو پشت     کە بسیار کس چوون توو پرتوو کوشت

چو أهنگ رفتن کندجان پاك     چەبر تخت مردن چبر رووی خاك

واتە: لەتاقی هەیوانی فەرەیدون نووسرابو :

جیهان بێ بەقایە و نییە پایدار     ئەگەر عاقلی دڵ بدە کردگار

لەدونیا مەکە تەکیەو پاڵی پشت     گەلێ چەشنی تۆی پێ گەیاند وگورجی کوشت

لە ڕۆیشتنا وەك یەکە گیانی پاك     لەسەر تەختە مردن وەیا رووی خاك

هەزار ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی ووتویەتی لەم چەند هۆنینەوەی خوارەوە هەروەکو ئەفەرمووێت:

---

(1) بڕوانە/پەرتوکی(چل چرای ئیسلام)لە دانانی/مامۆستای خوالێخۆشبوو(مەلا عبدالکریمی مدرس) لاپەڕە/ ٢٠٠.

(2) تکیە بە زوبانی فارسی بەمانای بالیف و پاڵدانەوە دێت .

النفس تبكي عَلَى الدّنيا وَقَدْ عَلمت | أنّ السَلامَة فيها تَرك مَا فيَها
لادار للمرءِ بَعْدَ المَوْتِ يَسْكُنُهَا | إلاّ التّي كَانَ قَبْلَ المَوْت يُبَنيَها
فإنّ بَناها بِخَيرٍ طابَ مَسْكَنُهَا | وإنّ بَنَاهَا بِشرّ خَابَ بَانيها
أمْولَنا لِذَوِي الميراثَ تَجْمَعُهَا | وَدُورنَا خراب الدّهر نَبْنيها
وكمْ مِنْ مدائنٍ في الآفاقِ قَدْ بُنيت | أمست خراباً وأفْنى المَوْتِ أهْليَها
أيْنَ المُلُوكَ؟ التّي كَانَتْ مَسلْطَنَة | حتّى سَقَاها بِكَاس المَوْتِ ساقيَها.
إنّ المَكَارِمَ أخلاق مُطَهّرَةَ | الدّين أوّلَهُا والعقلُ ثانيها والعِلْمُ ثَالثُها
وَالحِلمُ راباعهُا والجُود | خامسها والفضل باقيَها
لاَتركَنَنَ الى .....الدُنيا | والموت لاشك يُفنينا ...ويُفنيها
واعمل لدار غدٍ رضوان خازنها | والجار أحمد والرحمن ناشيها
قصُورها ذَهبٌ وَالمِسكُ طينتها | والزّعفرَان حشيش نابت فيها
أنهارَها لبن مُصفي وَمَن عَسلٍ | والخمر يجري رحيقاً في مجاريها
والطيرتجري على الأغسَان عاكفة | تَسْبِحُ الله جهراً في مغانيها
فمن يشتري الدّار في الفردوس | يَعْمرها بِركعةٍ في ظلام اللّيل يُحييها (1)

واته : نەفسەکەم بۆ دونیا دەگری و باش جەزانێ کە بێ وەیی تیایدا وازهێنانە لەوەی کەتیایدایە بۆ هیچ کەسێك لە پاش مردن هیچ خانوویەك نییە ،تیایدا نیشتەجێ بێ تەنها ئەوە نەبێت کە لەپێش مردنی بنیاتی ناوە ئەگەر بەچاکە درووستی کردووە ئەوا جێگایەکە خۆشەو ئەگەر بە خراپە درووستی کرد ئەوە درووست کەرەکەی پەشیمان دەبێتەوە وە

---

(1) بڕوانە/ پەرتووکی (احداث النهایة ونهایة العالم) دانراوی بەڕێز (الشیخ محمد حسان)، لاپەڕە/٧٠٠.

سـامانەكانمان بۆكـەس و كـارى باشـى خۆمـان لـە كـوێ دەكەينـەوە خانوەكانمان بۆ كاوڵ كردنى ڕۆژگار درووستى دەكـەين چـەندەها شـار لـە ئاسۆيانەدا درووستيان كرد كەچـى هـەمووى كـاول بـوون تـاكو بەدەسـتى ئاوگێڕ بەرداخى مردنى كردە نۆشى ڕێگا و شـتە جوانـەكان پـاك و تـەميز ديارن، ئايين يەكەميانەو هۆش وبير دووەم وە زانست سێ هەميانە هێمنـى و لەسـەر خـۆيى چـوارەمە وەبـە خـشندەى پێنجەمـە و چـاكەكارى پاشماوەكەيەتى خۆت مـەدە پـاڵى دونيـا چـوونكە بێگومـان مـردن ئێمـەو ئەويش لەناو دەبـات بۆيـە كـار بكـە بـۆ ماڵەكـەى سـبەينێ كـە رضـوان و گەنجينەوانيەتى وە هاوسێكەت أحمد ە (ﷺ) والرحمن درووستى كردوون كۆشكەكانى ئاڵتونەو قوڕو خاكەكەى ميسكەو وەەگژو گياكـەى زەعفەرانـە وە تيايدا سەوز بووە ڕووبارەكانى شيرى باڵفەن و هـەنگوين و مـەى وەكـو شـيلە بەڕووبارەكانيـدا تێدەپـەڕى وە باڵنـدەكان لەسـەر لقـەكانى دێـن و دەچن يادو تەسبيحاتى خوا بەئاشكرا دەكەن لە لانەكانياندا كێ دەيـەوێت ماڵێـك بكرێـت لـە فيردەوسـدا ئـاوەدانى بكاتـەوە بـە ڕكاتێـك لـە تـاريكى شەودا).

## (سەرنجێكى گرنگ)

(لەكۆتايى دا ئەپارێينەوە) لە خـواى بەخـشندەو ميهرەبـان كـە خـواى گـەورە يارمـەتى دام بـۆ نووسـينەوەى ئـەم چـەند ووتـارو ئامۆژگاييـە داوادەكەم ببێتە مايەى زەخيرەى (قيامەت) وەهەروەها تكا كارم لـەخواى گەورەئـەم خزمەتـە بـچووكەم لێ وەرگـرێ وە بـەزۆرى لەقەڵـەم بـداو ئـەى

خوایە گیان ئاواتە خوازم سۆزو ڕەحمەت و بەزەییت بڕژێنە سەر خۆم و دایکم و باوکم و خوشکەکانم و تاقە برایەکەم (مەلا عبداللە ی غەزالی) و گشت دۆستان و برادەران و خزم و کەس و کارو ئیماندارانی خاوەن باوەڕان و برایانمدا لە کوردستان و لەهەموو لایەکی جیهانی بەرپانی ئیسلامدا لە عالەمی جیهان، ئەی خوایە ئەم چەند پاڕانەوەو نیزایەمان لێ قەبوڵ بە فەرمووی لێ وەرگری وەئەو دەست و پەنجەی کە نوسیویەتیەوە ئەو زمانەی کە دەیڵێ و ئەو گوێەی کە گوێی لێ دەگرێ لەو موسڵمانانەی کە ئەیخوێننەوە ئەو مامۆستایەی بە قوتابیەکانی ئەخوێنێ ئەو خاوەن چاپەمەنی و ئامێرەی لەبەر خوا چاپی دەکاو وێنەی دەگرێ ئەو دڵەی یادی لێ دەکاتەوە ئەو کەسەی کە ئەیخوێنێیەوە ئەگەر هەڵەیەکی بەدی کرد بەخێرا خۆی چاکی بکاتەوە، هەروەها چاوپۆشیمان لێ بکات و یارەبی هەموو ئەوانە بەئاگری دۆزەخ نەسوتێ وەبە بەهەشتی بەرین شاد بێ ئامین).

## ( کۆتایی )

ئەوەبو باسی ڕەحم و بەزەیی لوتفی خوای گەورەمان کرد، خوایە بە ڕەحم خۆت ڕەحممان پێ بکەی خوایە عەفومان بکەی خوایە لە بەلاوە موسیبەتی دونیاو قیامەت بمانپارێزی بەلوتف و کەرەمی خۆت خوایە لە تاوان و گوناهەکانمان ببورە خوایە موسڵمانان سەربەرزو سەرکەوتوو بکە وەحاڵیان چاك بکەو تەرەقی بەدینی ئیسلام بدەو ئالای ئیسلام هەر شەکاوە بێ خوایە دوعامان قەبوڵ بکەی لە دەردو بەلا ڕزگارمان بکەی

وەصەلآت و سەلام برژێ بەسەر گیانی پاکی حەزرەتی (محمد المصطفی) (صلی الله علیه وسلم) و ئال و بەیت و سەحابەو یارانی، (وصـلّی اللهُ عَلَـی سَيِّدنَا مُحَمّد وعلَى آله وأصْحَابه وأتْبَاعه وأمَته إلى يَوم الدّين، سُبْحَانَ رَبّـكَ رَبّ العزّة عمّا يَصفُون وسَلاَمٌ عَلَى المُرْسَلين وآخـر دَعْوانَـا أنَ الحَمدُ لله رَبّ العَالَمينْ).

## (الخُطبَة الثانية-خطبَة الأخيرة الصالحة بعْدَ كلّ خطبَة )

واتە ئەمە وەتاری کۆتاییە و بە کەڵك دێت لە دوای هەموو وەتارێك بخوێنەوە و ...هتد

(الحَمْدُ لله الذّي أحْيا قُلُوبَ العارفين بإتّساع رَحْمَته ووَهبَ لَهُم منْ مَطايـا الحُزن والبُكاء ما يَتوصلّون إلى مَنازل جنّةٍ نَحْمَدهُ ونَسْتَغفرُهُ ونَشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لاَشَريكَ لَهُ شَهَادَةَ تُنْجينَا بها يَوْمَ القيامة منْ الهوْل وَشدّة ونَشْهَدُ أن سيّدنا مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُولَهُ الذّي أرْسَلهُ الله رَحْمةً للنّاس ولأمَته أجْمَعين والصّلاةُ والسَلامُ عليه وَعَلى آله وأصْحابه والمتَمَيِّزين بسنّته وَسَلّمَ تَسْليماً كثيراً، أمّا بَعْدُ أوْصيكُمْ بتَقوا الله وَطاعَته وإجْتناب عَنْ معَاصيه فالسَعيد مَنْ أطاعَ الله والشّقيُّ منْ باعَ آخرتُهُ بدنياهُ قَالَ تعالى: (وَمَنْ يَتّقي الله يَجْعَلْ لَهُ مَخرَجاً ويرزقْهُ منْ حَيْثُ لاَيَحْتَسَبْ)

وَلاَ تُظْلموا فإنّ الظُلم ظُلمات يومَ القيامة إذ بالعدل قامَتْ السّموات والأرض فَاتّقوا الله ولاتعصُوهُ ولا تَكونُوا كالّذينَ نسوَ الله فأنساهُمْ أنْفُسَهُم أوْلائكَ هُم الفَاسقُون، وأعْلَموا أنّ الله سُبْحَانَهُ وتَعالَى صلّى علَى نبِّيه قديماً وَلَمْ يَزَل قائلاً عَليماً وامراً حَكيماً تَنْبيهاً لقَدر نبِّيه وتَعْظيماً (إن الله

وَملائكتهُ يُصلّونَ علَى النبِّي ياأيّها الذّينَ آمَنوا صلّوا عَلَيْه وَسَلّموا تَسلْيماً)
وقالَ (صلى الله عليه وسلم) (مَنْ صلّى عليَّ صَلاةً صلّى الله علَيْه بهَا عشراً).

اللّهُمَ صلِّ وَسَلِمْ وَبَارِكَ وأنْعم علَى سَيّد الأوّلينَ والآخَرين إمَام المُتّقينَ نُور أبْصَارنا (أبِي القَاسم الأمين مُحَمّدٍ) وَعلى آلِ مُحمّد يا أيّها المُتَعتشُونَ زُلاَل كَوْثره، صلّوا عَلَيْه وَسَلّموا تَسْليماً، اللّهُمَ صَلِّ وَسَلّمْ وَبارِك عَلى سيّدنا مُحَمّد وعَلى آلِ مُحَمّدٍ يا أيّها الرّاجُون نورَ جَمالهِ وَصفْوة كَمالهِ صلّوا عَلَيْه وسَلّموا تَسلْيماً.

(اللّهُمَ صلِّ وَسَلّمْ وَبارِكْ عَلَى سَيِّدنا مُحَمّدٍ وعلَى آلِ سَيِّدنا مُحَمّد كَمَا صلّيْت وَبَاركْتَ وتَرحَمْتَ عَلَى سَيِّدنا إبْراهيم وعَلَى آلِ سَيّدنا إبراهيم في العَالمينَ إنَكَ حَميدٌ مَجيدٌ، وأرض اللّهُم عَنْ أرْبَعَة الخُلَفاءِ السّادات الحُنفاء ذوي القدرِ العَليِّ والفَخْر الجليِّ سَاداتنا وإئمَتِنا خُلَفاء الرّاشدينَ حضرة (أبي بكرِ الصّديق وعمر الفَاروق وعُثْمان ذي النّورين، وَعَلى الحَيْدر الكرّار، وأرضِ اللّهُمَ عَنْ السّتةِ البَاقين من العَشرةِ الكِرام البَرَرة:

وأرض عَنْ عميْ نَبّيك خيْرُ النّاس (الحَمْزَةَ والعبّاس) وَعَنْ السّبطين الشّهيدَين المَظْلومَيّن سّيدا شَباباً ورَيَحانتنا أهْل الجَنّة الحَسَنُ والحُسَين وَعَنْ فَاطمة الزّهراء البَتول، وَعَنْ خديجة الكُبرى وعائشة الصدّيقة وَسايرِ أزواج نَبيّنا أُمّهات المؤمنين وعَنْ الصّحابةِ والتّابعينْ وعَنّا ببَركات أنْفاسِهُم أجْمَعين يا رَبّ العَالمين، اللّهُمَ أعزّ الإسْلام وأنْصر المُسلمين وأذلّ الشركَ وَالمُشْركينَ وأهلك الكَفَرةَ وَالمُنافقين وَالملْحدينْ والمُرْتَدينْ والمُعتَدينْ، اللّهُمَ إغْفر للْمُسلمينْ والمُسلمات، والمُؤمنينَ وَالمُؤمنات الأحْياء منهُم والأموات إنّك سَميعٌ قَريبٌ مُجيبٌ الدّعوات يا رَبّ العَالَمين.

اللّهُمَ إجْعَلنَا بالْقرآنِ والسُّنةَ عاملينَ وعلَى ما يُرضيكَ مُقْبلينَ، غيْـر خزَايـا وَلاَ مَفْتُونينَ اللّهُمَ أصْلح ذَات بَيْنِنَا-وَألّف بـيْنَ قُلوبنـا وأهْـدنا سُبَل الـسّلام وَأخرجنا من الظُّلّمَاتِ إلى النّور وَجَنّبنا الفَواحِش ما ظَهرَ مِنْها وَما بَطَن اللّهُم أرْحَم أُمّة مُحَمّدٍ (صلى الله عليه وسلم).

اللّهُمَ أصْلِح أُمّة مُحَمّدٍ (ﷺ)اللّهُم فرّج عَنْ أُمّـة محمّـد (صـلى الله عليـه وسلم) ربّنا لا تُزِغْ قلُوبَنّا بَعْدَ إذ هَدَيْتَنا وَهَبْ لَنَـا مِـنْ لَـدُنكَ رَحْمـةً إنّـكَ أنْـتَ الوّهاب، ربنّا آتنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخرة حَسَنَةً وَقِنّـا عَـذابَ النّـار وآخـر دَعْوانا أن الحَمْـدُ لله رَبّ العَـالَمين عبَـاد الله (إنّ الله يـأمرُ بالعـدْلِ والإحْسان وإيتاءذي القُربى وَيْنهى عَنْ الفَحْشاء والمُنْكَر والْبَغي يَعظُكُمْ لَعَلّكُمْ تَذكرّون).

وَاذْكرو الله يَذْكُرْكُم وأشْكُرُوهُ عَلَى نِعْمَه يَزدْكُمْ وَلَذكْرُ الله أكْبر والله يَعْلَمُ ما تَصْنَعُون...

## (ئەمەش ووتـاری دووەمە بۆ هەموو خوتبەیەك ئەبێ)

الحَمدُ لله الّذي قَرّبَ لِحضرته مَن اصْطفاهُ مِنْ عباده وَقَدّمَهُ لِخدمَتـه وَأشْـهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ جعَلَ العِزَةَ وَالسعَادَةَ في طاعَتـه وَأشْـهَدُ أن سيدَنا مُحَمَداً عَبدهُ وَرَسولُه الذي كثيراً ما يسألُ اللهَ أنْ يَغفرَ لأمَته اللهُمَ صَل وَسَلم عَلَى سَيدنا مُحَمدٍ وَعَلى آله وَأصحابه ما أخلَصَ لله المُخْلصون)

أما بَعدُ.. فَيا عبادَ الله إتَقوا اللهَ وَأطيعوهُ الـدُنيا دارُ فنـاءٍ ومآلهـا إلى الـزَوال وَكُلُ مَنْ عَليها فانٍ وَلا يَبْقى إلا وَجهُ رَبكَ ذو الجَلال/ الـدُونيا تتلَـون وَتتقَلَـبُ وَلا يَدوُمُ لَها حالْ)

فأتقوا اللهَ عِبادَ الله وَصَلوا وَسَلموا عَلـى مَـن أمِـرتُم بالـصلاة وَالـسلام عليـه

عُموماً بقوله تعالى ولَم يَزل قائلاً عليماً ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾ اللّهُمَ صَلِ وَسَلم عَلى سَيدنا مُحَمدٍ وعَلى آله وأصحابه عَددَ ما كان وَما يَكُون فعَلَيْكم بطاعة الله وكَثرَةَ الصَلاة عَلى صاحب الكِتابِ وَالسُنّة اللهُم صَل وَسَلم عَليه وَأرْض عَن الأرْبَعة الخُلَفاء وبَقية العَشرَة الكِرام وَأزواج نَبيكَ المُصطفى وَعَن عَمَي حَبيبكَ وَسبْطيه ذوي الإخلاص وَالصَفا وعَن الأنصار وَالمُهاجرين وَالتابعين لَهُمْ بإحسانٍ إلى يَومَ يُبْعَثُون) اللهُمَ إغفِر لِلمُؤمنينَ وَالمُؤمنات وَالمُسلمينَ وَالمُسلمات الأحْياء مِنْهُمْ وَالأمْوات إنَكَ سَميعُ قَريبٌ مُجيبُ الدَعَواتْ.

اللّهُمَ لا تَدَعْ لَنا ذَنبا إلا غَفَرتهُ وَلا هَماً إلاّ فرجْتَهُ وَلا دَيْناً إلا قَضَيتَهُ وَلا حاجَةً من حَوائج الدُنيا وَالآخرة إلاّ قَضَيْتَها يا أرحَم الرَحمين يا مَنْ خَلَقتَ جَميعَ الأشياء وَأمرْكَ بينْ الكاف وَالنُونْ /أي (كُنْ فَيكون).

عبادَ الله إن اللهَ يأمرُ بالعَدلِ وَالإحْسان وَ إيتاء ذي القُربى وَينهى عن الفَحْشاءَ وَالمُنكَرِ وَالبَغي يَعظُكم لَعَلَكم تذكَرون / فأذكروُا الله العظيم يَذْكُرْكُمْ وَاشكُروهُ عَلى نِعَمه يَزدْكُمْ وَلَذكرُ اللهِ أكْبَرُ وَالله يَعْلَمُ ما تَصْنَعُونَ).

## ئەو سەرچاوانەی سوودم لێ وەرگرتوون ئەمانەی خوارەوەن:

١- القرآن الكريم

٢- الدليل المفهرس لألفاظ القرآن الكريم بحاشية المصحف الشريف/ تأليف الدكتور (حسين محمد فهمي الشافعي).

٣- مفتاح الخطابة والوعظ/ تأليف الأستاذ (محمد أحمد العدوي) المفتش العام للوعظ والإرشاد بالأزهر الشريف.

٤- جامع البيان ، تفسير الطبري/ تأليف العلامة إبن جرير الطبري .

٥- التفسير الكبير المشهور مفاتيح الغيب، للعلامة (فخرالدين الرازي).

٦-الجامع لأحكام القرآن: المشهور تفسير القرطبي، تأليف أبي عبدالله مجمد بن أحمد الأنصاري.

٧- روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني ، تأليف العلامة اللألوسي البغدادي.

٨- تفسير روح البيان: تأليف الشيخ إسماعيل حقي (البرسوي).

٩- الباب في علوم الكتاب: تأليف العلامة المفسر أبي حفص عمر بن علي إبن عادل الدمشقي الحنبلي).

١٠- تفسير التحرير والتنوير : تأليف سماحة الأستاذ محمد الطاهر إبن عاشرو .

١١- الكشف والبيان في تفسير القرآن، (تفسير الثعلبي)، تأليف العلامة محمد بن ابراهيم الثعلبي .

١٢- تفسير البغوي المسمى (معالم التنزيل) العلامة الحسين بن مسعود الفراء البغوي الشافعي).

١٣- تفسير الخازن – والمدارك – المسمى لباب التأويل في معاني التنزيل) تأليف

العلامة علاءالدين بن علي بن ابراهيم الشهير النجارة).

١٤- زاد المسير - في علم التفسير - تأليف العلامة ابن الفرج عبدالرحمن بن علي إبن الجوزي.

١٥تفسير القرآن العظيم - المشهور إبن كثير - تأليف العلامة عماد الدين أبو الفداء إبن كثير الدمشقي القريشي .

١٦- صفوة التفاسير : تأليف الدكتور الأستاذ (محمد علي الصابوني).

١٧- البحرُ المديد في تفسير القرآن المجيد: تأليف العلامة. أحمد بن محمد المهدي ابن عجيبة الحُسيني.

١٨- حاشية الصاوي في تفسير الجلالين: تأليف العلامة أحمد بن محمد الصاوي المالكي

١٩- أضواء في ايضاح القرآن بالقرآن : تأليف العلامة محمد امين الشنقطي.

٢٠- المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز - المشهور ، تفسير ابن عطية ، تأليف العلامة محمد بن عبدالحق إبن عطية الاندلسي.

٢١- فتح الباري شرح صحيح البخاري : تأليف العلامة إبن حجر العسقلاني .

٢٢- إرشاد الساري شرح صحيح البخاري : تأليف العلامة القسطلاني .

٢٣- عُمدة القاري شرح صحيح البخاري : تأليف العلامة بدرالدين العيني .

٢٤- فتح الملهم بشرح صحيح الامام مسلم: تأليف العلامة النووي - والشيخ شبير احمد العثماني .

٢٥- الفتح الرباني لترتيب مسند الإمام أحمد بن حنبل الشيباني، ومعه كتاب بلوغ الأماني من أسرار الفتح الرباني .

٢٦- تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ، تأليف العلامة (محمد بن عبدالرحمن بن عبدالرحيم المباركفوري.

٢٧- عون المعبود شرح سنن أبي داود : تأليف العلامة أبي الطيب شمس الدين

العظيم ألأبادي .

٢٨- سنن النسائي مع الشرح للعلامة السيوطي .

٢٩- شرح السنّة: تأليف العلامة لأبي محمد الحسين بن مسعود البغوي .

٣٠- كنز العُمال في سنن الأقوال والأعمال ، تأليف العلامة الهندي الدهلوي .

٣١- الترغيب والترهيب من الحديث الشريف : تأليف العلامة الحافظ المنذري.

٣٢- صلاح الامة في علو الهمة تأليف الدكتور سيد بن حسين العفاني .

٣٣- اتحافات السادة المتقين بشرح أحياء عوم الدين تأليف العلامة محمد المرتضى .

٣٤- حلية الأولياء وطبقات الأسفياء تأليف العلامة أبونعيم الأصفهاني .

٣٥- موسوعة الإمام إبن أبي الدنيا تأليف الحافظ أبي بكر بن عبدالله بن محمد القرشي.

٣٦- الفتوحات الرّبانية بالخطب والمواعيظ القرآنية : تأليف الفاضل محمد بن سالم اليحاني .

٣٧- الإشراقات الروحانيّة في الخطب المنبرية واللعظات الدينيية ، تأليف الأستاذ عبالسلام العمراني الخالدي .

٣٨- الجواهر المُرصعّة في الخطب المنوعة : تأليف الأستاذ عبدالرحمن بن أحمد بن يحيى الكمال.

٣٩- تحفة الخطيب تأليف الأستاذ المرحوم عبدالله بن مولود محمود البلبيتاني الأربيلي .

٤٠- مصباح القلوب ومفرج الكروب: تأليف الفقير عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز الدزەيى، جزآن كبيران.

٤١- جامع الخطب المحمدية : تأليف الأستاذ محمد خضري الأشنوي .

٤٢- جامع الخطب أيضاً تأليف الشيخ السيد كمال زادة الحسني .

٤٣- الخطب المنبرية العصرية : تأليف الاستاذ مصطفى أبي العلا .
٤٤- لسان المنبر في الخطابة التحليّة : تأليف الاستاذ محمود ابراهيم طبرة.
٤٥- يوانع الرطب في بدائع الخطب : تأليف الشيخ عبدالغني النابولسي .
٤٦- نور العباد على طريق الوعظ والإرشاد تأليف الأستاذ محمد عبدالغني سليمان .
٤٧- لسان المنبر ، خطب جمعية تأليف الاستاذ محمد المديني جزأن.
٤٨- التحفة المرضية في الأخار القدسية والأحاديث النبوية تأليف الشيخ عبدالمجيد علي خادم آل بيت النبي (ﷺ) .
٤٩- موسوعة الاحاديث القدسية : تأليف الاستاذ عادل بن سعد.
٥٠- مصباح الظلام وبهجة الأنام في شرح نيل المرام من أحاديث خير الانام تأليف العلامة السيد محمد بن عبدالمطلب الجرداني.
٥١ تنبيه الغافلين تأليف الشيخ الإمام السمرقندي ، - جزآن.
٥٢- الاذكار المنتخبة من كلام سيد الأبرار (صلى الله عليه وسلم) تأليف الحافظ شيخ الإسلام محي الدين ابي زكريا بن شريف النووي .
٥٣- أحداث النهاية ، ونهاية العالم ،تأليف فضيلةالشيخ (محمد حسان) رحمه الله.
٥٤- الجامع لشُعب الإيمان / تأليف الحافظ أبي بكر أحمد بن الحسين / تحقيق الدكتور عبدالعلي عبدالحميد )١٥/مجلدات .
٥٥- جمع الجوامع - المعروف بالجامع الكبير /تأليف الحافظ الإمام (جلال الدين السيوطي /٢٥/مجلدات، تحقيق وتخريج منة قبل لجنة من علماء الأزهر الشريف .

**( سەرچاوە کوردیەکانیش ئەمانەی خوارەوەن ):**

١- تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز دانراوی مامۆستا (مەلا عبدالكريمی مدرس) لێكۆڵینەوەی محمد علی قەرەداغی .

٢- تەفسیر گوڵشەن: لەتەفسیر كردنی مامۆستا نظام الدین عبدالمجید).

٣- تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان لەنووسنی مامۆستا برهان محمد امین.

٤- تەفسیری ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان لەنووسنی مامۆستا ئەحمەد كاكە محمود.

٥- تەفسیری خاڵ لەنووسینی شێخ محمدی خاڵ ئەندامی (مجمعی علمی عیراقی).

٦- تەفسیری قورئانی پیرۆز بە زوبانی كوردی لە نووسینی مامۆستا مەلا عبدالعزیز علاءالدین مصطفی كۆیی.

٧- تەفسیری قورئانی پیرۆز لێكدانەوەی مامۆستا مەلا عثمان عبدالعزیز هەڵەبجەیی .

٨- تەفسیری ڕەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان لە نووسنی (مەلا محمودی گەلاڵی).

٩- اقتران النیرین فی جمع البحرین تەرجەمەی حەدیسەكانی بوخاری ومسلم دانراوی مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان.

١٠- التاج الجامع للأصول احادیث الرّسول دانراوی مامۆستای شێخ مەنصور علی ناصف لە وەرگێڕانی مامۆستا نوری فارس حەمەخان.

١١- پوختەی صحیح المسلم : تألیف زكی الدین عبدالعظیم عبدالقوی المنذري ، لەوەرگێڕانی لیژنەیەك لە مامۆستایانی ئایینی.

١٢- یاساكانی ئیسلام لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) دانراوی مامۆستا محمد عبدالكریم شارەزووری .

١٣- بەهارو گوڵزار كتێبێكە پەخشان و هەڵبەستە دانراوی مامۆستا مەلا

عبدالكريمى مدرس) .

١٤- سەرچاوەی ئایین دانراوی مامۆستا مەلا عبدالكريمى مدرس) .

١٥- نوری قورئان : وەنوری ئیسلام هەردووکیان لە نوسوینی مامۆستا مەلا عبدالكريمى مدرس) .

١٦- تاوانە گەورەکان لەڕوانگەی ئیسلامەوە نووسین و ئامادەکردنی (عبدالرحمن ملا تەها عبدالعزيز).

١٧- مەوسوعەی فیقه حەج وعومرەلەنووسین و کۆکردنەوەی (عبدالرحمن ملا تەها عبدالعزيز).

١٨- کۆڕی ئامۆژگاری لە نووسینی مامۆستا مەلا محمدی شەڵماشی .

١٩- دەنگی مینبەر : دانراوی مامۆستا مەلا محمدی شەڵماشی .

٢٠- باخێکی پڕ بەرهەم لە ووتارەکانی سەردەم لەنووسنی مامۆستا مەلا یاسین مەلا عبدالله.

٢١- روخسارو رەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ر لە کۆکدرنەوەو ئامادەکردنی مامۆستا حەمزە بەرزنجی).

٢٢-ڕوونککردنەوەی العقيده الطّحاوية لەسەر ڕاڕەوی أهل السنه والجماعه، لە وەرگێڕانی (مامۆستا مەلا عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی).

٢٣- خواپەرستی لە ئیسلاما لە نووسینی مامۆستا ئەحمەد کاکە محمود.

٢٤- گوڵستانی شێخ سەعیدی شیرازی لەوەرگێڕیانی مامۆستا (مەلا مصطفی رەسول) ناودار بە (صەفوەت).

٢٥- ژیاننامەی زاتی ڕەهەبەر لە سیرەت و غەزەواتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە نووسینی (عبدالرحمن ملا تەها عبدالعزيز) بەرگی یەکەم و دووەم.

# ناوەڕۆك

## له بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر



- (تاوانە گەورەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە)، بەرگی یەکەم و دووەم، چەند جار چاپکراوە.
- (ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان) (نصيحة المؤمنين)، بەرگی یەکەمی لە (چاپخانە)ی (الحوادث) لەبەغدا چاپکراوە، لە ساڵی 1998زاینی.
- پەرتووکی (مەوسوعەی فیقهی حەج و عومرە) چاپکراوە لە وەزارەتی ڕەوشنبیری لە ساڵی 2010زاینی.
- (سیرەت و ژیاننامەی زاتی ڕەهبەر لە ڕەوشت وئەخلاق و غەزەواتی پێغەمبەر لەگەڵ ژیاننامەی خەلیفەکانی و عەشەرەی موبەشەرە)، بەرگی یەکەم و دووەم چاپکراوە لە چاپخانەی ڕۆژهەلات، لە ڕێکەوتی 2011/2/1زایینی، هەزار دانەی لێ چاپکراوە.
- (دراسات وأبحاث حول حياة خضر وإلياس) چاپکراوە لە (موصل) لە ساڵی 1995زایینی.
- کتاب (مصباح القلوب وَمفرّج الكروب)، دوو بەرگی زۆر گەورەیە، هەر بەرگی نزیکەی 850پەڕ ئەبێ کتێبێکی زۆر گرنگەو و لە هەموو علیم و زانیاریێك ئەدوێ و بە تایبەتی (تەسەوفێکی) زۆری تێدایە و لەگەڵ ڕەوشت و ئاداب و ئەخلاقی کۆمەلایەتی و..........). لە ساڵی 2009زایینی لە وەزارەتی ڕەوشنبیری لە هەولێر بە چاپی گەیاندووە، هەروەها ئەگەر خوا حەز بکات خێرخوازان لە (دار المعرفة) لە بیروت بەلێنیان داوە دووبارە چاپی بکەنەوە.
- (جمع الفوائد لِفضال العلماء من الآيات والأحاديث وأقوال الحكماء) ئامادەیە بۆ چاپکردن.

چاپخانەی ڕۆژهەلات-هەولێر